
شەرحی
العقيدة الواسطية
لشيخ الإسلام ابن تيمية
رحمة الله عليه
نووسینی
د. صالح الفوزان
وەرگێڕانی
عبدالسلام فاتح عبدالرحمن
کتێبخانەی ڕێنکار

شەرحی

# العقيدة الواسطية

لشيخ الإسلام ابن تيمية

نووسینی

د. صالح الفوزان

وەرگێڕانی

عبدالسلام فاتح عبدالرحمن

١٤٤٥ك ٢٧٢٣ك ٢٠٢٣ز




## کتێبخانەی ڕێکار

ناونیشان : هەولێر - فلکەی شێخ محمود -
باڵەخانەی سەید بهاء الدین - نهۆمی خوارەوە



ژ.م ٠٧٥٠ ٤٧٥ ٥٧٦٧



## ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتووک : شەرحی العقیدة الواسطیة لشیخ الإسلام ابن تیمیة.

نووسینی : د. صالح الفوزان

وەرگێڕانی : عبدالسلام فاتح عبدالرحمن

نەخشەسازی بەرگ: إخلاص دیزاین

تیراژ : ١٠٠٠ دانە.

سایز : ١٧*٢٤

لاپەڕە : ٤٠٠ لاپەڕە

نۆرە و ساڵی چاپ : یەکەم، ١٤٤٤ کۆچی - ٢٠٢٣ میلادی.

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە « ٩٠٠ »ـی ساڵی « ٢٠٢٣»ی پێ دراوە.

# پێشەکی وەرگێڕ

**إِنَّ الْحَمْدَ لله نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِالله مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.أَمَّا بَعْدُ:**

یەکێک لە گەورەترین هۆکارەکان کە ئیمان بەهێز دەکات و دەهێنێت، بریتییە لە ناسینی ناوە جوانەکانی خودا کە لە قورئان و سوننەتدا هاتووە و، حەزکردنە لە تێگەیشتن لە ماناکانیان و خودا پەرستیە لەڕێگای ئەو ناو و سیفاتانەوە و، لەم ڕێگەیەوە ، واتە: (ڕێگای ناو و سیافەتەکانی خوداوە) ناسینی خوای پەروەردگار ئاسانتر دەبێت و مرۆڤ باشتر و چاکتر دەتوانێت پەروەردگاری بناسێت.

ئەمە جگە لەوەی ناسینی ناو و سیفاتەکانی خودا یەکێکە لە ئەسڵ و بنەماکانی باوەڕ؛ چونکە ناسین و زانینیان هەروەك زانایان دەڵێن: هەرسێ جۆرەکەی یەکتاپەرستی (التوحيد) لەخۆ دەگرێت:

١- خوا بەیەك دانان لە بەدیهینەرایەتی و پەروەردگاریەتیدا (**توحيد الربوبية**).

٢- خوا بەیەك دانان لە پەرستراویتیدا (**توحيد الألوهية**).

٣- خوا بەیەك دانان لە ناو و سیفەتەکاندا (**توحيد الأسماء والصفات**).

ئەوجا پلەو مەرتەبەی ناوە جوانەکانی خودا بەسێ ڕێگا دەبێت:

ژماردنی لەفز و چەندیەتیەکەی و، تێگەیشتن لەمانا و مەبەستەکانیان و، داوا کردن لەخودا پێیان، واتە: بەناو و سیفاتەکانی خودا لەخودا بپاڕێیتەوە.

پاشان وەك لای هەموان ئاشکرایە کە چەندان ڕەوتی ئیسلامیی و تاقم و گروپ لە موسوڵمانان لە بواری عەقیدەدا توشی پێخلیسکان و لادان بوون، بەتایبەتی دوای دروست بوونی خەواریج و موعتەزیلە لەلایەك، هەروەها موڕجیئە و جەهمی و

ئەشاعیره و چەدانی تر لەلایەکی تر، و هاتنه کایەیی هەندێ باس و خواس لەبابەتی عەقیدەدا، لەوانه مشت و مڕ لەسەر ئەوەی ئایه قورئان دروستکراو (مخلوق )ـە یان نا ؟ وه ئایه خودا لەسەر عەرشه یاخود نا ؟ وه ئایه خودا (جل جلاله) لەڕۆژی دوایی دا دەبینرێت یاخود نا؟! ..هتد. هەروەها لەبواری پێناسەی ئیماندا تووشی كێشه بوون، كه ئایه ئیمان تەنها بەڕاست دانانی دڵه یاخود پێوسته دانان بەزمان و بەکردار ئەنجامدانیشی لەگەڵ بێت؟، وه یاخود تەنها دانانی دڵ و زمانه و گەر کردەوەش نەبێت ئاسییه؟ هەروەها لەناو و سیفەتەكانی خواشدا تووشی كێشمه كێش و مشتومڕی زۆر بوون، بەشێوەك هەیانبوو هەموو سیفەتەكانی نەفی دەكرد و هەشیان بوو سیفاتەكانی ئیسپات دەكرد بەڵام سیفاتەكانی خودای دەچواند بەسیفاتی دروستكراوەكان..هتد، لەم نێوەنده تاقمێك لەسەر هەقەكه مانەوه كه ئەوانیش ئەهلی سوننه و جەماعه بوون، كه دواتر بەتەفسیلی لەم كتێبەدا ئەم باسانه ڕوون دەبێتەوه و قسەی پێویستی لەبارەوه دەكرێت؛ بۆیه پێویست ناكات لەم پێشەكیەدا بچینه ناو تەفاسیلی بابەتەكەوه.

لەلایەکی تریشەوه لەكوردستانی خۆماندا ئێستا تاقمێک له ئەشعەرییەکان لەهەوڵی خۆ كۆكردنەوەدان و هەوڵی شێواندنی عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعه دەدەن و بەچەندان ڕێگا دەیانەوێت عەقیده لار و وێرەكەیان لای شوێنكەوتوانیان و خەڵكی كەم عیلم شیرین بكەن لەكاتێكدا عەقیدەكەیان بونیاد نەنراوه لەسەر كیتاب و سوننه بەڵكو پشتی بەستووه بەكۆمەڵه بەڵگەیەكی (عەقڵی) موجەڕەد كه بنەماكەی شوبهاندنی خوایه بەدروستكراوەكان(مخلوقات) و، كاتێ تەماشای كتێبه سەرەكییەكەیان دەكەیت كه (**عقيدة النسفيِّ**)ـە بەدەگمەن بەڵگەی قورئان و سوننه بەدی دەكرێت و، هەمووی قیل و قالی ئەهلی كەلامە!.

كەواته باوەڕدار پێویسته هەوڵەكانی خۆی بخاته گەڕ بۆ ناسینی خودا بە ناو و سیفاتەكانی، هەروەها بۆ ناسینی ئەو زانست و كرداره ئیمانییانەی كه بانگەوازی بۆ دەكات.

جا لەبەر ئەو هۆکارانەی کەلەسەرەوە ئاماژەم پێدا و چەندان هۆکای تر خوێندن و شارەزا بوون لە عەقیدە و بابەتی ناو و سیفاتەکانی خودا بەتایبەت زۆر گرنگە بۆ موسوڵمان .

پاشان لەسوانگەی ئەوەوە کە باسە سەرەکییەکانی کتێبی:(**العقيدة الواسطية**) زیاتر ڕوونکردنەوەی ڕێباز و ڕێڕەوی ئەهلی سوننەو جەماعەیە لەبارەی ناو و سیفاتەکانی خوداوە(جل جلاله) هەرچەند لەگەڵیشیدا کۆمەڵە باسێکی تری عەقیدەییشی وروژاندووە، هەروەها لەبەرئەوەی ئەم کتێبە یەکێکە لەو کتێبە عەقیدەییانەی کە زانایان گرنگیەکی ئێجگار زۆریان پێداوە، بەشەرح کردن و شیتەڵ کردنەوەی بابەتەکانی، بۆیە بە باشم زانی یەکێك لەشەرحەکانی وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی، بەئومێدی ئەوەی لەکاتی خوێندنی ئەم کتێبەدا بەدەرس سوودی لێوەربگیردرێت.

شایەنی باسە لەوەرگێڕانی ئەم کتێبەدا زۆر هەوڵمداوە تەرجەمەی لەفزی ڕەچاو بکەم لەبەر حەساسی بابەتەکە و ترسناکی لادان لەمانا هەقیقیەکەی، بۆیە زۆر جار لەگەڵ مانا کوردیەکەی وشە عەرەبیکەشم داناوە و، بۆ تەفسیری ئایەتەکانیش پشتم بە (تەفسیری ڕامان) بەستووە؛ چونکە بەڕاستی ئەوەندەی تەماشام کردبێت لە بابەتی عەقیدە و ناو و سیفاتەکانی خودادا لەسەر عەقیدەی ئەهلی سوننە چووە، بۆیە زۆر جار بۆ زیاتر بەرچاو ڕوونی لەبەشی خواراوە و پەراوێزی لاپەڕەکاندا(هامش) ڕوونکردنەوەی زیاترم لێ نەقڵ کردووە.

داواکارم خوای پەروەردگار ئەم هەوڵە بچووکەم لێ قەبوڵ بفەرمێت و بیکاتە تێشوویەک بۆ قیامەت و دوا ڕۆژ نەک پەنا بەخودا ببێتە بەڵگە وحوججە بەسەرمەوە!.

لەکۆتاییدا هەر ڕاستی و دروستیەك هەبێ لەوەرگێڕانی ئەم کتێبەدا ئەوا لەخوداوەیە و فەزڵی خودایە و، هەر کەم و کورتیەکیش هەبێت ئەوا لەمنەوەیە و داوا لەخودا دەکەم بەگەورەیی خۆی بمبوورێت.

ماوەتەوە بڵێم: کتێبی "العقيدة الواسطيّة"، لەبەرگرنگییەکەی چەندان جار و لەلایەن چەندان زاناوە شەرح کراوە ، لەوانە :

١- "شرح العقيدة الواسطية" للشيخ محمد العثيمين.
٢- "الأسئلة الأصولية على العقيدة الواسطية" و"الكواشف الجلية شرح العقيدة الواسطية" للشيخ عبدالعزيز السلمان.
٣- "شرح العقيدة الواسطية من كلام شيخ الإسلام ابن تيمية" لخالد المصلح.
٤- "التنبيهات السنيَّة على العقيدة الواسطية" للشيخ عبدالعزيز الرشيد.
٥- "شرح العقيدة الواسطية" للشيخ خليل هراس.
٦- "شرح العقيدة الواسطية" للشيخ صالح الفوزان وهو شرح للمعهد العلمي.
٧- "التنبيهات اللطيفة على ما احتوت عليه العقيدة الواسطية من المباحث المنيفة" للشيخ عبدالرحمن السعدي .
٨- "شرح الواسطية" للشيخ صالح آل الشيخ.
٩- "شرح العقيدة الواسطية" للشيخ يوسف الغفيص.
١٠- "شرح العقيدة الواسطية" للشيخ عبدالرحمن بن ناصر البراك.
١١- "شرح العقيدة الواسطية" للشيخ عبدالعزيز بن عبدالله الراجحي.
١٢- "شرح العقيدة الواسطية" للشيخ عبدالله بن محمد الغنيمان.
وچەندانی تریش.

وەرگێڕ
✍ باوکی سناء ژاڵەیی
**(عبدالسلام فاتح عبدالرحمن)**
١ موحەڕەم / ١٤٤٥ کۆچی
٢١ حوزەیران/ ٢٠٢٣ زاینی

# ناساندنی شیخی ئیسلام ئیبن تەیمییە

## ئیبن تەیمییە[(١)]

ناوێکی ناشیرنکراو بەترس نیشاندراو.. ئەو زانایەیی نەیارەکانی کەمتر نین لە هەوادارەکانی، خۆی هەرزوو درکی بەو دژایەتییە کرد کە لە بەرامبەری دەکرێ، سەبارەت بەوان دەڵێ: سنگم فراوانە بەرامبەر هەموو ئەوانەی نەیاری منن، با سنووری خواش بشکێنن دەرهەق بە تەکفیر و تەفسیقکردنم، یان درۆکردن بە دەممەوە، یان دەمارگیری نەفامانە بکەن لە دژم، بەڵام من سنووری خوا لە ئاستیاندا نابەزێنم، بەڵکو کۆنترۆڵی ئەو گفتوو کارانە ئەکەم کە ئەنجامی ئەدەم، بە تەرازووی دادگەری دەیپێوم و واشیان لێدەکەم شوێنی قورئان و سوننەت بکەون .

ناوی تەواوی(تەقیەددین ئەبو عەبباس ئەحمەدی کوڕی عەبدولسەلامی کوڕی عەبدوڵڵا)یە، ناسراوە بە ئیبن تەیمییە، ئەو نازناوەشی لە(تەیمییە)ی داپیرەیەوە(دایکی باوکی) وەرگرتووە، کە ناوی تەیمییە بووە. لە خێزانێکی ڕۆشنبیر و زانستدۆست لە ٢٢ی کانوونی دووەمی ١٢٦٣م لە شاری حەڕڕان -دەکەوێتە باکووری کوردستان- چاوی بە دونیا هەڵهێناوە، لە ساڵی ١٣٢٨م لە دیمەشق کۆچی دوایی کردووە.

---

(١) کاتێ کە ویستم ژیننامەی شێنخی ئیسلام بنووسم لەکاتی گەڕانم چەند نوسراوێکم (بەزمانی کوردی) بەرچاوکەوت لەبارەی ژیاننامەکەیەوە؛ بۆیە بەخۆمم گوت پێویست ناکات منیش بچم دوو بارە ژیاننامەکەی لەعەرەبیە وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی، جا یەکێك لەو نووسراوانە ئەم نووسراوەیە کە لەسایتی (زادی ڕێمان) بڵاوکراوەتەوە و لەلایەن بەڕێزێك بەناوی : (شێروان عبدالرحمن) ئامادەکراوە و، نووسەر لەنووسینی ژیننامەی شێخ ئیسلام دا ئیبداعێکی جوانی کردووە و زۆر بەتێر و تەسەلی باسی لەژیاننامەکەی کردووە و لەنووسینەکەیدا سوودی لە ١٨ سەرچاوە بینیووە.منیش وەك خۆی (جگە لەهەندێ دەستکاری کەم)دایدەنێم بەهیوای ئەوەی ببێتە وانەو پەند بۆ خوێنەران و هەڵگرانی ڕێبازی هەق و شوێنەکەوتوانی زانایان شەرعزان بەکردار. (وەرگێڕ).

**کاتەکانی منداڵی و مێردمنداڵیی**

ئیبن تەیمیيه لە تەمەنی حەوت ساڵییەوە دەستیکردووە بە خوێندنی ئاین و زمانی عەرەبی و بیرکاری، هەر لە تەمەنی مێردمنداڵیدا قورئانی لەبەرکردوە. لای زیاتر لە ٢٠٠ شارەزا و مامۆستای ئیسلامی وانەی ئاینی خوێندووە و زانیاری و ئەزموونی لێوە بەدەستخستون. لە تەمەنی مێردمنداڵیدا شارەزاییەکی باشی هەبووە لە بوارەکانی تەفسیر، فەرموودە، شەرعزانی(فقه) و زمانی عەرەبیدا. بە گوێرەی هەندێک سەرچاوەی ئیسلامی، جگە لە زمانی عەرەبی؛ شارەزای زمانەکانی عیبری، لاتینی و تورکی بووە و لە نووسین و نامەکانیدا ئەو زمانانە دەرکەوتون.

تا داگیرکردنی شارەکە لەلایەن مەغۆلەکانەوە لە ساڵی ٦٧١ ک هەر لە حەڕڕان ژیاوە، پاشان لەگەڵ باوکی روویان کردۆتە دیمەشق و لەوێ نیشتەجێبوون، هەر لەوێش خەریکی خوێندن و وەرگرتنی زانست و مەعریفە و بیروبۆچوونی ئاینی بووە لای باوکی و زانا ئاینییەکانی تر، هەر لە سەرەتای تەمەنییەوە بە زانا و بیرتیژی و بیریار و ئازایەتی ناوی دەرکردبوو لای مامۆستایانی، شارەزاییەکەی لە ئایینی ئیسلام و لق و پۆپەکانی ئەو ئایینە و وردەکارییەکانیدا، بە رادەیەک بووە؛ کە لە تەمەنی ١٧ ساڵییەوە فەتوایداوە و لە بواری ئایینی ئیسلامدا نوسیویەتی و کتێبی بڵاوکردوەتەوە. لە تەمەنی ٢١ ساڵیدا بووەتە مامۆستای ئایینی و وانەی ئیسلامیی ووتووەتەوە و، بووەتە شێخ و سەرمەشقی ئەو خوێندنگە ئایینیەی کە پێشتر باوکی وانەی تیادا دەگوتەوە. ماوەیەکیش لە قوتابخانەی حەنبەلی وانەی ووتووەتەوە. لە تەمەنی ٣٠ ساڵیدا و لە رۆژی ١٠ی سەفەری ٦٩١ی کۆچیدا وەک وانەبێژی تەفسیری قورئان لە مزگەوتی ئەمەوی دەستبەکاربووە و، ساڵانێکی زۆر لەوێ وانەی ووتووەتەوە و فێرخوازان رooویان لە مزگەوت و خوێندنگەکەی کردووە و وانەی ئایینیان لە لای خوێندووە، هەروەها بە هیچ شێوەیەک بەبێ زانیاری لەبارەی هیچ شتێک نەدواوە، لەگەڵ ئەوەشدا لە زۆربەی ئەو زانستانەی کە قسەی تێدا کردووە گەیشتۆتە ئەوپەڕی ترۆپکی تێگەیشتن و قوڵبوونەوە تێیدا و، دەربارەی زۆربەشیان قسەی کردووە و نوسینی

بڵاوكردۆتەوە، وەكو: شەرعزانی(فقە) و فەلسەفە و لۆژیک(منطق) و فەلەک، لەم بوارانەدا ٣٧ بەرگ لەكتێبەكانی بەجێماون.

**ڕۆشنبیریی ئیبن تەیمییە و ڕێبازەكەی لە توێژینەوەدا :**

مێژوو نوسان لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە ئیبن تەیمییە شارەزاییەكی بەرفراوانی لە زانستە شەرعی و ئاوەزییەكاندا بەشێوەیەكی یەكسان هەبووە. ئیمامی زەهەبی لەبارەیەوە دەڵێت: (لە زیرەكیدا هەڵدەگیرسا و زۆر گوێی لە فەرمووده دەگرت و زیاتر لە دووسەد مامۆستای هەبووە و لە شارەزایی تەفسیردا گەیشتبووە ئەو پەڕ و لە لەبەركردنی فەرمووده و پیاوانی فەرمووده گێڕەوە و ڕاستی فەرموودەدا كەسی پێی نەدەگەیشت، لە وەرگرتنی فیقهـ و مەزهەبەكانی هاوەڵان و شوێنكەوتوان(تابعین)دا وێڕای چوار مەزهەبەكەش هاوتای نەبوو، شارەزایشی لە دەستە و تاقمەكان و ئوسووڵ و كەلام هەبووە، من هاووێنەی ئەو بەدی ناكەم، سەبارەت بە ژیاننامە و مێژووش بەڕاستی جێی سەرسوڕمان بوو، لەبارەی جیهاد و پێشڕەویشەوە لە سنووری وەسفدا نەمابوو. جا ئەگەر باسی تەفسیر بكرایە ئەو هەڵگری ئاڵاكەی بوو، ئەگەریش فەرموودەناسان ئامادەبوونایە ئەو دەدوا و ئەوان لەسەر ئەژنۆ وەكو فێرخواز لە خزمەتییدا دادەنیشتن و گوێیان بۆ دەگرت، ئەگەر ناوی ئەهلی كەلام بهاتایە ئەو وەكو تاكە كەس بوو كە دەبوایە بۆی بگەڕابانەوە، ئەگەر ئیبن سینا فەیلەسوفەكانی پێش بخستایە و بەرزی ڕابگرتنایە ئەو بەرهەڵستی دەكرد و نهێنی و عەیبەكانیانی ئاشكرا دەكرد). پێ دەچێ لەو دەربڕینانەی بەڕوونی ڕۆشنبیری ئیبن تەیمییە و ئاستی شارەزابوونی لە فەرموودەدا نیشان بدەن وتەكەی زەهەبی بێت لەبارەیەوە: (فەرمودەیەک كە ئیبن تەیمییە نەیزانیبێت ئەوە فەرمووده نییە). ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە بێداربوونێكی بەرفراوانی لە فەرمووده و شارەزایی بە هەموو كتێبەكانی فەرمووده هەبووە. بە نسبەت ڕۆشنبیری و لایەنی فەلسەفیشی، تا ئاستێكی زۆر ناڕوون و نادیارە، چونكە گرنگترین ئەو كتێبانەی كە تیایدا ڕەخنە و بەرهەڵستكاری لە ڕووی

فەلسەفەدا نیشان داون دواتر بڵاونەکراونەتەوە، یان لەگەڵ ئەو کتێبانەدا کە کاتی خۆی لەنێوچوون ئەوانیش فەوتاون.

ئەوەی ڕۆشنبیری ئیبنو تەیمیە جیادەکاتەوە ئەوەیە، کە ڕۆشنبیرێکی قوڵی ئیسلامی بووە بە پلەی یەکەم، ئەو تیایدا بەتەواوی شوێن بەرنامەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت کەوتووە، بەتایبەت ڕێبازی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و گەورە زانایانی حەنبەلی، ئەگەر چی ئەو ڕای لە هەرچوار مەزهەبەکە وەردەگرت و، قسەی لە گەورە فەرموودە ناسانی وەک بوخاری و شافیعی و تەبەری و ئەبو شەیخی ئەسفەهانی و لالەکائی و ئەبونەصری سەجزی و ئیبن خوزەیمە و دارەمی و ئیبن قوتەیبە و ئەبوبەکر ئەسرەم و خەلال و ئەبوعوسمانی صابونی و ئەبو ئیسماعیلی ئەنصاری و بەیهەقی و ئیبن بەتتە و ئیبن حەزم و ئیبن جەوزی و ئەشعەری و باقەلانی و.... کەسانی تر وەردەگرت، بەڵکو ئیبن تەیمیە سوودی لە هەموو بیریاران و تێڕوانەران ئاراستەوانان وەردەگرت؛ کە جەختیان لە پاڵپشتی مەزهەبی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەکرد، ئەو لە کتێبی(الرد علی المنطقیین)دا دان بەوەدادەنێت، کە بۆ بەرپەرچدانەوەی مەنتیق سوودی لە کتێبی (الدقائق)ی باقەلانی، کە ئەشعەریە و لە کتێبی(ئیبنو نەوبەختی شیعەی دوازدە ئیمامی) وەرگرتووە.

**ئیبن تەیمییە و زانکۆکانی ئەوروپا:**

هەروەها لەم ساڵانەی کۆتایشدا، زۆرێک لە زانکۆکانی ئەوروپا کەوتنە لێکۆڵینەوە لەسەر بەرهەمەکانی ئەم کەڵە زانا کوردە، لەوانە:

١- زانکۆی(ئۆکسفۆرد).

٢- زانکۆی(نوتینگهام).

٣- زانکۆی(جۆرج تاون).

٤- زانکۆی(ئەندیانا).

٥- زانکۆی(کورنیل).

٦- زانکۆی(ئەستنافورد).

بە دەیان کۆڕ و سیمینار دەربارەی ئەم پیاوە مەزنە ئەنجام درا، چەندین بڵاو کراوە و چەند کتێبێکی لەسەر نوسرا، زۆرجار ناویان دەبرد بە(ئەو پیاوە مەزنەی کە ئوممەتەکەی لێی بێ ئاگان!).

د. هنری لاوست کتێبێکی لەسەر بڵاوکردەوە بەناوی(نظريات إبن تيمية في الاجتماع والسياسة) کە تیایدا دەڵێت: ئەم پیاوە بەجۆرێک مەزن بوو، کە نەک تەنها ئوممەتی ئیسلامی، بەڵکو تەواوی بەشەرییەتی قەرزداری خۆی کردووە، دەشڵێت: ئیبن تەیمییە لەکتێبی (السياسة الشرعية)دا، دەستورێکی تەواوی بۆ حوکمڕانییەکی دروست نوسیوە، کە لەسەردەمی (قلاون)دا ئەم کتێبە وەک دەستوری هەموو پادشاکانی ئەوسەردەمە مامەڵەی لەگەڵ دەکرا، بەجۆرێک کە بەحەرفێک لێیان لانەدەدا.

د.کوج جلن دەڵێت: ئیبن تەیمییە ئەوکەسەیە، کە پێش هەموو کەسێ نەقدی مەنتقی ئەرستۆی کرد، کە دواتر ئەو مەنتقە زیانی زۆری بە ئەوروپا گەیاند و هەموو بۆچوونەکانی ئیبن تەیمییە لەسەری ڕاست دەرچوو.

د. جوهن هوفر دەڵێت: ئیبن تەیمییە ئەو پیاوە بوو، کە دژی هەموو خورافیات و زیادەڕەوی ئایینەکان وەستایەوە، لەو پێناوەشدا باجی زۆری دا.

هەروەها لە زانکۆی ئۆکسفۆردیشدا(ئیبن تەیمییە)ی وەک هەڵوەشێنەرەوەی مەنتقی ئەرستۆ ناساند.

هەروەها لەکتێبێکدا بەناوی(إبن تيمية وعصره) کە لەساڵی ٢٠١٠ لە زانکۆی ئۆکسفۆرد دا چاپکراوە، دەڵێت: ئیبن تەیمییە وەک یەکەم سەرچاوە دەزانم بۆ بەرپەرچدانەوەی فەلسەفە بەتاڵەکان.

ئەمانەی خوارەوەش ناوی هەندێکی ترن لەو زانکۆیانەی ئەورووپا دەربارەی شێخی ئیسلام (ئیبن تەیمییە) لێکۆڵینەوەیان کردووە:

١- زانکۆی (جۆرج تاون) .

٢- زانکۆی (ئەندیانا).
٣- زانکۆی (کورنیل) .
٤- زانکۆی(نوتنگهام) .
٥- زانکۆی (ستانفۆرد ).

**نازناوو پلەی شێخی ئیسلام(شیخ الاسلام):**

بەهۆی ئەو شارەزاییەی لە ئایینی ئیسلامدا هەیبووە و پابەندیی ڕێبازی سوننەت و جەماعەت بووە و، زۆربەی کاتەکانی ژیانی بۆ لێکۆڵینەوە لە ئایینی ئیسلام تەرخانکردووە، زۆرێک لەو کەسایەتییە ئایینیانەی هاوسەردەمی بوون و چەندینی تریش کە دوای ئەو پەیدابوون، نازناوی "شێخی ئیسلام"ـیان بە ناوبراو بەخشیوە و تا ئێستاش، لە نێوەندی ئیسلامیدا ئیبنوتەیمییە بە "شیخ الإسلام" دەناسرێت و ناوبانگی بڵاوبووەتەوە، لە هەموو دید و بۆچونەکانیشیدا پشتی بە دەقەکانی قورئان و فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) بەستووە، زانایانی تریش هەن کە بە شیخی ئیسلام ناو دەبرێن، بەڵام ئەگەر بە تەنها وترا شێخی ئیسلام(شیخ الاسلام)؛ بێگومان مەبەست لێی ئیمامی ئیبن تەیمییەیە.

ئیبن تەیمییە بەهەموو توانایەکی زانستی و دەروونی و تەنانەت جەستەیش لەڕووی تەتارەکاندا وەستایەوە، ئەو لەدیمەشق لەگەڵ جێگیری سوڵتان ئەفرەمدا وەستاو موسڵمانانی هاندەدا تا دژ بە تەتارەکان چەسپاوو سەقامگیربن و جیهاد بکەن، لەکاتێکدا زۆربەی زانایان و گەورە پیاوانی دەوڵەت لەشارەکە ڕایاندەکرد لە ترسی داگیرکاری و کوشتاری مەغۆلەکان. هەروەکو سوڵتان غازانی تەتار لەبەر خراپی هەڵوێستی لەگەڵ موسڵماناندا کەوتە بەر تووڕەبوونی ئیبن تەیمییە لەڕوویدا، لەگەڵ ئەوەی ئەو تووڕە بوونە مەترسی لەسەر ژیانی ئیبن تەیمییە هەبوو، کاتێک کە بینی مەترسی تەتارەکان زیادیکردووە، لەسوریاوە گەڕایەوە بۆ میسر و بە چەند دەربڕینێکی توند سوڵتان ناسر و پیاوانی سوڵتانی هاندا تا لەگەڵ تەتارەکاندا

بجەنگن، پاشان خۆیشی لەجەنگی(مەرج سەفەر)دا بەشداریکرد و لەنێو سەربازاندا بەرێکەوت و هانیدەدان، جەختی لێدەکردنەوە کەئەوان شیاوی ئەوەن سەرکەوتنی خوا بەدیبهێنن و جیهادی لە پێناو بکەن -تائەوکاتەی لە گوێڕایەڵی خوای گەورەدا دڵسۆزی بن و فەرمانبەرداری بن.

د.موحەممەد ئەبو زەهرە دەڵێت: مێژوونوسان بە ئیبن تەیمییەیان گوتووە: (حەڕڕانی) ئەوەش دەیسەلمێنێت کە کوردە، کوردیش میللەتێکی خاوەن هیممەت و ئازایەتی زۆربوون لەو سەردەمەدا، ئەم سیفاتانەش لەودا بە ئاشکرا بەدیدەکرا، چونکە کوردەکان لە سەدەکانی شەشەم و حەوتەمی کۆچیدا ڕۆڵێکی باشیان گێڕا لە بەرگریکردن و ڕووبەڕووبونەوەی دژی داگیرکەران، لە بەرەنگاری هێرشەکانی خاچپەرستەکان و مەغۆلەکان گورزی باشیان لێوەشاندن و بێئومێدیان کردن لە داگیر کردنی وڵاتی موسوڵمانان.

**دانراوەکانی ئیبن تەیمییە:**

هەرچەندە کارێکی ئەستەمە بتوانین بە ژمارە ڕێژەی دەستنووسەکانی دیاریبکەین، ئەوەش لەبەر نادیاری بەرهەمەکانی و زۆری نوسینەکانی، بۆیە کەسێکی وەک شێخ ئیبن ڕەجەب دەڵێت: نوسراوەکانی لەوە بەناوبانگترن باسبکرێن، لەوە ناسراوترن نکۆڵیان لێبکرێت، شار و وڵاتان پڕن لە کتێبی ئەو، ئەوەندە زۆرن لە ژمارە نایەن. بەڵام ئەوەی لە سەرچاوەکان ئاماژەی پێکراوە زیاتر لە چوار هەزار دەستنووسی هەبووە، ئەوەی ئێستا ماون و بڵاون بریتین لە سێسەد بەرگ، ئەوەشی دەستنووسە بریتین لە هەزار دەستنووس، دەڵێن هیچ شارێکی جێنەهێشتووە تا نوسینێکی دوای خۆی بۆ بەجێنەهێشتبن.

**قوتابیە پەروەردەکراو و پێگەیشتووەکانی:**

هەروەک ئیبن حەجەر دەفەرمووێت: بەس بێت بۆ ئیبن تەیمییە کە قوتابییەکی وەکو (ئیبنولقەیم)ی پێگەیاندووە.

مامۆستا کرێکاریش دەفەرمووێت: ئیبنولقەیم یەکێکە لە چوار قوتابیی ئیبن تەیمییە؛ کە زانستی ئەویان لەگەڵ زوهد و خواناسییەکەیدا هەڵگرتووە، ئەوانی تر(ئیمامی زەهەبی و ئیبن کەسیر و خاتوو بنتوعەییاش) بوون.

هەندێک لە قوتابییەکانی:

١- زەهەبی(محمد بن احمد بن عثمان الذهبي الشافعي) .

٢- ئیبنولقەییمی جەوزی(محمد بن أبی بکر بن أیوب الحنبلي) .

٣- ئیبن عەبدولهادی(محمد بن أحمد بن عبدالهادي) .

٤- ئیبن موفلیح(محمد بن مفلح بن محمد المقدسي الحنبلي) .

٥- ئیبن کەسیر(إسماعیل بن عمر بن کثیر الشافعي) .

٦- بەرزالی(علم الدین القاسم بن محمد البرزالي) .

٧- واستی(أحمد بن إبراهیم بن عبدالرحمن الواسطي) ئیبن تەیمییە ناوی نابوو(جونەیدی سەردەم).

چەندان قوتابی تریش، وەک: ئیبن سەیدولناس و میززی و بەزاڕ و ئیبنولوەردی... هتد.

**دادگاییکردن و زیندانیکردنی:**

هەر لەگەڵ دەرکەوتنی ناو و ناوبانگی لە ناوچەکە و کاریگەری زۆری بەسەر خەڵکییەوە و بیستنی چەند فەتوا و کۆششێکی جیاواز لەوانەی پێشوو، ئەوە بووە هۆی ئەوەی هەندێ لە شەرعناسان و زانایان ڕقی لێهەڵبگرن و بێزاری دەرببڕن لە ئاستیدا، بۆیە کەوتنە دژایەتیکردن و شکاتکردن و تۆمەتبارکردنی بە چەند تۆمەتێکی بێبنەما.

لە ساڵی ٦٩٨ک هەندێ لە زانایان -کە نەیاری ئیبن تەیمییە بوون- بڕیارياندا بیدەنە دادگا. دوایی زانایەک بەناوی(ئیمامەدین) بڕیاریدا خۆی بچێ بۆ لای، تا لە نزیکەوە لەگەڵی دانیشێت و لەو بارەیەوە قسەی لەگەڵ بکا. کە چوو بۆ لای، دوو بە دوو دانیشتن و کەوتنە گفتووگۆ و پرسیار و وەڵام سەبارەت بەو مەسەلانەی ئەو دەیوروژێنێ، بەڵام دەرکەوت هیچ لەو تۆمەتانە راستنین کە دەربارەی دەگوترێ، گوتی: ئیبن تەیمییە لە هیچ کام لەم فەتوایانەدا لە قورئان و سوننەت لای نەداوە، بەڵام نەیارانی بەوە نەوەستان و هەر سوور بوون لەسەر دادگاییکردنی. ئەوەبوو لە ساڵی ٧٠٥ک درا بە دادگا لەسەر ڕەخنەکانی کە لە دژی بیروباوەڕی ئیبنوعەرەبی و حلول و ئاوێتەبوون گرتبووی، داوەرەکان کەوتنە گفتووگۆ لەگەڵیدا، ئیبنتەیمییەش وەڵامی هەموو ئەو تۆمەتانەی دایەوە کە بەرەوڕوویان کردبوویەوە. پاشان گووتی: بیروباوەڕی من لەگەڵ قورئان و سوننەت و ئیجماعی ئوممەتدایە، من جگە لەوە هیچیترم نەگەیاندووە . پاشان تەحەددای هەر کەسێکی کرد تا سێ ساڵی داهاتوو مۆڵەتی پێدەدەم کە بتوانێ بیسەلمێنێ کە قسەیەکم کردووە، تێکگیرە و دژە لەگەڵ هەر قسەیەک لە سێ سەدەی یەکەمی ئیسلام باسکرابێ، ئامادەشم پەشیمان ببمەوە لێی. ئیتر بەو شێوەیە دادگای دووەم و سێیەمیشی بەسەرکەوتوویی تێپەڕاند، پێیانی سەلماند کە بیروباوەڕەکەی سەلامەتە و لە ڕێچکە و ڕێبازی پێشینی ئوممەت لاینەداوە.

**دادگاییکردنی لە میسر:**

لەدوای ئەوەی ئیبن تەیمییە شامی بەجێهێشت و بەرەو میسر کەوتەڕێ، لە ٢٢ی ڕەمەزانی ساڵی ٧٠٥ک گەیشتە قاهیرە، لەو کاتەدا فەتوایەکی ئیبن تەیمییە بڵاوبووبوویەوە، کە وایکرد نەیارەکانی لە میسر بکەونە هاندانی قازی دادوەر تا بانگهێشتی دادگای بکەن، عەللامە نویری دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لەگەڵ شەمسەدینی کەنانی لە خوێندنگەی ناصریيە پێکەوەبووین، لەوکاتەدا قوتابیەک بەناوی

عەبدوڕڕەحمان عینوسی هات و کۆمەڵێک فەتوای ئیبن تەیمییەی لابوو، شەمسەدین چاوی بە فەتواکانی کەوت لێیان ڕازی نەبوو، بۆیە بردی بۆلای دادوەری دادوەران زەینەدین مالیکی، لەوکاتەشدا (نەصری منبجیی) نەیارێکی سەرسەختی ئیبن تەیمیە بوو، بۆیە ئەوەی بە هەل زانی تا داوەری لێ هانبدات، هەروەها لای سوڵتانیش وای نیشان دا کە ڕۆڵی ئیبن تەیمیە تەنها لە مەسەلەی ئاینی نابێت، بەڵکو مەترسی لەسەر کورسی و دەسەلاتی ئەویش دەبێت، بەوەش باری ئیبن تەیمیە بەرەو ئاڵۆزتر و خراپتر چوو، دوای گەیشتنی بە ڕۆژێک ڕاستەوخۆ ڕاپێچی دادگا کرا، پاشان لە بورجدا بەندکرا بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک، لە جەژنی ڕەمەزان بەفەرمی گوازرایەوە بۆ بەندیخانەیەک بەناوی(جب).

زیندانیکردنی شێخی ئیسلام بەتەواوی لە میسر دەنگیدایەوە و کاریگەری زۆری هەبوو لە نێو خەڵکیدا، میر سەیفەدینیش بەوە دڵتەنگ و نارەحەت بوو، داوای کرد بە زووترین کات کێشەی ئەو پیاوە چارەسەر بکرێ، ئەوەبوو داواکرا لەو زانایانەی کە نەیاری بوون، تا بێن مونازەرە و گفتوگۆ بکەن لەگەڵیدا و بەڵگەکانیان دژی بۆچوونەکانی ئەو بخەنەڕوو، بۆ ئەوەی بەزووترین کات بەرپەرچی بدرێتەوە و لە نێو خەڵکیدا ئیعتباری نەمێنێ، بەڵام هیچ یەکێک لەو زانایانە ئامادەیی ئەوەیان تێدا نەبوو، کە بتوانن بەهێزی بەڵگە بەرپەرچی شێخی ئیسلام بدەنەوە، ترسان لەوەی بە بەرچاوی ئامادەبووان لە سوڵتان و داوەر و قازی دەستەوئەژنۆ بکەون بەرامبەر هێزی بیر و زانستە بەرفراوانەکەی، هەر لەبەر ئەوە میر حیسامەدەین بەپەلە هات لە زیندان ئازادی کرد و سوێندیشی پێخوارد بەوەی بمێنێتەوە و درێژە بدا بە دەرس و پێگەیاندن و پەروەردەکردنی فێرخوازان لە خوێندنگەی ساڵحییە.

**زیندانیکردنی بۆ جاری دووەم لە میسر:**

لە ساڵی ٧٠٧ک، لەو کاتەدا دید و بیری سۆفیەکان وەک(وەحدەتولوجود و حلول و موتتەحیدە/ئاوێتەبوون) بەتەواوی لەنێو کۆمەڵگەی میسریدا بڵاوببوویەوە، کاریگەریەکی زۆر سلبی کردەسەر فیکر و عەقیدەی موسوڵمانان. خەڵکەکە

بەتەواوی نوقمی بیدعە و خوڕافیات ببوون لە دیندا، زۆر کاریگەربوون پێی، بەتایبەتی ئیبن فارجی شاعیر، ئیبنتەیمییەش بە پێویستی زانی ئەرکی ڕادان و ڕامالّینی ئەو تەم و لێلّییە لە ئەستۆ بگرێت، تاوەکو سروشت و فیترەتی دینەکە وەک خۆی بخاتەوە بەرچاوی خەلّکی و، ڕزگاریان بکا لەو ئینحراف و لادانەی تێیکەوتوون، ئەوانیش(بەناو سۆفییەکان) ئەمەیان پێ هەزم نەکرا و قبولّ نەکرا، چونکە ئەو لایەنە خوڕافیاتانە ببووە شوناس و کیانێکی تەعەببودی لایان، بۆیە خێرا هانایان بردە لای سولّتان و دەستیانکرد بە سکالاّ و شکات کردن لە ئیبن تەیمییە، ئینجا بەو هۆیەوە بۆ لێپرسینەوە بانگیانکردە دادگا، بەلاّم دوای گفتوگۆیەکی زۆر؛ بێسوود بوو لەگەلّی، نەیانتوانی چۆکی پێ دادەن و پاشەکشە و تەنازوولی پێبکەن، بۆ لێکنزیکبوونەوەیان هەولّیاندا چەند مەرجێک بخەنە بەردەمی، بەلاّم ئەو بە هیچ کام لەو مەرجانە ڕازی نەبوو، لەو پێناوەشدا ئامادەبوو بچێتە زیندان، نەک پاشگەزبوونەوە لە خستنەڕووی سروشتی ڕێچکە و ڕێبازی دینەکە. ئەوانیش(کاربەدەست و سەرانی میسر) هەستیان کرد بێسوودە لەگەلّی، بۆیە کۆتا جار گەیشتنە ئەوەی پێویستە بینێرنەوە دیمەشق، بەلاّم پاشگەزبوونەوە و ڕەوانەی زیندان کرایەوە، براکەشیان لەگەلّ نارد تاوەکو لەوێ خزمەتی بکات. ئیبن تەیمییەیان بۆ زیندانیکردنی ناردە قەلاّیەک لە ئەسکەندەریە، بەلاّم ئەمجارە جێگەکەی باشتر و فراوانتر بوو لە شوێنی زیندانیکردنی پێشووی، خەلّکیش دەیانتوانی سەردانی بکەن چاویان پێیبکەوێت. تا دواتر سولّتان ناصر هاتە سەرتەختی دەسەلاّت و لە جەژنی ڕەمەزانی سالّی ٧٠٩ک سەردانیکرد و لە زیندان ئازادی کرد.

**گەڕانەوەی بۆ شام و، بەندکردنی لە دیمەشق :**

لە دوای دوورکەوتنەوە لە شام بە حەوت سالّ و حەوت هەفتە، دووبارە گەڕاوە ئەو ولاّتە، ئەمەش پاش ئازادبوونی لە بەندیخانەی ئەسکەندەریە لە میسر، لەوێ دووبارە دەستیکردەوە بە نوسین و کاری بانگەواز، بەلاّم زۆری نەخایاند، کێشەیەک

دروست بوو لە نێوان زانایان و موجتەهیدان لەگەڵ ئیبن تەیمییە، لەسەر ئیجتیهادێک سەبارەت بە تەڵاق، کە بۆچوونی ئەو جیاواز بوو لەگەڵ بۆچوونی ئیمامەکانی سەرمەزهەب(شافعی و حەنەفی و حەنبەلی و مالیکی)، فەتواکە ئەوەبوو کە: (سێ تەڵاق بە یەکجاری ناکەوێ، هەروەها کەفارەتی سوێندی تەڵاقیشی دیاریکرد)، ئیتر دوای ئەوە سوڵتان بڕیاری سڕکردنیدا لە فەتوادان، بەڵام ئەو گوێی پێنەدا و هەر بەردەوام بوو لە فەتوادان، لە کۆتایی بڕیاری ئەوەیان دا کە نابێ چیتر فەتوا بدات، ئیبن تەیمییەش سوور بوو لەسەر فەتوادان، چەندین جاری تریش بانگکرا بۆئەوەی پەشیمان بێتەوە، بەڵام هەر بەردەوام بوو، لەو بارەیەوە لە ٢٣ی ڕەجەبی ساڵی ٧٢٠ک کۆڕێک ڕێکخرا کە دەسەڵاتدار و دادوەران و چەند موفتییەک ئامادەبوون، تێیدا بڕیاردرا بە زیندانی کردنی، ماوەی پێنج مانگ و هەژدە ڕۆژی لە زیندان بردە سەر و پاشان ئازادکرا.

**کۆتا دادگایی و زیندانی کردنی؛ تا کۆچی دوایی:**

کۆتا دادگایی و لێپێچینەوە ئەوەبوو؛ لەسەر فەتوایەکی ساڵی ٧٠٩ک دابووی دەربارەی چوونە سەر گۆڕی پێغەمبەری خوا ﷺ و پیاوچاکان، کە بەو شێوەیە هاتووە، دەڵێ: (دروست نییە مەبەستی سەرەکیت لە سەردانیکردنت بۆ مەدینە، گۆڕی پێغەمبەر بێت درودی خوای لەسەر، مەگەر بۆ کارێک بچی لەوێ سەردانی بکەی، ئەوە شتێکی ئاساییە و دروستە). ئیتر بەوە کەوتنەوە دژایەتی و هانابردن بۆ لای سوڵتان، تا بەتەواوی دایبڕن لە فەتوادان و پێگەیاندنی فێرخوازان و تێگەیاندنی خەڵکی، چونکە کاریگەریەکی ئێجگار زۆری هەبوو لەسەر فێرخوازان و خەڵکی ناوچەکە، لە ساڵی ٧٢٦ک، ئیبن جوملە دەقی فەتواکەی گۆڕی و بەرزی کردەوە بۆ لای سوڵتان، دیسانەوە بە ئامادەبوونی کۆمەڵێک دادوەر و قازی دەوڵەت، بڕیاردرا بە زیندانیکردنی لە زیندانی قەڵا(قلعة) لە دیمەشق، براکەشیان لەگەڵدا نارد -کە ناوی شەرەفەددین بوو- تا لەوێ خزمەتی بکات، بەڵام زۆری نەخایاند لە ساڵی ٧٢٧ک براکەی کۆچی دوایی کرد، ئیبن تەیمییە خۆی نوێژی لەسەرکرد، دوای مردنی براکەی

بڕیاریاندا ڕێگربن لە نوسینەکانی، بەوەی کاغەز و قەڵەمی لێ دوور بخەنەوە. ئەویش لەوێ کاتەکانی خۆی هەر بە نوسینەوە و خواپەرستی و قورئان خوێندن بەسەردەبرد، هێندەی نەبرد لە ساڵی ٧٢٨ک توشی نەخۆشی بوو، دوای بیست ڕۆژ بەو نەخۆشییە سەری نایەوە و کۆچی یەکجارەکی کرد . لە گۆڕستانی(الصفية) لە دیمەشق لە تەنیشت براکەی(شەرەفەدین) بە خاک سپێردرا(١).



(١) ئامادەکردنی: شێروان عبدالرحمن..https://new.zadyreman.com/detailnews

# ناساندنی شيخ صالح الفوزان

**كورتەيەك لەژياننامەی شێخ صاڵح فەوزان:**

**ناوی تەواوی:-**

صاڵح ئيبن فەوزان ئيبن عەبدوڵڵا ئەلفەوزان لەهۆزی دەواسرە. لەساڵی : ١٣٥٤ هـ - ١٩٣٥ ز، لە شاری قەصيمی سەربە عەرەبستانی سعوديە لەدايكبووە.

**كار و پيشە:-**

شێخ يەكێكە لەزانا گەورەكانی ڕەوتی سەلەفی - حەنبەليی، ئەندامی هەميشەيی ليژنەی فەتوای سعوديە. بانگخواز و پێشنوێژ و وتاربێژ. فەقيهـ و شەرعزان.

هەروەها ئەندامی "دەستەی گەورە زانايانی سعوديە" و ئەندامی كۆمەڵەی فيقهييە لە مەككە. ئەندامی ليژنەی هەميشەيی توێژينەوەی زانستی و فەتوايە. پێشنوێژ و وتارخوێن و مامۆستا و وانەبێژە لە مزگەوتی ئەمير موتعەب ئيبن عەبدلعەزيز ئال سعود. بە يەكێك لە موفتييە گەورەكانی سعوديە ئەژماردەكرێت و خەڵكی سعوديە و زۆرێكی تر لە مسوڵمانان، بۆ بابەتە فيقهييەكان دەگەڕێنەوە بۆ فەتواكانی و پشتيان پێدەبەستن و پەيڕەوييان لێدەكەن.

**منداڵی و گەنجێتی:**

شێخ صاڵح فەوزان لە تەمەنی مێردمنداڵيدا فێری خوێندنەوە و نوسين و قورئانخوێندن بووە. پاشان چوەتە خوێندنگە و دوای تەواوكردنی ئامادەيی، كراوە بە مامۆستای سەرەتايی. دواتر پەيمانگەی زانستی خوێندوە و بەدوای ئەوەشدا چوەتە كۆلێژی شەريعە لە رياز و ماستەری لە فيقهی ئيسلاميدا بەدەستهێناوە. دواتر لە هەمان كۆلێژ درێژەی بە خوێندن داوە و دكتۆرای لە فيقهدا وەرگرتوە.

**مامۆستاکانی:**

شێخ صاڵح فەوزان لای چەندین بانگخواز و شارەزای ئیسلام و موفتی گەورەی سعودیە وانەی ئایینی خوێندوە، لەوانە شێخ عەبدلعەزیز ئیبن باز و شێخ عەبدوڕڕەحمان سەعدی و شێخ عەبدوڕڕەزاق عەفیفی.

**کار و پیشەکانی تری:**

دوای تەواوکردنی خوێندنی ئایینی، شێخ فەوزان کراوە بە مامۆستای پەیمانگە و پاشان لە کۆلێژی شەریعەی ڕیاز وانەی وتوەتەوە. دواتر لە کۆلێژی "أصول الدین" سەرپەرشتی خوێندنی باڵای کردوە. ماوەیەك بەڕێوەبەری پەیمانگەی باڵای دادوەری بووە و دواتر بووە بە مامۆستا لە هەمان پەیمانگە. دوای چەند ساڵێك لە وانەوتنەوە، شێخ صاڵح فەوزان کراوە بە ئەندامی "دەستەی گەورە زانایانی سعودیە" و ئەندامی کۆمەڵەی فیقهی. ئێستاش ئەندامی لیژنەی هەمیشەیی توێژینەوەی زانستی و فەتوای سعودیەیە.

**بەشێك لە نووسراو و کتێبەکانی شێخ صاڵح فەوزان:**

شێخ چەندان بەرهەمی نوسراوی هەیە، بەناوگترینیان:

١- (**التحقیقات المرضیة في المباحث الفرضیة**) لەزانستی میراتدا، ئەم کتێبەی نامەی ماستەرەکەیەتی و ، یەک بەرگە.

٢- (**أحکام الأطعمة في الشریعة الإسلامیة**) ، ئەم کتێبەشی نامەی دوکتۆراکەیەتی و، یەک بەرگە.

٣- (**الإرشاد إلی صحیح الاعتقاد**) یەك بەرگی بچووکە.

٤- (**شرح العقیدة الواسطیة**) یەك بەرگی بچووکە.

٥- (**البیان فیما أخطأ فیه بعض الکتاب**) یەك بەرگی گەورەیە.

٦- ( **مجموع محاضرات في العقیدة والدعوة**) دوو بەرگە.

٧- (**الخطب المنبریة في المناسبات العصریة**) چوار بەرگە.

٨- (**من أعلام المجددين في الإسلام**).

٩- (**رسائل في مواضيع مختلفة**).

١٠- (**مجموع فتاوى في العقيدة والفقه**) لەچوار بەرگ پێکهاتووە و بەشێکە لەو فەتوایانەی کە لەبەرنامەی (**نور على الدرب**)پێشکەشی کردووە.

١١- (**نقد كتاب الحلال والحرام في الإسلام**).

١٢- (**الملخص الفقهي**) دوو بەرگە.

# پێشەکی نووسەر

بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على نبينا محمد، وعلى آله وصحبه أجمعين . وبعد :**

ئەمە کورتە شەرحێکی [**العقيدة الواسطية**]ــی شێخی ئیسلام شیخ ئیبن تەیمییەیە، لەم سەرچاوانەوە وەرم گرتووە و ئامادەم کردووە:

١-[**الروضة الندية شرح العقيدة الواسطية**]یی شێخ: زيد بن عبد العزيز بن فياض.

٢- [ **التنبيهات السنية على العقيدة الواسطية** ]یی شێخ : عبدالعزيز بن ناصر الرشيد .

٣- [**التنبيهات اللطيفة فيما احتوت عليه الواسطية من المباحث المنيفة** ]یی شێخ : عبدالرحمن بن ناصر السعدي .

هەروەها سوودیشم لەو نووسینانە وەرگرتووە کە کاتی خۆی کاتێ طالیب عیلم بووم کۆمەڵە تەعیلق و سوودێکم ئەوکات لەسەری نووسیبوو .

٤- ئەوەی پەیوەستە بەتەفسیری ئایەتەکان هەریەك لەم تەفسیرانەم بەکار هێنانە [**فتح القدير**]ــی ئیمامی شەوکانی، و[ **تفسير القرآن العظيم** ]ــی پێشەوا ئیبن کەسیر .

داواکارم خوای پەروەردگار بیکاتە مایەی سوود، وئەو ئامانج و مەبەستە بپێکێت کەلەپێناویدا نووسراوە کە ئەویش ڕوونکردنەوەی ئەم عەقیدە مەزن و گەوەرەیەیە، هەروەها لەو هەڵانەم ببوورێت کەتێی کەوتووم، وپاداشتم بداتەوە لەسەر ئەو هەق و ڕاستیەیی کە پێی گەیشتووم و پێکاومە، بەڕاستی خودا بیسەر و وڵامدەرەوەیە.

**وصلى الله وسلم على نبينا محمد، وآله وصحبه، والحمد لله رب العالمين.**

# شەرحی پێشەکی کتێبەکە

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ



نووسەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) سەرەتای کتێبەکەی بە **(بسم الله الرحمن الرحيم)** دەستپێکرد؛ ئەوەش وەك چاوکردن لەقورئانی پیرۆز؛ چونکە هەمووان دەزانین کە سەرەتای هەموو سورەتەکان جگە لەسورەتی (براءة)بە **(بسم الله الرحمن الرحيم)** دەستپێکردووە . هەروەها وەك چاوکردن لەپێغەمبەری ئازیز ﷺ؛ چونکە پێغەمبەر ﷺ کاتی نووسراوێکی بکردایە سەرەتای نووسینەکەی بە **(بسم الله الرحمن الرحيم)** دەستپێدەکرد [1] .

جا وتەی نووسەر : **(بسم الله)** پیتی(بـ) بۆ ئیستیعانە و داوای یارمەتی کردنە، وهەرچی **(الاسم)**یشە لەڕووی زمانەوانییەوە: ئەو وشەیە کە دەلالەت دەکاتە سەر ناولێنراوێك و، لەلای زانانی زانستی نەحو: ئەو وشەیەیە کە سەربەخۆ دەلالەت دەکاتە سەر شتێك و نەبەستراوە بەهیچ زەمان و کاتێکەوە[2] . و**(الجار والمجرور)** پەیوەست**(موتەعلیقە)** بەمەحزوفێك کە دەبێت دوابکەوێت؛ بۆئەوەی سوودی تایبەتکردن و حەصر بدات . و**(الله)** : ناوێکە بۆ زاتی پیرۆزی خودا و، ماناکەی : خاوەنی ئولوهییەت و عوبودییەتە بەسەر هەموو بەدیهێنردراوەکانیەوە. وەرگیراوە لە **(ألَهَ يُولە ألوهة)** کە بەمانای : **(عَبَدَ يُعبد عبادة)** پەرستی، دەپەرسترێت، پەرستن،دێت. وشەی**(الله)** بەمانای **(مألوه)**دێت، واتە: پەرستراو **(معبود)**، و**(الرحمن الرحيم)** دوو

(١) «الرحيق المختوم» للمباركفوري (٣٥٠) .

(٢) «شرح ابن عقيل» (١ / ١٥) ، و «المعجم الوسيط» (١ / ٤٥٢) .

ناوی بەرز و پیرۆز و جوانن لەناوەکانی خودا دەلالەت دەکەن لەسەر ئەوەی خودای پەروەردگار خاوەن ڕەحم و بەزەییە بەو شێوەیەیی کە شایستە و گونجاوە بەخودا، وشەی(**الرحمن**)واتە: خاوەنی ڕەحمەتێکی گشتگیر و عامە و هەموو بەدیهێنراوەکانی بەباوەڕدار و بێباوەڕ و گیانلەبەر گردۆتەوە . و(**الرحیم**) واتە: خاوەنی ڕەحمەتێکی تایبەتە بە باوەڕداران، هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيۡكُمۡ وَمَلَـٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ وَكَانَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَحِيمًا ﴾ [الأحزاب : ٤٣] .

واتە: خوای گەورە ئەو خوایەیە کە صەڵاوات لەسەر ئێوە ئەدات، صەڵاواتی خوای گەورە واتە: ڕەحمەت و بەرەکەتی خۆی دەڕژێنێت بەسەرتانداو لەلای فریشتە بەڕێزەکان ناوتان دەهێنێت و باستان دەکات و مەدح و سایشتان دەکات، وە صەڵاواتی مەلائیکەتیش واتە: دوعای خێرتان بۆ دەکەن و داوای لێخۆشبوونتان بۆ دەکەن لە خوای گەورە، تا خوای گەورە بە هۆی ڕەحمەتی خۆی و دوعای خێری فریشتەکان دەرتان بکات لە تاریکیەکانی کوفرو شیرك و تاوان بۆ نوورو ڕووناکی هیدایەت و یەکخواپەرستی، وە خوای گەورە زۆر بەڕەحم و سۆزو بەزەییە بە باوەڕداران لە دونیاو قیامەتدا.



**الحمد لله الَّذي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وكَفَى بِالله شَهِيدًا.**
**وأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ إِقْرَارًا بِهِ وَتَوْحِيدًا. وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ـ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ ـ تسليمًا مَزِيدًا.**

---

## شەرح

نووسەر سەرەتای کتێبە ناوازەکەی بەم وشە و وتارە دەستپێکرد کە حەمد و سوپاسی خودا و شەهادەدان و سەڵاواتدانی لەسەر پێغەمبەر لەخۆ گرتووە؛ ئەوەش وەك چاوکردن لەپێغەمبەری خودا ﷺ کە وتار و فەرمایشتەکانی بەم وشانە دەستپێدەکرد، هەروەها وەك جێبەجێکردنی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خودا ﷺ: « **كلُّ أمر ذي بالٍ لا يُبدَأُ بالحمد للهِ فَهوَ أقطعُ، وفي روايةٍ: بالحمدِ فَهوَ أقطعُ** » رواه أبو داود وغيره(١)، واتە: هەر کارێکی گرنگ بەحەمد و سوپاسی خودا دەست پێنەکات ئەوا پچڕاو و بێئەنجام و بێبەرەکەتە. لەگێڕانەوەیەکدا هاتووە: «**بسم الله الرحمن الرحيم**»(٢)، واتە: ئەوەی بە ناوی خودای بەخشندەدەی میهرەبان دەستپێنەکان.

ومانای (**أقطع**) : واتە : بێبەرەکەتە و، هەردوو ڕیوایەتەکە ئەوەیان لەخۆگرتووە کە دەستپێکردن بە (**باسم الله**) هەقیقیە و بە(**الحمد لله**) نسبي و ئیزافییە .

بڕگەی : (**الحمد لله**) ئەلیف و لامەکەی بۆ ئیستغراق و گشتگیرییە، واتە: هەموو حەمد و سوپاسێك موڵکی خودا و هی خودایە و تایبەتە بەزاتی ئەو و، شیاوە بەو،

---

(١) ضعيف : أخرجه أبو داود (٤٨٤٠) ، والنسائي في «عمل اليوم والليلة» (٤٩٤) ، وغيرهم .
(٢) ضعيف جدا : ضعفه الشيخ الألباني في «الإرواء» (١) .

و(**الحمد**)لەڕووی زمانەوانییەوە : وەسف وسەنایە بەسیفەتی جوان و کرداری پەسەند و چاك.

لەعورف و زاراوەدا: کردارێکە گەواهی دەدات لەسەر گەورەیی نیعمەت بەخش ئەوەش بەهۆی ئەوەی نیعمەتی بەخشیوە و ئەمەش پێچەوانەی سەرزەنشت و بەخراپە باسکردنە.

(**الله**) پێشتر قسەمان لەبارەوە کرد. (**الذي أرسل رسوله**) خوای پەروەردگار حەمد و سوپاس و ستایش دەکرێت لەسەر نیعمەتەکانی کە لەهەژمار نایەن و هەر لەو سۆنگەیەشەوە (**أرسل**) واتە : پێغەمبەرەکەی کە موحەممەدە ناردووە . و(**الرسول**) لەڕووی زمانەوانییەوە[1]: ئەو کەسەیە کە پەیامێکی پێدا نێردراوە . ولەڕووی شەرعی و زاراوەوە : مرۆڤێکی نێرە و وەحی بۆ هاتووە بەشەرع و پەیامێك و فرمانی پێکراوە بەگەیاندنی .

(**بالهدى**) واتە : زانستی بەسوود، کە ئەویش هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی لەهەواڵ و پەیامی ڕاست و فرمان و ڕێگری و گشت یاسا و شەریعەتە سوودبەخشەکانی تر .

---

(١) زانایان جیاوازی لە پێناسەکردنی هەریەک لە (**النبي**) و(**الرسول**) لە شەریعەتی ئیسلامیدا، ڕاسترین وتەیان بریتیە لە: (**النبي**): ئەو کەسەیە کە خودا ئیلهام و وەحی بۆ ناردووە بەوەی ئەنجامی دەدات و فەرمانیش بەوە دەکات بە ئیمانداران، و(**الرسول**)یش: ئەو کەسەیە کە خودا ئیلهامی و وەحی بۆ ناردووە بۆ هەرکەسێکی ناردووە کە فەرمانی خودا پێشێل بکات بۆ گەیاندنی پەیامی خودا. جیاوازی نێوانیان ئەوەیە کە (**النبيّ**): ئەو کەسەیە کە خودا ئاگاداری کردووەتەوە لەفەرمان و قەدەغەلێکراوەکانی بۆ ئەوەی موخاتەبەی ئیمانداران بکات و ئاگاداریان بکاتەوە و فەرمانیان پێبکات، بەلام موخاتەبەی کافرەکان ناکات و بۆیان نانێردرێت. سەبارەت بە (**الرسول**): ئەو کەسەیە کە نێردراوە بۆ بێباوەڕان و ئیمانداران بۆ ئەوەی پەیامی خودایان پێ بگەیەنێت و بانگهێشتیان بکات بۆ عیبادەت. دواتر مەرج نییە (**الرسول**) یاسا و شەریعەتێکی نوێ بهێنێت. بڕوانە: «**شرح العقيدة الواسطية**» لە نووسینی موحەممەد خەلیل هەرراس.

✍جا (**الهدى**) دوو جۆرە :

**جۆری یەکەم:** (**هدى**) بەمانای ڕێنیشاندان و ڕوونکردنەوە دێت، هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ﴾ [فصلت : ١٧] ،واتە: قەومی سەمودیش ئێمە ڕێگای ڕاستمان پێ ناساندن و بۆمان روون کردنەوەو بانگمان کردن بۆی لەسەر زمانی صالح پێغەمبەر ﷺ بەڵام ئەوان ڕێگای کوێری و کوفر و گومراییان هەڵبژارد بەسەر ڕێگای هیدایەت و گوێڕایەڵی و ئیماندا، وپێغەمبەریش ﷺ هەمان کاری کرد، هەروەك لەم فەرمایشتەدا هاتووە: ﴿ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ [الشورى : ٥٢] ، واتە: وە تۆ ئەی محمد ﷺ هیدایەتی خەڵکی ئەدەیت و ڕێنماییان دەکەیت بۆ ڕێگای ڕاستی خوای گەورە.

**جۆری دووەم :** (**هدى**) بەمانای تەوفیق دان و ئیلهام و بەخشینی ڕێنوێنی دێت، ئەمەیان نەفی کراوە لەپێغەمبەر ﷺ و جگە لەخودا هیچ کەسێك توانای بەسەردا نییە، هەروەك لەم فەرمایشتەی خوای پەروەردگاردا ئاماژەی پێدراوە : ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ﴾ [القصص: ٥٦] .

واتە: ئەی موحەمەد ﷺ بە دڵنیایی تۆ ناتوانی هیدایەتی کەسێك بدەی کە خۆشت ئەوێ خۆشەویستی سروشتی نەك شەرعی، چونکە زۆر بەرگری لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد، یان پێت خۆشە ئیمان بێنێ، بەڵکو خوای گەورە خۆی هیدایەتی هەر کەسێك ئەدات کە ویستی لێ بێت و ئەو کەسە شایەنی هیدایەت بێت.

(**دين الحق**) بریتییە لەکردەوەی چاك، و(**الدين**) هەندێ جار بەمانای پاداشت و سزاش دێت، هەروەك لەم فەرمایشتەی خوای پەروەردگاردا ئاماژەی پێدراوە :

﴿ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾ [الفاتحة: ٤] ، واتە: خاوەنی ڕۆژی پاداشت و تۆڵەیە، کەسێکی ترنییە - بێجگە لەو- شتێکی بەدەست بێت.

هەندێ جاریش بەمانای ملکەچ بوون و خۆشکاندن دێت، و ئیزافەکردن ودانەپاڵی وشەی(**الدين**) بۆلای وشەی(**الحق**) لەبابی ئیزافەی مەوسوفە بۆلای وەسفەکەی واتە: دینی هەق، وهەق چاووگی(**حَقَّ يَحِقُّ**)، کەبەمانای : جێگیر بوون و پەیوەیست بوون دێت و دژەکەشی باتڵ وناهەقییە.

(**ليظهره على الدين كله**) واتە: بۆ ئەوەی سەریبخات بەسەر هەموو ئاینەکانی تردا بەبەڵگە و حوجحە وجیهاد و تێکۆشان تاوەکو سەرکەوێت بەسەر هەموو دژەکانیدا کە لەسەر زەویدا هەن[1] ، لەعەرەب و عەجەم و بێباوەڕ و هاوبەشدانەران، ئەوەش هاتە دی و بەدەست هات؛ موسوڵمانان بەڕاستی تێکۆشان و جیهادیان کرد لەپێناوی خودادا تاوەکو وڵاتی ئیسلامی بەتەواوی بەرفراوان بوو و، ئەم دینە لەخۆرهەڵات و خۆرئاوادا بڵاوبوویەوە.

(**وكفى بالله شهيداً**) واتە : شایەتە لەسەر ئەوەی موحەممەد پێغەمبەری ئەوە و ئاگاداری هەموو کردارەکانیەتی و سەریخستووە بەسەر دوژمنەکانیدا، ئەوەش بەڵگەیەکی یەکلایکەرەوەیە لەسەر ڕاستگۆی ئەم پێغەمبەرە، خۆ ئەگەر درۆی بەدەم خوداوە بکردایە هەر زوو خودا سزای دەدا، هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾﴾

---

(١) هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿**هو الذي أرسل رسوله بالهدى ودين الحق ليظهره على الدين كله ، ولو كره المشركون**﴾ [التوبة : ٣٣] ،واتە: هەر ئەوخوایە خۆیەتی، پەیامبەری خۆی نارد بەڕێ نیشاندەری ئایین و ڕێبازی حەق و حەقیقەت، بۆ ئەوە بەسەر گشت ئایینەکانی تردا زاڵیکات، ئەگەر چی هاوبەشدانەرەکانیش حەز نەکەن و پێیان خۆش نەبێت. وە لەم فەرموودەیەکدا هاتووەو دەفەرموێ: «**إنَّ اللهَ زَوَى لي الأرْضَ، فَرَأَيْتُ مَشارِقَها ومَغارِبَها، وإنَّ أُمَّتي سَيَبْلُغُ مُلْكُها ما زُوِيَ لي مِنْها**» صحيح مسلم، كتاب الفتن وأشراط الساعة، باب هلاك هذه الأمة بعضهم ببعض، حديث: ٥٢٥٢. واتە: خوا خۆرهەڵات و خۆرئاوای ڕووی زەوی پێچایەوە بۆم - وەکو نەخشە - هێنرایە پێش چاوم و دیتم، پاشان فەرمووی: ڕۆژێ دێتە پێش ئوممەتی من تەواوی ئەو شوێنانە - لەم نەخشەیەدا بۆم تۆمارکراوە - دەگرێتە دەست.

[الحاقة : ٤٦،٤٤] ، واتە: ئەگەر ئەو پەیامبەرە ﷺ هەندێ قسەی لە سەرمان هەڵبەستبا، بێگومان بەهەموو توانا، بە توندی دەمانگرت، و پاشان ڕەگی دڵیمان دەبڕی.

**(وأشهد** [١] **أن لا إله إلا الله)** واتە: ئیقرارِ دەکەم و دان دەنێم بەوەی هیچ کەسێك بەهەق شیاوی پەرستن نییە جگە لەزاتی الله ﷻ.

**(وحده لا شريك له)**واتە: هیچ هاوەڵ و هاوبەشێکی نییە. ئەم دوو بڕگەیە تەئکید کردنەوەی مانا و مەبەستی شەهادەی **(لا إله إلا الله)** کە نەفی و ئیسپاتی لەخۆگرتووە - کە ئەویش نەفی خودایی بوونی جگە لەخودایە و ئیسپاتکردنی خودایی خودایە، جا وشەی: **(وحده)** تەئکید کردنی ئیسپاتکردنەکەیە، وبڕگەی: **(لا شريك له)** تەئکیدکردنی نەفی و ڕەتکردنەوەکەیە .

بڕگەی : **(إقرارًا به وتوحيدًا)** دوو چاووگن تەئکید لەمانای ڕستەکەی پێشوو دەکەنەوە.

**(وأشهد أن لا إله إلا الله . . . إلخ)** واتە: داننان بەزمان و، تەوحید، واتە: ئیخلاص و دڵسۆزی لەهەموو عیبادەتێکی گوفتاری یاخود کرداری یاخود بیروباوەڕی .

وە بڕگەی : **(وأشهد أن محمداً عبده ورسوله)** واتە : بەزمانم دانی پێدا دەنێم و بەدڵ باوەڕم وایە خوای پەروەردگار بەندەکەی کە موحەممەدە ناردووە بۆ هەموو خەڵك؛ چونکە شایەتی دان بۆ ئەم پێغەمبەرە هاوکاتە لەگەڵ شایەتی دان بەوەی خودا

---

(١) جا **(الشهادة)** : هەواڵدنە لەبارەی شتێکەوە بەرمەبنای عیلم و زانیاری لەبارەیەوە، وباوەڕبوون بەڕاسی و دروستی، وشەهادەن حسێبی بۆ ناکرێت ئیللا ئەبێت لەگەڵیدا دانپێنان و ملکەچ بوونی لەگەڵ بێت، و دڵ وا لەزمان بکات دەریبڕێت ؛ ئەوەتا خوای پەروەردگار مونافیقەکان بەدرۆ دەخاتەوە لەبارەی شەهادەکەیانەوە کە دەیان گوت: ﴿**نشهد إنك لرسول الله**﴾ [المنافقون: ١] ؛ واتە: شایەتی دەدەین تۆ پێغەمبەر و نێردراوی خودایت. خوداش فەرمووی: ﴿**والله يشهد إنهم لكاذبون**﴾واتە: خودا شایەتی دەدات بەوەی ئەوانە درۆ دەکەن. لەکاتێدا بەزمانیش شایەتیەکەیاندا .

بێهاوتا و هاوەڵە و هیچ یەکێکیان(ئەم دوو شایەتیە) بێ ئەویتر سوود بەخاوەنەکەی ناگەیەنێت.

برگەی : **(عبده ورسوله)** ڕەد و وڵامی کەسانی زێدەڕەو و کورتڕەوی بەرانبەر بەپێغەمبەر ﷺ لەخۆگرتووە، کەسانی زێدەڕەو پێغەمبەریان زیاد لەسنووری خۆی بەرز کردووەتەوە تا ئاستی پەرستن و بەندایەتی بۆ کردن، لەبەرانبەریشدا کەسانی کورتڕەو پشتیان کردووە لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی، وەك ئەوەی پێغەمبەر نەبێت و وەك کەسێکی ئاسایی تەماشای دەکەن، جا شایەتی دان بەوەی لەلای خوداوە هاتووە نەفی غلو و زێدەڕۆی دەکات لەوەی زیاد لەپلە وپایەیی خۆی بەرزبکرێتەوە، وشایەتیدان بەوەی پێغەمبەری خودایە وا دەخوازێت: ئیمانی پێبهێندرێت و گوێڕایەڵی بکرێت لەوشتانەدا کە فرمانی پێکردوون، و بەڕاستخستنەوەی لەوانەی هەواڵی لەبارەوە داون، ودوور کەوتنەوە لەو شتانەی کە ڕێگری لێکردوون، وشوێنکەوتنی لەو شتانەدا کەپێی هاتووە و تەشریعی کردووە .

برگەی : **(صلى الله عليه)** و**(الصلاة)**: لەڕووی زمانەوانییەوە بەمانای دوعا و پاڕانەوە دێت و، ڕاسترین بۆچوون لەبارەی سەڵاواتی خودا لەسەر پێغەمبەر: ئەو بۆچوونەیە کە پێشەوا بوخاری لەصەحیحەکەیدا لە ئەبو عالیەوە گێڕاویەتیەوە[1]و دەڵێت: سەڵاواتی خودا لەسەر پێغەمبەرەکەی وەسف و ستایشکردنیەتی لەلای فریشتە نزیکەکانی.

**(وعلى آله)** ئالی مرۆڤ: خزم و کەسە نزیکەکانیەتی . وڕاسترین بۆچوون لەم بارەیەوە ئەوەیە مەبەست لە ئالی پێغەمبەر لێرەدا شوێنکەوتووەکانیەتی لەدینەکەیدا، واتە: ئەوانەی باوەڕیان پێی هێناوە و شوێنی کەوتوون .

---

(١) «فتح الباري» ( ٨ / ٦٧٦) كتاب التفسير ، باب ﴿إن الله وملئكته يصلون على النبي..﴾ [الأحزاب : ٥٦ ] بلفظ : (صلاة الله ثناؤه عليه عند الملائكة ، وصلاة الملائكة الدعاء) .

**(وأصحابه)** جەمعی **(صاحب)**ـە و، عەتفی خاصە لەسەر عام. و**(الصحابي)** : ئەو هاوەڵانە دەگرێتەوە کە پێغەمبەریان بینیوە و باوەڕیان پێهێناوە و لەسەر ئەو باوەڕە مردوون .

**(وسلم تسليماً مزيداً)** سەلام: بەمانای سڵاو یاخود سەلامەتی دێت لەهەر کەم و کورتی و ناتەواویەك.

وشەی: **(مزيداً)** ئیسمی مەفعولە و لەزیادەوە هاتووە کە بەمانای زیادکردن و گەشەکردن دێت و، هەریەك لەسەڵات و سەلامی پێکەوە هێنا؛ لەپێناو بەجێهێنانی ئەم فەرمایشتەی خوای پەروەردگار: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ صَلُّوا۟ عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا﴾ [الأحزاب: ٥٦] ،واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! درووردو (صەڵەوات)ی لەسەر بدەن، وە سەلامی لێبکەن.



## كۆمەڵەی ڕزگاربوو

**أَمَّا بَعْدُ؛ فَهَذَا اعْتِقَادُ الْفِرْقَةِ النَّاجِيَةِ الْمَنْصُورَةِ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ:**
**لەپاشان؛ ئەمە عەقیدەی كۆمەڵەی ڕزگاربووە تاوەكو ڕۆژی دوایی**

---

### شەرح

**(أما بعد)** ئەم وشەیە بەكار دەهێندرێت بۆ چوون لەئوسولبێكەوە بۆ ئوسلوبێكی تر وماناكەی ئەمەیە : بابەتەكە هەرچۆنێك بێت. وسوننەتە لەوتار و نووسینەكاندا بەكاربهێندرێت[1] وەك چاوكردن لەپێغەمبەر ﷺ چونكە هەركات وتاری بدایە ئەمەی دەفەرموو .

**(فهذا)** ئاماژەیە بۆ ئەو بابەتەی كە كتێبەكە لەخۆی گرتووە لەعەقیدە كە بەكورتی ئاماژەی پێداوە بەگوتنی : **(وهو الإيمان بالله . ...)** هتد .

**(اعتقاد)** چاوگی : **(اعتقد)**ـەیە كاتێ شتێك یاخود بابەتێك بكات بەعەقیدە بۆ خۆی و، عەقیدەش: هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە كە مرۆڤ باوەڕی دڵی لەسەر دادەمەزرێنێت - دەڵێت( **اعتقدت كذا**) - واتە : دڵم و ناخم لەسەری دەمەزراند، وە لەبنەڕەتدا لە **(عقد الحبل إذا ربطه)** هاتووە، واتە: گرێی لەحەبلەكەداوە كاتێ كە دەیبەستێت ؛ پاشان بۆ بیروباوە و عەقیدەی دڵ و دڵنیایی تەواو بەكار هێندراوە.

**(الفرقة)** واتە : تاقم و كۆمەڵ و گرووپ، و**(الناجية)** واتە : ئەوەی كە لەشەڕ و خراپەكانی دونیا و دواڕۆژ سەلامەت و ڕزگار بووە، وخۆشبەختی بەدەست هێناوە.

ئەم وەسفە لەو فەرمایشتەوە وەرگیراوە كە دەفەرموێت : «**لا تزالُ طائفةٌ مِنْ أُمَّتي ظاهرينَ على الحقِّ منصورة لا يضرُّهُمْ مَنْ خذلَهُمْ وفارقَهمْ حتَّى يأتيَ أمرُ اللهِ**» رواه

---

(١) وذكرها كثير في السنة ، مثاله في البخاري حديث رقم (٧١٩٧) ، ومسلم (١٧٨١) .

البخاري ومسلم [١]، واتە: کۆمەڵێك لەئوممەتەکەم بەردەوام لەسەر هەقن و، پشت تێکردنی خەڵك زیانیان پێناگەیەنێت تاوەکو قیامەت دێت.

**(المنصورة)** واتە: سەرخراو بەسەر موخالیفەکانیدا تاوەکو ڕۆژی دوایی، ئەو کاتەی کە بایەك دێت ڕوحی هەموو باوەڕدارێك دەکێشێت، ئا ئەوە مەبەست لەو کاتەیە کە لەبارەی باوەڕدارانەوە هاتووە . بەنیسبەت ئەو کاتەی کە دونیایی پێ کۆتایی دێت ئەوا بەسەر خراپترینی کەسانی زەویدا دێت ؛ هەروەك لەصەحیحی موسلیم دا هاتووە: «**لاَ تَقُومُ السَّاعةُ حَتَّى لاَ يُقَالَ فِي الأَرْضِ: الله، الله**»[٢] ، واتە: قیامەت نایەت تاوەکو کاتێ بەسەر خەڵکدا دێت و لەسەر زەویدا دەوترێت: (الله الله)،واتە: ئاینی ئیسلام بەشێوەیەك لەناو دەچێت و کاڵدەبێتەوە تەنها ناوی خودایان لەبیر دەمێنێت .

پێشەوا حاکم فەرموودەیەکی لەعەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە گێڕاوەتەوە و، تێیدا هاتووە : «**ثُمَّ يَبْعَثُ اللهُ رِيحًا كَرِيحِ المِسْكِ مَسُّهَا مَسُّ الحَرِيرِ، فلا تَتْرُكُ نَفْسًا في قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنَ الإيمَانِ إلَّا قَبَضَتْهُ، ثُمَّ يَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ عليهم تَقُومُ السَّاعَةُ**»[٣] .

واتە: پاشان خوای گەورە بایەک هەڵدەکات کە بۆنی بۆنی میسکە، لە ئاورێشم نەرمترە هەموو کەسێک کە هەڵیدەمژێت دەمرێت بەو هۆیە یەک کەس کە میثقاڵە زەڕەیەک ئیمانی لە دڵدایە لەسەر زەوی نامێنێت، پاشان خراپترینی کەسانی سەر زەوی دەمێنن و قیامەت بەسەریاندا هەڵدەستێت.

---

(١) متفق عليه : أخرجه البخاري (٧٣١١) ، ومسلم (١٩٢٣).
(٢) برقم (١٤٨) .
(٣) في «المستدرك ، (٤/٤٥٦) ، وأخرجه مسلم برقم (١٩٢٤).

أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ.

شەرح

(أهلِ السنة) وشەی (أهلِ) بەکەسری لامەکەی بەدەلە بۆ وشەی(**الفرقة**)، ودروستیشە ڕەفع بکرێت بەو پێیە بکرێت بە (**خبر**) بۆ (**مبتدأ**)ێکی مەحزوف کە لەتەقدیرا (**هم**)ـە . و(**السنة**) [1]: ئەو ڕێگا و ڕێبازەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری بووە، ئەوەش هەموو قسە و کردەوە و تەقریراتەکانی لەخۆ دەگرێت، بۆیە ناویان نراوە بە (**أهل السنة**) ؛ لەبەر نیسبەتیان بۆلای سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ودووریان لەهەر ڕێچکە و ڕێبازێکی لاڕێ و بیدعی ئەوەش بەپێچەوانەی بیدعەچییەکانەوە کە دەدرێنە پاڵ بیدعە و گومڕاییەکانیان؛ هاوشێوەی قەدەری و مورجیئەکان و، هەندێ جار دەدرێنە پاڵ سەرکردەکانیان هاوشێوەی جەهمییەکان و، هەندێ جار دەدرێنە پاڵ کردەوە چەوتەکانیان ؛ وەك ڕافیزە و خەواریجەکان .

(**والجماعة**) لەڕووی زمانەوانیەوە : ئەو کۆمەڵەیە کە کۆبوونەتەوە لەسەر هەق و جێگیر ودامەزراون لەسەر کیتاب و سوننە کە ئەوانیش بریتین لەهاوەڵان و تابیعین و شوێنکەوتوانیان لەچاکەدا هەرچەند ژمارەشیان کەم بێت و کەمینە بن هەروەك

---

(١) پێشەوا (**ابن رجب الحنبلي**) دەڵێت : « والسنة: بریتیە لەڕێگەیەکی پەیڕەوکراو؛ ئەمەش: دەستگرتنە بەوەی پێغەمبەر ﷺ وخەلیفە ڕاشیدەکان لەسەری بوون، لەعەقیدە و کار و گوفتار، ئا ئەمە سوننەتی تەواوە ؛ هەربۆیە کاتی خۆی سەلەف ناوی سوننەیان نەدەدا بەسەر هیچ شتێکدا ئیللا کاتێ نەبێت کە هەموو ئەوشتانەی لەخۆ بگرتایە» ، انظر : «**جامع العلوم والحكم**» (ص ٢٨٦) .

عەبوڵڵای کوڕی مەسعود (خوا لێی ڕازی بێت) دەیگوت: «**الجَماعَةُ ما وافَقَ الحَقَّ وإنْ كُنْت وحْدَك، فَإنَّك أنْتَ الجَماعَةُ حِينَئِذٍ الجماعة**»[1] .

واتە: جەماعەت وکۆمەڵی هەق ئەوەیە کە لەسەر هەقە ئەگەر بەتەنها خۆتیش بیت، ئەوکات تۆ بەتەنها جەماعەت و کۆمەڵی هەقی.

(١) صحيح : أخرجه اللالكائي في « شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة » (١ / ١٠٨ - ١٠٩) ، وصححه الشيخ الألباني في «مشكاة المصابيح» برقم (١ / ٦١) وقال : رواه ابن عساكر في «تاريخ دمشق» (١٣ / ٣٢٢ / ٢) بسند صحيح .

# پایەکانی باوەڕ

**وَهُوَ الإِيمانُ بِاللهِ وَمَلاَئِكَتِهِ، وكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْبَعْثِ بَعْدَ الْمَوْتِ، والإِيمَانِ بِالْقَدَرِ خِيرْهِ وَشَرِّهِ .**

**بریتییە لە باوەڕهێنان بەخودا و فریشتەکانی و کتێبەکانی وپێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و زیندوو بوونەوەی دوای مردن، وباوەڕبوون بەقەزاو قەدەر بەخێر و شەڕیەوە.**

## شەرح

**(وهو)** واتە : بیروباوەڕی تاقمی ڕزگاربوو **(الإیمان)** ئیمان: لەڕووی زمانەوانیەوە: بەمانای بەڕاست خستنەوە دێت هەروەك خوای پەروەردگار لەئایەتی (١٧) سورەتی **(یوسف)** دا فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَنتَ بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا﴾ واتە: تۆ بەڕاستمان نازانین و باوەڕمان پێ ناکەیت.

پێناسەی (باوەڕ) لەڕووی شەرعیەوە بریتییە لە: **(قول باللسان واعتقاد بالقلب وعمل بالجوارح)** واتە: بەزمان دانیان پێیدا و لەدڵەوە باوەڕهێنان پێی و ئیقرارِ کردنی و بەکردەوە جێبەجێ کردنی [١].

بڕگەی : **(بالله وملائکته وکتبه ورسله والبعث بعد الموت، والإیمان بالقدر خیره وشره)** واتە: باوەڕهێنان بەخودا و فریشتەکانی و کتێبەکانی وپێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و زیندوو بوونەوەی دوای مردن، وباوەڕبوون بەقەزاو قەدەر بەخێر و شەڕیەوە، ئائەم شەش پایەیە ڕوکن و پایەیی ئیمان و باوەڕن و، باوەڕی هیچ کەسێك دروست

(١) بڕوانە : « شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة » (٨٣٠) .

نابێت بەبێ بوونی ئەم شەشە بەشێوەیەکی دروست بەو شێوەیەی کە لەقورئان و سونەتدا هاتووە و، ئەو پایانەش بریتین لە[1] :

١- باوەڕهێنان بەخودا (**الإيمان بالله**) [2] : کە بریتییە لەبیروباوەڕێکی چەسپاو دامەزراو بەوەی خوای پەروەردگار خودا و خاوەنی هەموو شتێکە، وهەموو سیفەتێکی کامڵی تێدایە، دوورە لەهەموو عەیب و ناتەواویەك و، بەتەنها شیاو و شایستەی عیبادەت بۆکردنە و هیچ هاوەڵ و هاوبەشێکی نییە، هەستان بەوە و جێبەجێ کردنی بەعیلم و سەلماندنی بەکردار .

٢- باوەڕبوون بەفریشتە(**الإيمان بالملائكة**) [3]: واتە : بوونی فریشتە بەڕاست بزانی، ئەوان بەو شێوەیەن کە خوای پەروەردگار لەقورئانەکەیدا باسی کردوون، هەروەك لەم دوو ئایەتەی (٢٦ ، ٢٧) سورەتی (**الأنبياء**)دا هاتووە : ﴿بَلْ عِبَادٌ

(١) بڕوانە : «الإرشاد إلى صحيح الاعتقاد والرد على أهل الشرك والإلحادة» لفضيلة الشيخ صالح الفوزان .

(٢) باوەڕبوون بەخودا چوار بابەت لەخۆ دەگرێت : ١ - باوەڕبوون بەبوونی خودا (سبحانه وتعالى). ٢- باوەڕبوون بەوەی تاك و تەنهایە لە(**الربوبية**)دا، واتە: تەنهایە لە خاوەنداریەتی و بەدیهێنان و ڕزق وڕۆزی دان و ژیاندن و مراندن ..هتد. ٣- باوەڕبوون بەوەی تاك و تەنهایە لە(**الألوهية**)دا، واتە: تەنهایە لە پەرستن و پشت پێبەستن و هەموو جۆرە بەندایەتی بۆ کردنێك ..هتد. ٤- باوەڕبوون بەناو و سیفەتەکانی، بەوشێوەیەی کە لە قورئان و سونەتدا هاتووە بەبێ بۆ زیادکردن ولێکەمکردن.

(٣) و(**الملائكة**) : جەمعی(**ملك**)، وئەسڵەکەی(**مألك**)ـە و، لە (**الألوكة**)ـەوەهاتووە ، کەبریتیە لەڕیسالە و پەیام و، ئەوان جۆرێکن لەدروستکراوەکانی خودا و لەئاسمانەکانیدا جێگیری کردوون و، کار و باری دروستکراوەکانی پێسپاردوون و، لەقورئانەکەیدا بەوە وەسفی کردوون کە بەهیچ شێوەیەک بێفەرمانی ناکەن و هەرکارێکیان پێ بسپێردرێت جێبەجێی دەکەن و، بەشەو ڕۆژ زیکر و تەسبیحاتی خودا دەکەن و توشی بێزاری و هیلاکبوون نابن. پێویستە لەسەرمان باوەڕیان پێبێنین وبەو سیفات و کارانەشیان کە لە قورئان و سونەدا هاتوون و، زیاد لەوە نەڕۆین و لە خۆوە هیچ شتێک دەربارەیان نەڵێین، چونکە ئەوان عالەمێکی غەیبین و هیچ لەبارەیانەوە نازانرێت مەگەر ئەوە نەبێت کە خودا و پێغەمبەرەکەی فێریان کردووین.

مُّكۡرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسۡبِقُونَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ وَهُم بِأَمۡرِهِۦ يَعۡمَلُونَ ﴾ واتە: بەڵکو کۆمەڵە بەندەیەکی ڕێزداری ئەون و، خوا خۆی هەڵی بژاردوون و، زۆریش پاک و بێ خەوشن، هەرگیز ئەو فریشتانە قسەی خۆیان پێشی قسەی ئەو ناخەن، واتە: شتێک ناڵێن لەگەڵ فەرمایشتی خوادا دژ بێ و نەگونجێت و هەر بەپێی فەرمانی ئەو کار ئەکەن.

بەبەڵگەی قورئان و سوننەت جۆرەکانی فریشتە و چۆنیەتیان چەسپاوە و، هەر یەکەیان کار و مەهامێکیان پێسپێردراوە و بەجێی دێنن، بەو شێوەیەی کە خودا فەرمانی پێکردوون، پێویستە ئیمان بەمانە هەمووی بهێندرێت.

٣- باوەڕهێنان بەکتێبەکان **(الإيمان بالكتب)** : واتە : باوەڕبهێندرێت بەو کتێبانەی کە خوای پەروەردگار دایبەزاندووەتە سەر پێغەمبەرەکانی و، باوەڕبوون بەوەی ئەو کتێبانە کەلامی خودان، هەق و نوور و ڕێنوێنین و پێویستە باوەڕ بهێندرێت بەوانەی کە خودا ناوی هێناون لەوانە؛ تەورات وئینجیل و زەبور و قورئان هەروەها باوەڕهێنان بەوانەش کە خودا ناوی نەهێناون و بەیانی نەکردوون .

٤- باوەڕهێنان بەوپێغەمبەرانەی کە خودا ناردوونی بۆ بەدیهێنراوەکانی **(الإيمان بالرسل الذين أرسلهم الله إلى خلقه)** : واتە: بەڕاست دانانی هەموویان، بەوەی باوەڕی وابێت هەموویان ڕاستگۆن لەوەی هەواڵیان لەبارەوە داوە، ئەوان پەیامی خودایان گەیاندووە و، جیاوازی نەکردن لەنێوانیاندا بەوەی ئیمان بەهەندێکیان بهێندرێت و ئەوانی تر بەڕاست نەزانرێت ئا ئەم جۆرە باوەڕە سوود بەخاوەنەکەی ناگەیەنێت، بەڵکو پێویستە باوەڕ بەهەموو ئەوانە بێنین کە خودا ناوی هێناون، خوای پەروەردگار لەئایەتی ژمارە (١٦٤) سورەتی( **النساء**)ـدا فەرموویەتی : ﴿ وَرُسُلًا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلًا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَ ﴾، واتە: پێغەمبەرانێك کە باسیانمان بۆت کردووە، و پێغەمبەرانێکی تر کە سەرگوزشتەیانمان بۆت نەگێڕاوەتەوە، واتە: وە لەپێشەوە چەند پێغەمبەرێکی تریشمان ناردووە،ئەوانە

هێندێکیان بوون کە لەئایەتی (١٦٣) دا باسکران ﴿وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ﴾ واتە: پێغەمبەر گەلێکی تریش هەن ، کە لەقورئاندا بۆم باس نەکردوویت.

**تێبینی:** ئەو پێغەمبەرانەی لەقورئاندا ناویان هاتووە بریتین لە: (ئادەم، ئیدریس، نووح، هوود، صالح، ئیبراهیم، لووت، ئیسماعیل، ئیسحاق، یەعقووب، یووسف، ئەیووب، شوعەیب، مووسا، هاروون، یونس، داوود، سولەیمان، ئیلیاس، ئەلیەسەع، زەکەریا، یەحیا، عیسا، زەلکیفل، پێغەمبەرمان موحەممەد سەلات و سەڵاویان لێ بێت).

باشترینیان پێغەمبەرە ئولوعەزمەکانن کە بریتین لە: (نوح وئیبراهیم وموسا وعیسا وموحەممەد) (عليهم الصلاة والسلام) پاشان گشت پێغەمبەران و پەیامهێنەرانی خودا و، باشترینی هەموان کۆتا پێغەمبەرە کە ئەویش پێغەمبەری خۆمان موحەممەدە ﷺ.

ڕاسترین بۆچوونێك كە وترابێت لەبارەی جیاوازی نێوان (**النبي والرسول**) : (**النبي**) : ئەو کەسەیە کە وەحی و پەیام و شەریعەتی بۆ نێردراوە و فرمانی گەیاندنی پێنەکراوە ، و(**الرسول**): ئەو کەسەیە کە وەحی و پەیام و شەریعەتی بۆ نێردراوە و فرمانی گەیاندنی پێکراوە [1].

٥- باوەڕهێنان بەزیندوو بوونەوە (**الإيمان بالبعث**): کە بریتییە لە بەڕاست دانانی هاتنە دەرەوەی مردووەکان لەگۆڕەکانیان لەڕۆژی دواییدا؛ ئەوەش لەپێناو لێپرسینە و وحساب و کتابدا، هەروەها پاداشت و سزا دانیان لەسەر ئەو کار و کردەوانەی کە لەژیانی دونیادا ئەنجامیان دابوو بەو شێوەیە لێپرسینەوەی کە خوای پەرەردگار لەقورئانەکەیدا ڕوونی کردووەتەوە و، پێغەمبەر ﷺ لەفەرموودەکانیدا ئاماژەی پێداوە .

٦- باوەڕهێنان بەقەزاو وقەدەر بەخێر و شەڕییەوە (**الإيمان بالقدر خيره وشره**): ئەمەشیان بەوە دەبێت مرۆڤ دان بنێت بەوەدا کە خوای پەروەردگار عالیم و زانایە

---

(١) بروانە : «شرح العقيدة الطحاوية» (١٦٧) .

بەئەندازەگیری هەموو شتەکان و کات و جێگەیان پێش ئەوەی بێنە بوون، دواتر لە لەوحولمەحفوزدا شتەکانی هەموو نووسی و تۆماری کرد، پاشان بەهێز و ویستی خۆی هێنایانیە بوون لەو کات و ساتەنەدا کەبۆی دانابوون .

هەموو ڕوداو و پێشهاتێك جا خێر بێت یاخود شەڕ سەرچاوەکەی ئەندازەگیری و ویست و ئیرادەی خوای پەروەردگارە، ئەوەی ویستی لەسەر بێت دێتە بوون ئەوەش ویستی لەسەر نەبێتە نایەت بوون و ڕوو نادات.

ئائەمەی باسکرا پوختەیەکە لەشەرحی ئەسڵ و بنەماکانی باوەڕ و ئیمان و دواتر - إن شاء الله - بەدوور و درێژی شەرحەکەی دێت .



## باوەڕهێنان بە
## سیفاتەکانی خودا بەبێ گۆڕینی مانا و لەکارخستن و چواندن

**وَمِنَ الإيمَانِ بِاللهِ: الإِيمَانُ بِمَا وَصَفَ بِهِ نَفْسَهُ فِي كِتَابِهِ الْعَزِيزِ، وَبِمَا وَصَفَهُ بِهِ رَسُولُهُ مُحَمَّدٌ ﷺ مِنْ غَيْرِ تَحْرِيفٍ وَلاَ تَعْطِيلٍ، وَمِنْ غَيْرِ تَكْيِيفٍ وَلاَ تَمْثِيلٍ.**

**هەروەها بەشێك لەئیمان هێنان بەخودا: ئیمان هێنانە بەو سیفاتانەی کە خودا وەسفی خۆی پێکردووە لەقورئاندا و هەروەها پێغەمبەرەکەی لەفەرموودەکانیدا بەبێ گۆڕینی ماناکەی و لەکارخستنی و، بەبێ چۆنیەتی بۆ دانان و چواندن.**

---

### شەرح

دوای ئەوەی نووسەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بەکورتی باسی ئەسڵ و بنەماکانی ئیمانی کرد کە پێویستە ئیمانی پێبهێندرێت دەستی کردە باسکردنی بەشێوەیەکی ڕوونتر و تەفاسیلەکانی، بەئەسڵی یەکەم دەستی پێکرد کە ئەویش: باوەڕهێنانە بەخوای پەروەردگار، باسی لەوە کرد کە بەشێك لەئیمان هێنان بەخودا ئیمان هێنانە بەسیفاتەکانی کە وەسفی خۆی پێکردووە لەقورئانەکەیدا، یاخود پێغەمبەرەکەی لەفەرموودەکانیدا، ئەوەش بەوە دەبێت ئیسپاتی ئەو سیفاتانەی بۆ بکەین، بەو شێوەیەیی کە لەقورئان و سوننەتدا هاتووە بەلەفز و مانایەوە بەبێ گۆڕینی لەفزەکانی(**من غير تحريف لألفاظها**)، هەروەها بەبێ لەکارخستنی ماناکانی (**ولا تعطيل لمعانيها**) هەروەها بەبێ چواندنی بەسیفەتی بەدیهێنراو و مەخلوقات (**ولا تشبيه لها بصفات المخلوقين**) . لەئیسپاتکردنیدا تەنها پشت ببەستین بەقورئان و سوننەت و تێیان نەپەڕێنین ؛ چونکە بەڕاستی ئەم بابەتە تەوقیفیە و جێگای ئیجتیهاد نییە .

**(والتحريف)** [1]: بریتییە لەگۆڕین و لادانی شتێك لەسەر هەقیقەتەکەی. دەوترێت : **(انحرف عن كذا إذا مال)**واتە: لەفڵانە شت لایدا کاتێ کە لەڕێدەرچوو و لار بووەوە ، **پاشان تەحریف دوو جۆرە:**

**جۆری یەکەم** : گۆڕینی لەفز **(تحريف اللفظ)** : کە ئەویش لادانیەتی لەشێوە و ڕووە هەقیقیەی خۆی بۆ ڕووی تر، جا یان بەزیادکردنی وشەیەك یاخود پیتێك یاخود بەکەمکردنەوەی یاخود بەگۆڕینی حەرەکەیەك، هاوشێوەی قسەی کەسانی گومڕا لەبارەی ئەم فەرمایشتەی خوداوە: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ﴾ [طه: ٥] : ئەوانە دەڵێن: وشەی جێگیربوون و بەرز و بڵندی**(اسْتَوَى)** بەمانای دەستبەسەراگرتن **(استولى)**دێت، جا لێرەدا پیتێکیان بۆ ئایەتەکە زیاد کردووە، هەروەها وەك قسەی هەندێکیان لەبارەی ئایەتی: ﴿وَجَآءَ رَبُّكَ﴾ [الفجر: ٢٢]،واتە: پەروەردگارت هات، ئەوان دەڵێن: واتە: فرمانی پەروەردگارت هات **(أَمْرُ ربك)**، لێرەشدا وشەیەکیان زیاد کرد، هەروەها وەك قسەی هەندێکیان لەبارەی ئایەتی: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمًا﴾ [النساء : ١٦٤]، واتە: خودا قسەو گفتوگۆی لەگەڵ موسادا کرد. کە ئەویش خوێندنەوەی وشەی **(اللهُ)** کەزەممەی لەسەرە بەنەصبی لەفزی جەلالە و بەم شێوەیە**(اللهَ)**! ، لێرەشدا حەرەکەی ئیعرابەکەیان لەحاڵەتی ڕەفعەوە گۆڕی بۆ حاڵەتی نەصب بەوەش ماناکەیان گۆڕی و لەبری ئەوەی بڵێن: خودا لەگەڵ موسادا گفتوگۆی کرد دەڵێن: موسا لەگەڵ خودادا گفتوگۆی کردا! .

**جۆری دووەم** : گۆڕینی مانا **(تحريف المعنى)** : کە ئەویش گۆڕینی مانایە و لادانیەتی لەهەقیقەتی خۆی و پێدانی مانایەکی ترە بەلەفزەکە، هاوشێوەی قسەی

---

(١) بروانە: «التنبيهات اللطيفة» للسعدي (٢٣) ، و «الإرشاد إلى صحيح الاعتقاد» (١٣٤) ، و «شرح العقيدة الواسطية» للهراس (٢٠) ، وغيرهم .

بیدعەچیەکان: کە دەڵێن مانای ڕەحمەت: ویستی خێر بوونە، ومانای غەزەب: ویستی تۆڵەسەندنەوەیە.

**(والتعطیل)** : لەڕووی زمانەوانیەوە واتە : بەتاڵ کردن و چۆڵکردن، دەوترێت : **(عطله أي أخلاه)**واتە: تەعتیلی کرد، واتە بەتاڵی کرد و چۆڵی کرد. لێرەدا مەبەست لێی: نەفی کردنی سیفاتە لە خودا (سبحانه وتعالی) . وجیاوازی نێوان **(التحریف والتعطیل)**: ئەوەیە **(التحریف)** نەفی کردنی مانا ڕاست و دروستەکەیە کە دەقەکە دەیگەنێت و دەیدات بەدەستەوە و، گۆڕینیەتی بەمانایەك کە ڕاست و دروست نییە. **(والتعطیل)** : نەفی کردنی مانا ڕاستەکەیە و لەکار خستنیەتی بێ ئەوەی مانایەکی تری پێبدرێت، هاوشێوەی ئەوەی موفەوزیەکان[1]دەیکەن، جا بۆیە هەموو موحەریفێك موعەتیلیە، بەڵام هەموو موعەتیلەیەك موحەریف نییە .

**(والتکییف)** : چۆنیەتی دانانە بۆ سیفەتەکان، دەوترێت: **(کیَّف الشيء إذا جعل له کیفیة معلومة)** واتە: چۆنیەتی بۆ شتەکە دانا کاتێ کەچۆنیەتیەکی دیاری کراوی بۆدانا، جا چۆنیەتی دانان بۆ سیفاتەکانی خودا بریتییە لە: دیاری کردن و دەستیشانکردنی چۆنیەتیەکەی و ئەو هەیئەت و شێوەی کە هەیەتی، ئەمەش گونجاو نییە بۆ مرۆڤ و لەتوانایدا نییە؛ چونکە مرۆڤ خودای نەبینیوە و هیچ ڕێگایەك و ئامرازێك نییە بۆ گەیشتن بەهەقیقەت و چۆنیەتی سیفاتەکانی خودا؛ لەبەر ئەوەی سیفەت تابعی زاتی (الله)یە (جل جلاله)، هەروەك چۆن مرۆڤ ناتوانێ پەی بەزاتی خودا و چۆنیەتیەکەی بەرێت، بەهەمان شێوە ناتوانێ پەی بەسیفاتەکانی بەرێت و چۆنیەتی بۆ دابنێت؛ هەربۆیە کاتێ پرسیار لەپێشەوا مالیك کرا : «**الرَّحْمَنُ عَلَى**

(١) **موفەوییزەکان:** ئەوانەن کە تەفویزی سیفاتەکانی خودا دەکەن و هیچ مانایەکی پێ نابەخشن بـۆ نموونە دەڵێن ئێمە نازانین مانای دەست و چاو چییە ، واتە: کاتێ خودا چاو و دەستی بۆ خـۆی ئیسپات کردووە ئەمان دەڵێن: ئێمە نازانین مانای دەست لێرەدا چییە و خـودا خـۆی دەزانێـت.. شایەنی باسـە ئەمـانەش دەبـنە چەنـد تـاقم و گـرووپێکەوە و هەمویـان یەك بۆچوونیـان نیـیە. (وەرگێڕ).

**الْعَرْشِ اسْتَوَى كيف استوى ؟ فقال : الاستواء معلوم، والكيف مجهول، والإيمان به واجب ، والسؤال عنه بدعة»**[1]، واتە: کاتێ دەڵێن: خودا لەسەر عەرش ئیستیوای کردووە و بەرز بۆتەوە ئەوە چۆن چۆنییە؟ گوتی: ئیستیوا و بەرز بوونەوەی خودا مەعلوم و ڕوونە، وچۆنیەتییەکەی مەجهول و نەزانراوە و، ئیمان بوون پێی واجبە و، پرسیارکردن لەبارەیەوە بیدعەیە و نادروستە.

ئەم قسەیەیی پێشەوا مالیك بۆ گشت سیفاتەکانی تری خودا ڕاستە، لەوەڵامی هەرکەسێك کە پرسیار لەبارەی چۆنیەتییانەوە بکات هەمان وەڵام دەدرێتەوە .

**(والتمثيل)** : بریتییە لەشوبهاندن و چواندن بەوەی بوترێت: سیفاتەکانی خودا وەك سیفاتی دروستکراو و بەدیهێنراوەکانە، وەك ئەوەی بوترێت: دەستی خودا وەکو دەستی ئێمە وایە، وگوێی وەك گوێی ئێمە وایە - پاك و بێگەردی بۆ خودا لەم قسە و قسەلۆکانە ـ خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ [الشورى:١١]، واتە: هیچ شتێک نیە لە وێنەی ئەو (خوا)یە، نە لە زاتیدا، نە لە سیفاتیدا، نە لە کرداریدا، بۆ خۆی تەنیایەو، لە هەموو شتێک، بێ نیازەو، هەموو شتێکیش نیازمەندە بەو ، ئەویشە بیسەری بینایە، بە ئاگایە بە وتەی بەندەکانی، بینایە بۆ کاروکرداریان .

بۆیە لەبارەی سیفاتەکانی خوداوە ناوترێت: وەك سیفاتەکانی ئێمەیە یاخود هاوشێوەی سیفاتی ئێمەیە، هەروەك چۆن ناوتێت زاتی خودا وەك زاتی ئێمەیە یاخود هاوشێوەی زاتی ئێمەیە، باوەڕداری موەحید سیفاتەکانی خودا هەموو ئیسپات دەکات بەوشێوەیەیی کەلایەق وشایستەی گەورەیی و عەزەمەتی خودایە، بەڵام کەسی موعەتیل نەفی دەکات یاخود نەفی هەندێکی دەکات و، کەسی موشەبیهەش ئیسپاتی

(١) أخرجه اللالكائي في «شرح أصول اعتقاد أهل السنة» (٦٦٤) ، والبيهقي في «الأسماء والصفات» (٤٠٨) ، وانظر : «مجموع الفتاوى» (٥ / ٢٨٢).

دەکات بەڵام چۆیەتی بۆدادەنێن بەشێوەیەک کە لایەق وشایستەی خودا نییە، بەڵکو شایستەی دروستکراو و بەدیهێنراوەکانە .



## هەڵوێستی ئەهلی سوننەت و جەماعەت سەبارەت بە باوەڕبوون بەسیفاتەکانی خودا(جل جلالە)

**بَلْ يُؤْمِنُونَ بِأَنَّ اللهَ ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ [الشورى:١١]، فَلاَ يَنْفُونَ عَنْهُ مَا وَصَفَ بِهِ نَفْسَهُ، وَلاَ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِه.**

**بەڵکو باوەڕیان وایە هیچ شتێك وەك خودا و هاوشێوەی خودا نییە وخودا بیسەر و بینایە و، نەفی ئەو سیفەتانە ناکەن لەخودا کە خۆی پێ وەسف کردووە، ماناو مەبەستی وشەکان ناگۆڕن ولاینادەن لەمانا هەقیقیەکەی.**

---

### شەرح

کاتێ کە نووسەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) باسی لەوەکرد کە: واجبە ئیمان هێنان بەسیفاتەکانی خودا ئەوانەی کە لەقورئان و سوننەتدا هاتوون بەبێ گۆڕین (**تحريف**)،ولەکارخستن (**تعطيل**)، و چۆنیەتی بۆدانان (**تكييف**)، و چواندن (**تمثيل**).

لێرەدا هەڵوێست و مەوقیفی ئەهلی سوننە و جەماعەی لەم بارەیەوە خستەڕوو، کە ئەویش ئەوەیە ئەهلی سوننە و جەماعە لەسەر مەنهەج و ڕێبازێکی هەق و ڕاستن و باوەڕیان بەو سیفاتانە هەیە، وەك خۆی ئیسپاتی دەکەن و لەگەڵیشیدا نەفی چۆنیەتییەکەی دەکەن، ئەوەش بەرمەبنای ئەم ئایەتە پیرۆزە کە دەفەرموێت: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ [الشورى:١١]، واتە: هیچ شتێك وەك خودا و هاوشێوەی خودا نییە و ئەو بیسەر و بینایە. جا فەرمایشتی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾ ڕەدد و وولامی موشەبیهە و مومەسیلەکانە ئەوانەی کە چۆنیەتی بۆ سیفاتەکانی خودا دادەنێن ودەیچوێنن بەسیفاتی دروستکراوەکان، وفەرمایشتی:

﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾، ڕەدد و وڵامە بۆ موعەتیلەکان ئەوانەی تەعتیلی سیفاتەکانی خودا دەکەن و لەکاری دەخەن ؛ چونکە ئەم ئایەتە ئیسپاتی گوێ و چاو بۆ خودا دەکات، ئا ئەم ئایەتە پیرۆزە یاسایەکی گشتگیر و ڕوون و بێخەوشە لەبابەتی ناو و سیفاتەکانی خودادا؛ چونکە دوو شتی پێکەوە هێناوە لەلایەك ئیسپاتی سیفاتی خودای تێدایە و لەلایەکی ترەوە نەفی چۆنیەتیەکەی کردووە، دواتر تەفسیر و لێکدانەوەی زیاتری بۆ دەکەین ـ إن شاء الله ـ .

بڕگەی: **(فلا ينفون عنه ما وصف به نفسه)** واتە : باوەڕبوونی ئەهلی و سوننەو جەماعە بەوەی هیچ کەس و شتێك وەك خودا و هاوشێوەی خودا نییە وایان لێناکات نەفی ئەو سیفاتانە بکەن کە خودا وەسفی خۆی پێکردووە، هاوشێوەی ئەوانەی کە زیادەڕۆییان کرد لە تەنزیهی خودا و بەپاك ڕاگرتنی بەشێوەیەك کە نەفی سیفاتەکانیان کرد و لەکاریانخست بەبیانووی ڕاکردن لە چواندن(**التمثيل**)ـی بەسیفاتی دروستکراوەکان.

ئەهلی سوننە دەڵێن: خوای پەروەردگار کۆمەڵە سیفاتێکی تایبەت بەخۆی هەیە ئەوانەی کە لایەق و شایستەی خۆین و، دروستکراوەکان(مخلوقات)یش بەهەمان شێوە کۆمەڵە سیفاتێکیان هەیە و تایبەتە بەخۆیان و هیچ لێکچوونێك لەنێوان سیفاتی دروستکار(خالیق) و دروستکراو(مەخلوق)دا نییە، ئیسپات کردنی ئەمەش ئەو ترسە ناخوازێت کە موعتیلەکان باسیان کردووە و بەهۆیەوە نەفی سیفاتەکانی خودای پێدەکەن .

ووتەی نووسەر کە دەڵێت : **(ولا يحرفون الكلم عن مواضعه)** پێشتر باسی مانای ماناگۆڕین (**التحريف**)مان کرد ، واتە : ئەهلی سوننە مانای کەلامەکەی خودا ناگۆڕن جا گۆڕینی لەفز بێت یاخود گۆڕینی ماناکەی بەشێوەیەك تەفسیری بکەن کە وەك خۆی نەبێت هاوشێوەی ئەوەی موعەتیلەکان دەیکەن لەگۆڕینی لەفزەکان وەک گۆڕینی جێگیربوون و بەرز و بڵند بووەوە (**اسْتَوَى**) بۆ : دەستی بەسەردا گرت

**(استولى)**، و ماناى : ﴿**وَجَاءَ رَبُّكَ**﴾ پەروەردگارت هات، بۆ : **(جاء أمر ربك)** فرمانى پەروەردگارت هات و، تەفسیری ڕەحمەتی خودا بۆ ویستی خێر پێ بوون، وهاوشێوەی ئەمانە .



**وَلاَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَاءِ اللهِ وآيَاتِهِ، وَلاَ يُكَيِّفُونَ وَلاَ يُمَثِّلُونَ صِفَاتِهِ بِصِفَاتِ خَلْقِهِ.**

**لەبابەتی ناو و سیفاتەکانی خودا و ئایەتەکانیدا لەهەق لا نادەن و چۆنیەتی بۆ دانانەن و سیفاتەکانی نایچوێنن بەسیفاتی دروستکراو و بەدیهێنراوەکانی.**

---

**شەرح**

**(ولا يلحدون في أسماء الله وآياته)** ئیلحاد: لەڕووی زمانەوانییەوە[1]:بەمانای لادان و لار بوونەوە دێت، هەر بۆیە بەشێوازی هەڵکەندنی گۆڕ کاتێ کە لەلاوە هەڵدەکەندرێت دەوترێت لەحد، وئیلحاد لەناوەکانی خودا و ئایەتەکانیدا : بریتییە لەلادانی هەقیقەت و مانا ڕاستەکەی لەمانایەکی دروستەوە بۆ مانایەکی باتڵ و نادروست .

✍ **وە ئیلحاد لەناو و سیفاتەکانی خودادا چەند جۆرێکە[2] :**

**جۆری یەکەم** : ناوی بت و پەرستراوە باتڵەکانی بنرێت خودا و پەرستراو،

---

(١) پێشەوا **(ابن القيم)**دەڵێت: (ئیلحاد لە ناوەکانی خـودادا، لادان و دوورکەوتـنەوەیە لەمانایـان و واقیع و ماناکانیان لە حەقیقەتی جێگیرکراوی ئەو مانایـانە؛ وە وشـەی **(ئیلحـاد)** لە**(میـل)**ـەوە کەبەمانای لادان دێت وەرگیراوە؛ هەروەک مادەی (ل ح د) دەلالەت دەکەنە سـەری، وە هەرلەم بابە وشەی **(اللحد)** هەیە، کە ئەو شتەیە لە لاتەنیشتی گۆڕدا شـەق دەکرێـت، کە لە ناوەڕاسـت لایداوە، وکەسی مولحید لە ئاییندا: ئەو کەسەیە کـە لە حەقـیقەت لادەدات..». انظـر : «بـدائع الفوائد» (٢ / ٢٨٥) .

(٢)بڕوانە: ما بين أنواع الإلحاد في «بدائع التفسير» لابن قيم الجوزية (٢ / ٣١٤) دار ابن الجوزي ، و «مفردات ألفاظ القرآن» للأصفهاني (٧٣٧) ، و «تيسير العزيز الحميد» (٦٤٥) ، و «الأسئلة والأجوبة الأصولية» للسلمان (٥١ ، ٥٢).

هاوشێوەی ناوی لات کە لە ئیلاهەوە وەرگیراوە، و عوزا لەعەزیزەوە، ومەنات لەمەننانەوە .

**جۆری دووەم** : ناوی خودا بنرێت بەچەند شتێك کە لایەق و شایستەی نەبێت هاوشێوەی نەسرانیەکانی کە ناویان ناوە باوك، وفەلاسیفەکان کاتێ ناوی خودایان ناوە (موجیب) یاخود (عیللەی فاعیله) .

**جۆری سێیەم** : وەسف کردنی خودا بەهەندێ سیفەت کە سیفەتی نەقص و ناتەواویە، هاوشێوەی جولەکە کە وەسفی خودایان دەکرد بەهەژار و دەیانگوت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ﴾ [آل عمران:١٨١]،واتە: خوا هەژارەو، ئێمە داراو دەوڵەمەندین. هەروەها دەیانگوت : ﴿يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ﴾ ، واتە:خوا دەستی زنجیرکراوەو بەستراوە. هەروەها دەیانگوت دوای ئەوەی خودا ئاسمانەکانی دروستکرد لەڕۆژی شەممەدا پشوویدا، تعالى الله عما يقولون .

**جۆری چوارەم** : نکۆڵی کردن لەمانا و هەقیقەتەکانی، هاوشێوەی قسەی جەهمییەکان کە دەیانگوت: ئایەتەکانی ناو و سیفاتەکانی خودا تەنها چەند لەفزێکن و هیچ جۆرە سیفەت و مانایەك لەخۆ ناگرن بۆ نموونە دەیانگوت وشەی بیسەر (**السميع**) دەلالەت لەبوونی گوێ (**سمع**)ناکات، و بینین (**البصير**) دەلالەت لەبوونی چاو(**بصر**)ناکات، و زیندو(**الحيّ**) دەلالەت ناکاتە سەر ژیان(**حياة**)، وهاوشێوەی ئەمانە .

**جۆری پێنجەم** : چواندنی سیفەتەکانی بەسیفەتی دروستکراوەکانی ؛ وەك قسەی مومەسیلەکان کە دەیانگوت: دەستی خودا وەك دەستی ئێمەیە، پەنا بەخوای پەروەردگار .

خوای پەروەردگار هەڕەشەی زۆر توندی لەو کەسانە کردووە کە ناو سیفاتەکان و ئایەتەکانی دەشێوێنن و مانا هەقیقیەکەی دەستکاری دەکەن و، فەرموویەتی : ﴿وَلِلَّهِ

ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَـٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ [الأعراف:١٨٠]، واتە: ناوەکانی خوا هەموو جوان و پڕشکۆن ، دەسا ئێوەیش هەر بەو ناوانەوە بانگی بکەن، لاڵەو نزاو داوا هەر بەوانە بکەن، لەوانە گەڕێن دەست وەردەدەن لە ناوەکانی خواو بەدەستی ئەنقەست دەیانگۆڕن، واتە: لە ماناو مەبەست لایان دەدەن، یان ناوی تری بۆ دادەنێن! بۆ نموونە: موشریکەکان لە بری ئەوە کەناوی (**الله**) بێنن، دەیانگوت (**لات**)، یان لە بری ئەوە بڵێن (**عزیز**) ئەیانوت: (**عزی**).. هتد. دڵنیابە ئەوانە بە تۆڵەی کردەوەی خۆیان دەگەن.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ ءَايَـٰتِنَا لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَآ ﴾ [فصلت:٤٠]، واتە: بێگومان ئەو کەسانە لە ئاستی ئایەتەکانی ئێمە کلا دەبن و هەق دەگۆڕن. واتە: لادەدەن و، تانەو توانجیان تێدەگرن، لە ئێمە ناشاررێنەوە.

وە بڕگەی : (**ولا يكيفون ولا يمثلون . . .** ) هتد و، پێشتر مانای چۆنیەتی دانان (**التكييف**) و چواندن (**التمثيل**)مان ڕوونکردەوە .

⁂

**لأَنَّهُ سُبْحَانَهُ: لاَ سَمِيَّ لَهُ، وَلاَ كُفْءَ لَهُ، وَلاَ نِدَّ لَهُ، ولاَ يُقَاسُ بِخَلْقِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى. فَإِنَّهُ أَعْلَمُ بِنَفْسِهِ وَبِغَيْرِهِ، وَأَصْدَقُ قِيلاً، وَأَحْسَنُ حَدِيثًا مِنْ خَلْقِهِ.**

**لەبەرئەوەی خودا هیچ هاوبەشێکی نییە لەناویدا، واتە: هیچ کەسێك نییە شایستەی ئەوە بێت هەمان ناوی خودایی لێبنرێت، هیچ کەسێك نییە هەمان پلەو و پایەیی ئەوی هەبێت و هاوشێوەی خودا بێت و بشوبهێت بەخودا، قیاسی خودا ناکرێتە سەر دروستکراوەکانی، بەڕاستی خودا زاناترە لەکەسانی تر بەخودی خۆی و زاناترە لەغەیری خۆی بەخودی خۆیان و ڕاستگۆترینە، وجوانترین و پاراوترین وتە و قسە و فەرمایشتی هەیە بەبەراورد بەدروستکراوەکانی.**

---

## شەرح

(**لأنه سبحانه: لا سَمِيَّ له**) ئەمە تەعلیل و ڕوونکردنەوەی هۆکاری قسەکەی پێشووە کە لەبارەی ئەهلی سوننەوە کردی و وگوتی : (**ولا يكيفون ولا يمثلون صفاته بصفات خلقه**).

(**سبحانه**) چاوگە هاوشێوەی وشەی(**غفران**) ولە(**التسبيح**)ـەوە وەرگیراوە و، بەمانای بەپاك ڕاگرتن دێت، و وشەی (**لا سمي له**) واتە : کەسێك نییە شیاوی ئەوە بێت ناوێکی لێ بنرێت هاوشێوەی ناوەکانی خودا، کاتێ خودا دەفەرموێت : ﴿هَلْ تَعْلَمُ لَهُۥ سَمِيًّا﴾ [مريم:٦٥] ،واتە:ئاخۆ ئاگات لێیە هاو ناوێکی هەبێ؟. ئەمە پرسیارە بەڵام ئامانج لێی نەفییە، واتە: هیچ کەسێك نییە هاوناوی خودا بێت یاخود هاوشێوەی بێت، (**ولا كفؤ له**) وشەی(**الكفؤ**) : بەمانای هاوشان و هاوشێوە دێت، واتە: هیچ هاوشان و هاوشێوەیەکی نییە، هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴾ [الإخلاص:٤] ،واتە: هەرگیز هیچ کەسێک

هاوشێوەو هاوتای نیەو، کەسێ ناتوانێ بەر هەڵستی بکات. **(ولا ند له)** وشەی**(الند)**، واتە: هاوشێوە و وهاوتا، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَندَادًا﴾ [البقرة:٢٢]، واتە: جا کەوابوو ئێوەش چاک بیپەرستن و، هیچ جۆرە هاوبەشێکی بۆ دامەنێن و، تەنها یاساو بەرنامەکەی ئەو وەرگرن .

**(ولا يقاس بخلقه)** وشەی**(القياس)**لەڕووی زمانەوانییەوە: بەمانای چواندن**(التمثيل)**دێت[1]واتە : خودا بەدروستکراوەکانی ناکات و ناچوێندرێت بەوان ـ خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿فَلَا تَضْرِبُوا لِلَّهِ الْأَمْثَالَ﴾ [النحل:٧٤] ، واتە:جا ئیتر ئێوە نموونەو شەریک بۆخوا مەهێننە ئاراوە، چونکە ئەو بێ شەریک و بێ وێنەیە.

خودا قیاس ناکرێت بەدروستکراوەکانی نەلە زاتیدا و، نەلە ناو و سیفاتەکانیدا، ونەلە کار و کردەوەکانیدا، چۆن بەدیهێنەرێکی کامڵ دەچوێندرێت بەبەدیهێنراوێکی ناتەواو ؟!- **تعالى الله عن ذلك** ـ.

**(فإنه سبحانه أعلم بنفسه وبغيره)** ئەمەش تەعلیل و ڕوونکردنەوەی هۆکاری ئەوەیە کە پێشتر باسکرا لەواجبی ئیسپاتکردنی ئەوەی خودا بۆ خۆی ئیسپات کردووە لەسیفاتەکان و ڕێگریکردنیشە لەشوبهاندنی خودا بەبەدیهێنراوەکانی، جا کاتێ خودا زاناتر بێت بەخۆی و زاناتر بێت لەکەسانی تر بەخودی خۆیان، ئەوکات واجب و پێویستە ئەو سیفاتانەی بۆ ئیسپاتبکرێت کە بۆ خۆی ئیسپات کردووە، هەروەها ئەوەش کە پێغەمبەرەکەی ﷺ بۆی ئیسپات کردووە .

دروستکراوەکان هیچ کامیان عیلم و زانیاری تەواویان بەخودا نییە و پەی بەزاتی خودا نابەن، خودا وەسف گەلێکی کامڵی هەیە کە ئەقڵی هیچ دروستکراوێك پەی پێنابات، بۆیە پێویستە لەسەرمان ڕازی بین بەوەی خودا خۆی ڕازی بووە پێی بۆ

---

(١) واتە : گەڕاندنەوەی شت بۆ هاوشێوەکەی ، «المعجم الوسيط» ، وانظر : «مجموع الفتاوى» (١٤ / ٤٤) .

خودی خۆی، چونکە بەڕاستی ئەو خۆی باشتر دەزانێت چ شتێك شایستەی و گونجاوە بۆی، ئێمە ئەو شتە نازانین و پەی پێنابەین.

خوای پەروەردگار: (**أصدق قيلاً، وأحسن حديثاً من خلقه**) ،واتە: ڕاستگوترینە، وجوانترین وتەی هەیە بەبەرواورد بەدروستکراوەکانی، جا ئەوەی هەواڵی لەبارەوە داوە ڕاست و هەقە و پێویستە لەسەرمان بەڕاستی بزانین و بەرهەڵستی نەکەین، ولەفزەکانی جوانترین لەفزن و پاراوترین و ڕەوانبێژترین و ڕوونترینن، بەڕاستی بەجوانترین شێوە ڕوونی کردووەتەوە چ ناو و سیفاتێك لایەق و گونجاون بۆی، بۆیە پێویستە ئەوە قەبوڵ بکەین و تەسلیم بین پێی .



## باوەڕبوون بەڕاستگۆیی هەموو پێغەمبەران

**ثُمَّ رُسُلُه صَادِقُونَ مُصَدَّقُون؛ بِخِلاَفِ الَّذِينَ يَقُولُونَ عَلَيْهِ مَا لاَ يَعْلَمُونَ.**

**پاشان پێغەمبەرانی ئەوانەی ڕاستگۆ و بەڕاستزانراون بەپێچەوانەی ئەوانەی کە قسەگەلێك لەبارەی خوداوە دەکەن کە نایزانن و زایاریان لەبارەیەوە نییە.**

شەرح

(**ثم رسله صادقون مصدوقون**)، ئەمە عەتفە لەسەر ئەم وتەیەیی : (**فإنه أعلم بنفسه ..إلخ**)، جا ڕاستی (**الصِّدق**) : موتابەقە وهاوتایی خەبەرە بۆ واقیع، واتە: ڕاستگۆن (**صادقون**) لەوەی هەواڵیان لەبارەی خوداوە داوە و، بەڕاستزانراون (**مُصدَّوقون**) : لەوەی کە بۆیان هاتووە لەنیگا(وەحی) لەڕێگای فریشتەکانەوە؛ لەبەر ئەوەی لەلای خوداوەیە، ئەوان لەلای خۆیانەوە و بەئارەزووی خۆیان هیچ ناڵێن لەبارەی خوداوە. ئەمە بەهێزکەری سەنەدی پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام)، ئەوان هەقیان پێوتراوە و گەیاندوویانە بەخەڵك، بۆیە پێویستە قەبوڵکردنی ئەوەی کە لەبارەی خوداوە گوتوویانە و وەسفیان کردووە و، ئەوان (**بخلاف الذين يقولون عليه ما لا يعلمون**) واتە : بەپێچەوانەی ئەوانەن کە شتانێك دەڵێن لەبارەی خودا و ناو سیفاتەکانیەوە بەبێ هیچ بەڵگەیەك، بەڵکو تەنها بەگوێرەی گومان و خەیاڵ ولێکدانەوەی خۆیان یاخود لەڕێگای ئەوەی کە شەیتانەکان پێیان ڕادەگەیەنن هاوشێوەی ساحیر و فاڵگرە درۆزنەکان و بیدعەچی و زندیقەکان[1]و کاهین و ئەستێرەناسان[1]وزاناخراپەکان،

(١) **زیندیقەکان:** ئەوانەن کە لەسەرەتای ئیسلام دا پێیان دەوترا (**مونافیق**) ولەنێو خەڵکدا دەژیان، وکاتێ هەلێکیان بۆ ڕێککەوتایە شەڕ و خراپەیان دەردەکەوت و دژی هەق و هەڵگرانی خۆی گیف دەکردەوە، هەروەك لەم سەردەمەشدا هەن و بوونیان هەیە.

هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢٢١﴾ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٢٢٢﴾ يُلْقُونَ ٱلسَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَٰذِبُونَ ﴾ ،[الشعراء:٢٢١ ، ٢٢٣] ، واتە: ئایا پێتان بڵێم شەیتانەکان بۆلای کێ دێن؟ ئەوان بۆلای پیاوێکی زۆر درۆزن و بوختانچیی و گوناهکار دادەبەزن، وەک خۆتان ئەیانناسن، نەک بۆلای موحەممەد ﷺ کە چەندە ڕاستگۆو دەستپاکە، گوێ لە فریشتە ڕادەگرن و، پاشان هەرچی دەبیستن دەیدەن بەگوێی فاڵچیی و دۆستەکانی خۆیاندا، بەڵام لە هەمانکاتدا زۆر بەشیان درۆزن و بۆ خۆشیان شتی کەی تێکەڵ دەکەن، کەواتە: ئێوە بڕوایان پێ مەکەن.

هەروەها فەرموویەتی : ﴿ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَٰبَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ﴾ [البقرة:٧٩] ،واتە: وەیل و سزای سەخت ، بۆ ئەوانەیە کە بەدەستی خۆیان تەورات دەنووسنەوە، پاشان دەڵێن: ئەمە لە لای خواوە هاتووە.

جا کاتێ کە خودا (جل جلاله) زاناتر بێت بەخۆی و جگە لەخۆی، وڕاستگۆترین بێت و، جوانترین وتەی هەیە بەبەراورد بەدروستکراوەکانی و، پێغەمبەرەکانی (علیهم الصلاة والسلام) ڕاستگۆبن لەهەموو ئەوەی هەواڵیان لەبارەوە داوە و، پەتی پەیوەندیان نێوان ئەوان و خودا ئەوەی کەوەحیان بۆ دێنێت فریشتە ڕاستگۆ و بەڕێزەکان بێت، ئەوا پێویستە پەنا بەرینە بەر ئەوەی خودا و پێغەمبەرەکەی فەرموویانە، بەتایبەت لەبابەتی ناو و سیفاتەکانی خودادا؛ جا نەفی بێت یاخود ئیسپات، وڕەتکردنەوەی ئەوەی بیدعەچیی و کەسە گومڕاکان دەیڵێن گوایە مەجاز لەناو و سیفاتەکانی خودادا هەیە و بەچەندان ڕێگا و بیانوو، وپشتیان کردووەتە ئەوەی کە

=

(١) **ئەستێرەناسان:** شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە دەڵێت: ئەستێرەناسی پشت بەستنە بە حاڵەتە گەردوونیەکان لەبارەی ڕووداوەکان کە لەسەر زەویدا ڕوو دەدەن و دێنە بوون. بڕوانە: فتح المجید (٣١٤)، ومجموع الفتاوی(٣٥/ ١٤١).

پێغەمبەران هێناویانە، بەپشت بەستن بەهەواو و ئارەزووی خۆیان یاخود لاساییکردنەوە و تەقلیدی کەسانێکی گومڕا دەکەن کە شیاوی لاساییکردنەوە و تەقلید کردن و پشت پێ بەستن نین.



وَلِهَذَا قَالَ: ﴿ سُبْحَـٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَـٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٨٢﴾ ﴾ [الصافات: ١٨٠، ١٨٢].

**هەربۆیە خوای پەروەرگار فەرموویەتی: (بەرزیی و بڵندیی، پاک و خاوێنی بۆ پەروەردگاری تۆ، پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات، لەو قسانە ئەوان پەسن و وەسفی ئەوی پێدەکەن، و سڵاوو درودیش بۆ سەر گشت پەیامبەران، و سوپاس و ستایشیی نەبڕاوەو هەتا هەتاییش هەر بۆ خودایە کە پەروەردگارو راهێنەری جیهانەکانە، چونکە ئەوە خاوەنی گشت نازو نیعمەتەکان).**

**فَسَبَّحَ نَفْسَهُ عَمَّا وَصَفَهُ بِهِ الْمُخَالِفُونَ لِلرُّسُلِ، وَسَلَّمَ عَلَى الْمُرْسَلِينَ؛ لِسَلاَمَةِ مَا قَالُوهُ مِنَ النَّقْصِ وَالْعَيْبِ.**

**پاک و بێگەردی خۆی بەیان کردووە لەبەرانبەر ئەو قسە و قسەلۆکەی کە نەیارانی پێغەمبەرانی لەبارەی خوداوە دەیانکرد، و سڵاوی کرد لەپێغەمبەران؛ لەبەر سەلامەتی قسەکانیان و دووری لەناتەواوی و عەیب.**

---

## شەرح

مانای وشە و موفرەدات:

**(ولهذا)** : تەعلیل و ڕوونکردنەوەی ئەوەی پێشووە لەوەی کەلامی خودا و وکەلامی پێغەمبەرەکەی ڕاسترین و جوانترینن .

﴿ سُبْحَـٰنَ ﴾ : ئیسمی مەصدەرە و لە **(التسبيح)**ـەوە وەرگیراوە کە بەمانای بەپاک ڕاگرتن و بەدوور گرتنی دێت لەهەر کەم و کورتی و ناتەواویەك .

﴿رَبِّكَ﴾ وشەی **(الرب)**، واتە : مالیك و دەسەڵاتدار و بەخێوکەری دروستکراوەکانیەتی بەنیعمەتەکانی.

﴿ٱلْعِزَّةِ﴾ : قوەت و سەرکەوتوو و نیعمەت بەخشە.

جا ئیزافە و دانەپاڵی وشەی (**الرب**) بۆلای(**العزة**) لەبابی ئیزافەی وەسفکراوە (**الموصوف**) بۆلای سیفەت (**الصفة**).

﴿ يَصِفُونَ ﴾ واتە : لەوەی کە دوژمنەکانی پێغەمبەرانی وەسفی دەکەن بەو شتانەی کە لایەقی خودا نییە .

﴿وَسَلَٰمٌ﴾ گوتراوە : لە(**السلام**)ـەوە هاتووە بەمانای سەلام کردن (**التحية**)دێت . وگوتراوە : لە دووری (**السلامة**) لە ناخۆشی و ناتەواوی (**المكاره**) هاتووە.

﴿عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ ئەوانەی کە خودا ناردنی بۆلای بەندەکانی، و پەیامی پەروەردگاریان گەیاند، و (**الْمُرْسَلِينَ**) جەمعی (**مرسل**)ـە، وپێشتر پێناسەمان کرد .

﴿رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾: جەمعی (**عالَم**)ـە و، جگە لەخودا هەموو شتێك دەگرێتەوە .

✍ **سوودەکانی ئەم ئایەتانە :**

١- بەپاک ڕاگرتنی خودا لەوەی کە کەسانی نەزان و گومڕا وەسفی خودای پێدەکەن ئەوەی کە شایستەی گەورەیی و مەزنی زاتی (الله) نییە.

٢- ڕاستگۆیی پێغەمبەران و واجبی وەرگرتنی ئەوەی کە هێناویەنە و هەواڵیان لەبارەی خوداوە داوە.

٣ - دروستیەتی سەلام کردن لەپێغەمبەران و ڕێز و حورمەت گرتنیان .

٤- ڕەتکردنەوەی هەموو ئەو شتانەی کەدژن بەوەی پێغەمبەران هێناویانە، بەتایبەت ئەوەی کە تایبەتە بەناو و سیفاتەکانی خودا .

٥- سوپاس و ستایش کردنی خوای پەروەردگار لەبەرانبەر ئەو نیعمەتانەی کە بەدرستکراوەکانی بەخشیووە بەتایبەت نیعمەتی یەکخواپەرستی(تەوحید ).

⁂

## مانای نەفی و ئیسپات

**وَهُوَ سُبْحَانَهُ قَدْ جَمَعَ فِيما وَصَفَ وَسَمَّى بِهِ نَفْسَهُ بينَ النَّفْيِ وَالإِثْبَاتِ.**

**فَلاَ عُدُولَ لأَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ عَمَّا جَاءَ بِهِ الْمُرْسَلُونَ؛ فَإِنَّهُ الصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ.**

**خوای پەروەردگار لەوشتانەی کەوەسفی خۆی پێکردووە و ناوی خۆی پێناوە دوو شتی پێکەوە هێناوە کە ئەوانیش نەفی و ئیسپاتن.**

**جا ئەهلی سوننە و جەماعە هیچ ئۆپشن و دەرچە و خیارێکیان لەبەردەست نییە جگە لەشوێنکەوتنی ئەوەی پێغەمبەران هێناویانە بەڕاستی هەر ئەوەش ڕێگای ڕاست و دروستە.**

### شەرح

**(وهو سبحانه قد جمع . . . إلخ)** ، ئەمە ڕوونکردنەوەی ئەو مەنهەج و ڕێبازەیە کە خودا لەقورئانەکەیدا نەخشەسازی بۆ کردووە بۆ ئیسپاتکردنی ناو و سیفاتەکانی و، ئەوە مەنهەج و ڕێبازێکە کە پێویستە باوەڕداران لەسەری بڕۆن و پەیڕەوی بکەن لەم بابەتە گرن و هەستیارەدا.

خوای پەروەردگار: **(قد جمع فيما وصف وسمى به نفسه)**دوو شتی پێکەوە هێناوە: ئەوەی وەسفی خۆی پێکردووە و ئەوەش کەناوی خۆی پێناوە، واتە: لەهەموو ناو و سیفاتەکانیدا. **(بين النفي والإثبات)** [1] کە بریتییە لەنەفی کردنی هەموو ئەو

(١) نەلە قورئان و نەلە فەرموودەکاندا نەفی کردنی ڕەها وموتڵەق نەهاتووە؛ چونکە نەفی ڕەها هیچ مەدحێکی تێدا نییە، بەڵکو مەبەست لەو نەفیەیی کە لەقورئان و وسونەتدا هاتووە ئیسپاتکردنی دژەکەیانە کە کامڵی و تەواوی لەخۆگرتووە: بۆنموونە نەفی هاوەڵ و هاوبەش؛ بۆ ئیسپاتکردنی =

عەیب و ناتەواویەیی کە پێچەوانە و دژی تەواوی و کامڵی خودان، وەك نەفی کردنی هاوبەش و هاوەڵ نوستن و خەوەنوچێ و مردن و هیلاك بوون.. هتد.

هەروەها هەرچی (**الإثبات**)یشە : بریتییە لەئیسپاتکردنی سیفاتی کامڵ و وەسفی جوان، هاوشێوەی ئەوەی لەم دوو ئایەتەدا هاتووە : ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُ ۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ [الحشر:٢٣،٢٤]، واتە: خوا (الله) هەر ئەوەیە -کە بێجگە لەو- هیچ پەرستراوێکی تر بە هەق نیە پاشاو فەرمانڕەوای هەموو بوونەوەرە، خاوەنی تەواوی ئیش و کارە، پاک و بێگەردەو بێخەوشە لە هەر سیفەتێکی ناشیرین ئاشتیدەرو دڵنیاکەرە، پەیامبەران و ئیماندارانی ئەمین کردووە لە سزای خۆی چاودێرو پارێزەری دروستکراوەکانیەتیی و هیچ شتێکی لێ وون نابێت دەسەڵاتدارو بە زەبرە خاوەن شکۆو مەزنە، هەموو هێزێک دەشکێنێ و، هیچ شتێک نیە بەرگەی بگرێت شایستەی هەموو کیبریایی و گەورەیی پاکیی و بێخەوشی بۆ ئەو خوایە لەوەی ئەوانە دەیکەن بە شەریک بۆی. هەر ئەوە پەرستراوو دروستکارو بەدیهێنەری بێ وێنە هەرئەوە وێنەکێش و دیمەن بەخش، بە هەر شێوەیەک خۆی بیەوێ نەخشەی دەکێشێ: جوان، ناشیرین، کورتە باڵا، کەڵەگەت، ڕەش پێست.. هتد. هەموو ناوە جوانەکان بۆ ئەون. زاناکان دەڵێن: ناوە پیرۆزەکانی خوا (**توقیف**)ین، واتە: دەبێ خوا هەر بەو ناوانەوە ناو ببرێ کە لە قورئان و سوننەتدا

---

= کـامڵی گەورەیـی و تـاك و تەنهـایی خـودایە لەسـیفاتە کامـڵ و تەواوەکانیـدا، ونەفـی کردنـی بێدەسەڵاتی (**العجز**)؛ بۆ ئیسپاتکردنی کامڵی هێز و توانای خودایە، ونەفـی جەهـل و نەزانـی؛ لەپێنـاو ئیسـپاتکردنی بەرفراوانـی و گشـتگیری عـیلم و زانیـاری خـودایە، ونەفـی کردنـی خەوەنوچکێ و خەو و مردن؛ لەپێناو ئیسپاتکردنی کـامڵی ژیـان و قەیـومیەتی خـودایە . .وبەم شێوەیە.

هاتوون، کەوابوو ناڕەوایە بە ئارەزووی خۆمان ناوێکی بۆ هەڵبژێرین، یان سیفەتێکی بۆ دابنێین، ئەو بەوە ناوی خۆی نەبردبێت، وەک: ئەندازیار، پزیشکی دڵەکان، هێز.. هتد! هەرچی لە ئاسمانەکان و، لە زەویدایە پاک و خاوێنیی و بێ خەوشی ئەو ئەڵێن و هەر ئەویشە خوای باڵا دەستی کارجوان و کارزان، هەموو شتێکی لە جێگای خۆیدایەو، زوڵم و ستەمیش لە کەس ناکات.

جگە لەمانەش لەوانەی کە نووسەر لەداهاتوودا چەند نموونەیەکیان بۆ دێنێتەوە .

هەروەها بڕگەی : (**فلا عدول لأهل السنة والجماعة عما جاء به المرسلون**) واتە : هیچ دەرچەیەکیان نییە، و لەوە لانادەن کە پێغەمبەران هێناویانە، بەڵکو شوێن پێیان هەڵدەگرن و، شوێنی ڕێنوێنی و نوورەکەیان دەکەون، لەوانە ئیسپاتکردنی سیفەتی کەماڵ بۆ خودا و بەپاکڕاگرتنی لەهەر شتێك کە شایستەی زاتی (الله) نییە چونکە بەڕاستی پێغەمبەران ئەو ئەسڵ و بنەما گەورەیەیان یەکلایی کردووەتەوە. هەرچی دوژمنانی پێغەمبەرانیشە ئەوان لەوە لایان داوە و لەڕاستەڕێی پێغەمبەران نەماون و توشی جۆرە هەڵدێر و لادان بوون .

هەروەها بڕگەی: (**فإنه الصراط المستقيم**) تەعلیل و ڕوونکردنەوەی هۆکاری ئەو قسەیەیەتی کە دەڵێت: (**فلا عدول لأهل السنة**) واتە: لەبەرئەوەی ئەو بەرنامەی کە پێغەمبەران هێناویانە هەر ئەوە ڕاستەڕێی ئیسلامەتی و هەق و ڕاستی و (**الصراط المستقيم**)ـە، و(**الصراط المستقيم**) : بریتیە لەو ڕێگا ڕێك و موعتەدیلەی کە ڕێچکەی لێنابێتەوە و دابەش نابێت بۆ چەند کوێرە ڕێیەك، هەر ئەوەش کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئەماژەی پێدراوە : ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾ [الفاتحة:٦] ، واتە:خوایە ڕێنماییمان بکە بۆ ڕێگەو ڕێبازە ڕاستەکەی خۆت کە ئایینی پیرۆزی ئیسلامەو شارەزامان بکە، وە هەر لەسەر ئەو ڕێیەش بەهەمیشەیی سەقامگیرو دامەزراومان بکە.

هەروەها ئایەتی : ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ﴾ [الأنعام:١٥٣] ، واتە:ئەم هێڵە ڕاستەیە بەرنامەو ڕێبازەکەی منە،

دەسا ئێوەیش ئەی ئیمانداران ! هەمیشە شوێنی بکەون و هەر بەودا بچن. ومەکەونە شوێنی ڕێچکەکانی تر، ئەوسا لە شا ڕێگەکەی خوا بترازێن و پەڕاگەندە ببن .

هەر ئەمەشە کە ڕۆژانە لەهەموو ڕکاتێکی نوێژەکانماندا دوو بارەی دەکەنەوە و داوا لەخودا دەکەین ڕێنوێنیمان بکات بۆی.



**صِرَاطُ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ والصَالِحِينَ.**

**ڕێگا و ڕێبازی ئەوانەی کە خودا نیعمەتی بەسەرا داباراندوون لەپێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان.**

## شەرح

واتە : ئەو ڕێگا ڕاستەی کە پێغەمبەران پێی هاتوون لەبیروباوەڕ و جگە لەویش، ئەهلی و جەماعە پەیڕەوی دەکەن وئەوەش (**صراط الذين أنعم الله عليهم**) واتە : ڕێگای ئەوانەی کە خودا نیعمەتی تەواوی پێ بەخشیون کە گرێدراوە بەخۆشبەختی هەتا هەتاییەوە، ئەوانەش ئەوانەن کە خودا فەرمانی پێکردووین داوای لێ بکەین ڕێنوێنیمان بکات بۆ ڕێگا و ڕێبازەکەیان.

✍ **ئەم چوار تاقمە ئەوانەن کە نیعمەتی تەواویان پێ بەخشراوە :**

١- پێغەمبەران (**النبيون**) : جەمعی(**نبي**)یە، ئەوانە ئەو کەسانەن کە خودا تایبەتی کردوون بەپەیامەکانی و گەیاندنی بەبەندەکانی و پێشتر پێناسەکەیمان کرد .

٢- ڕاستگۆیان (**الصديقون**) : جەمعی(**صديق**)ـە، کە ئەویش ئەو کەسەیە کە زیاد لەحەد ڕاستگۆیە و بەڕاستخەرەوەیە، واتە: زیاد لەحەد خۆی ملکەچی پێغەمبەرە ﷺ لەگەڵ بوونی ئیخلاسێکی تەواو لەگەڵ خودادا .

٣- شەهیدان (**الشهداء**) : جەمعی(**شهيد**)ـە، کە ئەویش ئەو کەسەیە کە لەپێناوی خودادا کوژراوە، ناوی نراوە شەهید؛ لەبەرئەوەی شایەتی بەهەشتی بۆ دراوە، هەروەها لەبەرئەوەی فریشتەی ڕەحمەت شایەت و ئامادەی بردنی ڕوحەکەی دەبێت.

٤- پیاوچاکان(**الصالحون**) : جەمعی(**صالح**)ـە، کە ئەویش ئەوکەسەیە کە مافەکانی خودا و بەندەکانی خودا بەجێ دێنێت .

جا وشەی (**الصراط**) هەندێ جار ئیزافە دەکرێتە لای خودا و دەدرێتە پاڵی وەك ئەم ئایەتە: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُ﴾ [الأنعام:١٥٣] ؛ واتە: ئەم هێڵە ڕاستەیە بەرنامەو ڕێبازەکەی منە، دەسا ئێوەیش ئەی ئیمانداران ! هەمیشە شوێنی بکەون و هەر بەودا بچن. چونکە خودا خۆی دایناوە و تەشریعی کردووە، هەندێ جار ئیزافەدەکرێت و دەدرێتە پاڵ بەندەکان، هەروەك لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ [الفاتحة:٧] ؛واتە:ڕێی ئەو کەسانەی کە نازو نیعمەت و بەخششی خۆتت بەسەردا رشتوون - لەپەیامبەران و، ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان-. لەبەر ئەوەی ئەوان گرتوویانە و پەیڕەوی دەکەن. ولەفەرمایشتی ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ ئاماژە و ئاگادارکردنەوەیەك بەدی دەکرێت بەهاوەڵ و هاودەنگ لەسەر ئەو ڕێگایە، کە ئەوانیش بریتین لەوانەی خودا نیعمەتی بەسەرا داباراندوون لەپێغەمبەران و، ڕاستگۆیان و، شەهیدان و، پیاوچاکان، لەپێناو ئەوەی مرۆڤ کاتێ ئەم ڕێگایە دەگرێتەبەر هەست بەتەنهایی و غەریبی و بێکەسی نەکات، بێگومان مرۆڤ هەست بەتەنهایی ناکات و دڵتەنگ نابێت کاتێ کە هەست بکات هاوەڵانی لەسەر ڕێگایەکە: پێغەمبەران و ڕاستگۆیان، و شەهیدان، و پیاوچاکانە .

**پاشان شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) چەند نموونەیەك لەقورئان و سوننەت دەخاتە ڕوو کە ئیسپاتکردنی ناو و سیفەتەکانی خودای لەخۆ گرتووە و لەم بەش و خاڵانەی خوارەوەدا خۆی دەبینێتەوە:**

# بەشی یەکەم
# بەڵگەی ناو و سیفاتەکانی خودا لە قورئان و سوننەتدا

## [١] جەمع کردن لەنێوان نەفی و ئیسپات لەوەسفکردنی خوای پەروەردگاردا:

وَقَدْ دَخَلَ فِي هذِهِ الْجُمْلَةِ مَا وَصَفَ اللهُ بِهِ نَفْسَهُ فِي سُورَةِ الإِخْلاَصِ الَّتِي تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ، حَيثُ يَقُولُ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝٣ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ۝٤﴾ [الإخلاص: ١، ٤]. وئەوەی کە پەیوەندی بەم بابەتەوە هەبێ ئەوەیە کە خوای پەروەردگار لەسورەتی ئیخلاصدا هێناویەتی لەوەی وەسفی خۆی پێکردووە ئەو سورەتەی کە مانا و مەبەستی سێیەکی قورئانی لەخۆ گرتووە هەروەك دەفەرموێت:

﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ ئەی موحەممەد! ﷺ بڵێ: ئەو پەروەردگارەی کە من دەیپەرستم، تاک و تەنیایەو، هاوەڵ و هاوبەشی نیە. ﴿ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ﴾ ئەو خوایە کە ناوی (الله)یە، جێگای هیواو ئومێدەو، بێ نیازیشە، هیچ کەسێکیش - بێ لەو- شیاوی ئەوە نییە گیروگرفتەکان ببرێنە لای بۆ چارەسەر، هەر ئەو زاتە گەورەیەشە، کە دەبێ هەر بۆلای ئەو بگەڕێینەوە . ﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ﴾ کەسی لێ نەبووەو، هیچ ڕۆڵەیەکی نیە - وەک جولەکەو گاورو بتپەرستەکان دەڵێن -، چونکە خوا زۆر بڵندو پاک و بێخەوش و دوورە لەو جۆرە بیرو بۆچوونانە و لە کەسیش نەبووەو بێ دایک و بابە، چونکە هەموو شتێکی لە دایک بوو تازەو نوێیەو، سەرەتایەکی هەیە، خۆ خوایش بێ سەرەتاو (ئەزەل)یە. ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ﴾ و هەرگیز هیچ کەسێک هاوشێوەو هاوتای نیەو، کەسێ ناتوانێ بەر هەڵستی بکات.

## شەرح

(وقد دخل في هذه الجملة) واتە : ئەوەی کە پێشتر باسکرا کە ئەویش وتەکەی بوو کە گوتی: (وهو سبحانه قد جمع فيما وصف وسمى به نفسه بين النفي والإثبات) ، جا لێرەدا دەیەوێ بەڵگەی قورئان و فەرموودە بێنێتەوە لەسەر ئەوە و، بەسورەتی ئیخلاص دەستی پێکرد؛ ئەوەش بۆ ڕێز و گەورەی ئەم سورەتە دەگەڕێتەوە، هۆکاری ناونانەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە تایبەتە بەسیفاتەکانی خودا، هەروەها لەبەرئەوەی خاوەنەکەی ڕزگار دەکات لەهاوەڵدانان بۆ خودا .

بڕگەی : (التي تعدل ثلث القرآن) واتە : وەك سێیەکی قورئانە ؛ ئەوەش لەبەرئەوەی قورئان سێ مانا و مەبەستی سەرەکی لەخۆگرتووە کە ئەوانیش تەوحید و چیرۆك و ئەحکامە، ئەم سورەتە سیفەتی(الرحمن)ـی لەگرتووە، وتایبەتە بە تەوحید بۆیە هاوشێوەی سێیەکی قورئانە، بەڵگەش لەسەر ئەوەی هاوشێوەی سێیەکی قورئانە ئەو فەرموودەیەیە کە پێشەوا بوخاری لەئەبو سەعیدی خودریەوە (خوا لێی ڕازی بێت) گێڕاویەتیەوە و دەڵێت: «أنَّه سمعَ رجلًا يقرأُ ﴿قل هوَ اللَّهُ أحدٌ﴾ يردِّدُها، فلمَّا أصبحَ غدا إلى رسولِ اللَّه صلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ فذكَرَ ذلكَ لَهُ، وكانَ الرَّجلَ يتقالُّها فقالَ رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ: والَّذي نفسي بيدِهِ إنَّها لتعدلُ ثلثَ القرآنِ»[١] ، واتە : پیاوێک گوێی لەپیاوێک بوو ﴿قل هو الله أحد﴾ دەخوێند و دوو بارەی دەکردەوە ، دوای ئەوەی بەیانی بەسەردا هات، ئەو پیاوە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بۆ باس کرد ، وەک ئەوەی ئەوپیاوە ـ واتە : ئەوپیاوەی کە گوێی لەپیاوەکە بوو(قل هو الله أحد) دەخوێند و دوو بارەی دەکردەوە ـ ئەوەی بەکەم دەزانی! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوێند بێ بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە خوێندنی سورەتی ئیخلاس

---

(١) رواه البخاري، كتاب الفضائل، باب: فضل ﴿قل هو الله أحد﴾برقم(٥٠١٣).

خێری یەک لەسەرسێی قورئانی هەیە. پێشەوا ئیبنولقەیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: ئەو فەرموودانەی کە لەبارەی ئەوەوە هاتوون گوایە بەئەندازەی سێیەکی قورئانە ئەوەندە زۆرن دەگەنە حەدی موتەواتیر[١].

(حيث يقول) هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قُلْ﴾ واتە : ئەی موحەممەد بڵێ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قورئان کەلامی خودایە، خۆ ئەگەر کەلامی موحەممەد یاخود کەسێکی تر بوایە نەیدەفەرموو: ﴿قُلْ﴾ ، و﴿هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ ، واتە : تەنهایە و هیچ هاوەڵ و وەزیر و هاوبەش و هاوشێوەیەکی نییە.

﴿ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ﴾ واتە :سەید و مەزنێك کە هەموو جۆرە گەورەیی و ڕێز، وعەزەمەتێکی تێدا کۆبۆتەوە، هەموو جۆرە سیفەتێکی کەماڵی تێدایە، زاتێکە هەموو دروستکراوەکان ڕووی تێدەکەن و داوای پێداویستی و شتەگرنگەکانی ژیانیانی لێدەکەن . ﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ﴾ واتە: نەمنداڵی هەیە و نەباوك، ئەمەش وەڵامی نەسرانیەکان، وئەو هاوبەشدانەرەی عەرەبیشە کە منداڵیان دەدایە پاڵ خودا!. ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ﴾ واتە: هیچ هاوشان و هاوشێوەیەکی نییە و کەس نییە لەئاستی ئەودا بێت.

✍ **ئەوەی شاهید حاڵ بێت لەم سورەتەدا :**

ئەم سورەتە هەریەك لەنەفی و ئیسپاتی لەخۆگرتووە، هەرچی فەرمایشتی : ﴿ٱللَّهُ أَحَدٌ ، ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ﴾ئیسپاتە، وفەرمایشتی﴿ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ، وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ﴾نەفییە .

---

(١) بدائع التفسير لابن القيم (٥/ ٣٦٨).

## ئەوەی خودا (جل جلاله)
## وەسفی خودی خۆی پێکردووە لە(آية الكرسي)ـدا.

وَمَا وَصَفَ بِهِ نَفْسَهُ فِي أَعْظَمِ آيَةٍ فِي كِتَابِهِ؛ حَيْثُ يَقُولُ: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ ۚ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ۚ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَىْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ ۚ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا ۚ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ ﴾ [البقرة: ٢٥٥]. ولهذا كان مَن قرأ هذه الآية في ليلة لم يَزل عليه مِن الله حافظ ، ولا يَقربُه شيطان حتى يُصبح .

ئەوەی کەوەسفی خۆی پێکردووە لەگەورەترین ئایەتی قورئانەکەیدا هەروەك فەرموویەتی: (الله) کە بێ وێنەو بێ هاوتایەو خاوەنی هەموو سیفاتی کاملّە، جگە لەو هیچ پەرستراوێکی تری ڕاستەقینە نیە، هەر ئەوە هەمیشە زیندووی ڕاستەقینەو، ڕاگیرکاری بوونەوەرو بەڕێوەبەری کاروباری دروستکراوەکانی خۆیەتی و ڕاوەستاوە بەزاتی خۆیەوە ، نەخەوە نووچکە دای ئەگرێ و، نەخەو دەیباتەوە، هەرچی هەبێ لە ئاسمانەکان و لە زەوییدا هەرموڵکی ئەوە کێ بێت- لە ڕۆژی دواییدا- بتوانێ شەفاعەت بکات لای ئەو، هەتا ئەوخۆی مۆڵەتی نەدا، دیارە کە هەتا ئەوخۆی مۆڵەت نەدات ، هیچ کەسێک ناتوانێ تکا بکات، هاوبەشدانەرەکان پێیان وابوو کە: بتەکان دەتوانن شەفاعەتیان بۆ بکەن بۆیە ئەیانوت: ئەوەی ئێستا لەبەردەستیانایەو دیارە، ئەوەیش کە لەپاش سەریانەوەیەو نادیارە، ئەو پێی بە ئاگایە، واتە: کاروباری دونیاو قیامەتیان تەنها هەر ئەو ئەیزانێ هیچ کەسیش ناتوانێ بەپلەی زانینی خوادا بگات، مەگەر خوا خۆی بیەوێ، کە لەسەر زمانی پەیامبەران شتێکیان بۆ ڕوون بکاتەوەو ئاگاداریان بکا، کورسیی خوای گەورە تەواوی ئاسمانەکان و زەویی داگرتووە. (کورسیی) لای زمانەوانەکان «أهل اللغة» بە واتای: تەختی پاشایەتی هاتووە، بەڵام

**ئەو کورسییەی کە خوا بۆ خۆی قایەل دەبێ و دەفەرموێ: [ وسع كرسيه ] مەبەست جێ پێی پەروەردگار خۆیەتی-جل جلاله-، وە ڕاگرتن و پاراستنی ئاسمانەکان و زەویی بۆخوا گران و سەخت نییە و هەر ئەو بڵندو پایە بەرزو گەورەیە، لەدەسەڵات و تواناادا هاوشانی نیە.**

**هەربۆیە هەرکەسێك شەوان ئەم ئایەتە بخوێنێت بەردەوام پارێزەرێك لەلایەن خوداوە دەیپارێزێت و، شەیتان نزیکی ناکەوێتەوە تاوەکو بەیانی بەسەردا دێت.**

---

## شەرح

(**وما وصف الله به نفسه في أعظم آية في كتابه**)واتە: ئەوەی وەسفی زاتی بەڕێزی خۆی پێکردووە لەگەورەترین ئایەتدا، و ئایەت (**الآية**) لەڕووی زمانەوانیەوە واتە : عەلامەت و نیشانە و، لێرەدا مەبەست لێی: کۆمەڵە وشەیەکی قورئانە کە جودایە لەئایەتەکانی تر و فاسیلە لەنێوانیاندا هاتووە، ئەم ئایەتەی کە نووسەر هێناویەتی پێی دەوترێت : (**آية الكرسي**) ؛ لەبەر ئەوەی ناوی کورسی تێدا هاتووە .

بەڵگەی ئەوەی گەورەترین ئایەتە لەقورئاندا ئەو فەرموودە صەحیحەیە کە پێشەوا موسلیم[1] لەئوبەی کوڕی کەعبەوە (خوا لێی ڕازی بێت) گێڕاویەتیەوە و دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لێی پرسی **«يَا أَبَا المُنْذِرِ، أَتَدْرِي أَيُّ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ الله مَعَكَ أَعْظَمُ؟»**. **قَالَ: قُلْتُ: اللهُ وَرَسُوْلُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: «يَا أَبَا المُنْذِرِ أَتَدْرِي أَيُّ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ الله مَعَكَ أَعْظَمُ؟». قَالَ: قُلْتُ: ﴿اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾. قَالَ فَضَرَبَ فِي صَدْرِي وَقَالَ: «وَاللَّهِ لِيَهْنِكَ العِلْمُ أَبَا المُنْذِرِ»** ،واتە: ئەی باوکی مونزیر ئایا تۆ دەزانیت چ ئایەتێك لە قورئانەکەی خوادا گەورەترینە؟ فەرمووی: وتم: خوا و پێغەمبەرەکەی

---

(١) رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٨١٠).

ﷺ زاناترن، فەرموی ئەی باوکی مُنْذِر ئایا تۆ دەزانیت چ ئایەتێك لە قورئانەکەی خوادا گەورەترینە؟ فەرموی: وتم ئەم ئایەتە گەورەترینە: [**اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ**]، فەرموی: پێغەبەری خوا ﷺ کێشای بە سنگمدا و فەرمووی: سوێند بە خوای گەورە عیلم و زانست مزگێنیت ئەدەنێ ئەی باوکی مونزیر.

جا ئەم ئایەتە موبارەکە گەورەترین ئایەتی قورئانی پیرۆزە، لەبەرئەوەی باسی گەورەیی خوای پەروەردگار و باسی ناو و سیفاتەکانی خوای گەورەی تێدایە و پاك ڕاگرتنی خودای تێدایە لەهەر شتێك کە شایستە و گونجاو نەبێت لەگەڵ زاتی (اللە)دا.

فەرمایشتی : ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ واتە: هیچ پەرستراوێك بەهەق نییە جگە لە اللە تعالی، جگە لەو بەندایەتی بۆ هەرکەسێك بکرێت ئەوا باتڵ و ناهەقیە. ﴿ٱلْحَيُّ﴾ واتە: دایم و باقی ئەوەی کە ژیانی بەردەوام و کامڵی هەیە و بەهیچ شێوەیەك مردن و لەناوچوونی بەسەردا نایەت . ﴿ٱلْقَيُّومُ﴾ واتە : ئەوەی بەخودی خۆی هەیە و هیچ کەسێك نەبووەتە هۆکاری بوونی و، بەدیهێنەری جگە لەخۆیەتی و هەڵسوڕێنەری کار و بارەکانیانە، ئەو بێ پێویستە لەبەدیهێنراوەکانی، ئەوان پێویستیان پێیەتی، لەفەرموودەیەکدا هاتووە کە ﴿ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ﴾گەرورەتین ناوە[1] ئەو ناوەی کە گەر پێی بپاڕێتەوە لەخودا وەڵامت دەداتەوە و، گەر پێی داوا بکرێت دەیبەخشێت؛ لەبەرئەوەی وشەی﴿ ٱلْحَيُّ ﴾دەلالەت دەکاتە سەر سیفاتی زاتی، و﴿ٱلْقَيُّومُ﴾دەلالەت دەکاتە

---

(١) حسن: أخرجه أبو داود (١٤٩٦)، والترمذي (٣٤٧٨)، وأحمد (٢٨١٦٣) عن أسماء بنت يزيد رضي الله عنها، وحسّن إسناده الشيخ الألباني.

سەر سیفاتی فیعلی، سیفاتەکان هەموو سەرچاوەیان ئەم ناوە بەرز و پیرۆزەیە[١]، ولەبەر کامڵی و تەواوی قەیومییەتیەت: ﴿لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ﴾ وشەی(السنة)، واتە: خەوەنوچێ(النعاس)، کە بریتییە لەخەوێکی سوك کە تەنها چاو دەنوێت ودڵ بەخەبەرە، و نوستن (**النوم**) بەهزێترە لە خەوەنوچێ (**السنة**)، نوستن برای مردنە، چونکە دڵیش لەگەڵ چاودا دەنوێت ﴿لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ﴾واتە: هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدایە موڵکی خودایە و خودا بەدیهێناون و هەموویان بەندەی خودان، وخودا خاوەنی جیهانی سەرەوە و خوارەوەشە .

﴿مَن ذَا ٱلَّذِي﴾ واتە : هیچ کەسێك نییە ﴿يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ﴾ شەفاعەت و تکا بکات لای خودا، جا وشەی تکا (**الشفاعة**) : لە جووت (**الشفع**)ـەوە وەرگیراوە، کە ئەویش پێچەوانەی تاکە (**الوتر**)، جا کەسی شافیع و تکاکار تکا و شەفاعەتی خۆی لەگەڵ تکا و شەفاعەتی غەیری خۆیدا جووت دەکات و دەبێتە شەفع و جوووت دوای ئەوەی کە تاك و ویتر بوو، وشەفاعەتیش: تکا کردن و داوا کردنی خێرە بۆ کەسانی تر، بەومانایەیی: کەسێکی باوەڕدار داوا لەپەروەردگاری بکات لەتاوانی و سەرپێچییەکانی هەندێ لەباوەڕداران ببوورێت، بەڵام شەفاعەت موڵکی خودایە و ناکرێت ﴿إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ﴾ ، واتە : جگە بەفەرمان و ڕێپێدانی خۆی نەبێت، ئەوەش لەبەر گەورەیی و کبریائی زاتی الله (تبارك وتعالى)، هیچ کەسێك توانای شەفاعەت و تکای نییە دوای ئەوە نەبێت کە خودا ڕێگای دەدات .

﴿يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ﴾ واتە : زانست و عیلمی خودا دەورەی هەرچی کار و باری ڕابردوو و داهاتووشی داوە، هیچ شتێك لەوانە شاراوە نییە لای .

---

(١) پێشەوا **ئیبنولقەیم** (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە ڕۆژێك پێی گوتم: ئەم دوو ناوە بەڕێزە - کە (**الحي والقيوم**)ـە کاریگەریەکی گەورەیان لەسەر ژیانی مرۆڤ هەیە. تهذیب مدارج السالکین (١/ ٣٨٨).

﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ﴾ واته : بەندەکان هیچ شتێك لەبارەی عیلم و زانستی خوداوە نازانن مەگەر ئەوە نەبێت کە خودا لەڕێگای پێغەمبەرانی فێری کردوون و پێی ئاشنا کردوون و بەچەندان ڕێگا و هۆکاری جودا . ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ کورسی خودا وتراوە: عەرشە، و جگە لەوەش وتراوە، وبۆچوونێك هەیە دەڵێت: شوێنی پێی خودای پەروەردگارە[1] ، ئەو کورسیە هێندە گەورەیە گەورەییەکەی بەئەندازەی ئاسامانەکان و زەوی دەبێت.

﴿وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا﴾ ، واته: پاراستنی زەوی و ئاسمانەکان و ئەوەش تێیدایەتی هیچ بارگرانی و نارەحەتییەك بۆ خودا درووست ناکات، ئەوەش بەهۆی کامڵی و تەواوی قوەت و هێز و توانای خوای تەعالا .

﴿وَهُوَ ٱلْعَلِيُّ﴾ واته: خودا بەرزی و بڵندی و پایەبەرزی ڕەهای هەیە، لەبەر ئەوەی لەسەرووی هەموو مەخلوقاتەوەیە و﴿عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ﴾ [ طه :٥ ] ،واته: بەسەر عەرشدا بەرز و بڵند بۆتەوە. وخودا بەرز و بڵندە لەپلەو پایەدا و هەموو جۆرە سیفەتێکی کامڵی و جوانی تێدا کۆبووەتەوە، بەرزە لەهێز و تواناداا، دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە و هەڵسوڕێنەری هەموو شتێکە و هیچ شتێك نییە ڕێگر بێت لێی

﴿ٱلْعَظِيمُ﴾ ئەوەی کە هەموو سیفەتێکی گەورەیی و عەزەمەتی تێدایە، گەورەیی ڕەها و کامڵی هەیە، بەگەورەدانراوە لای پێغەمبەرانی و فریشتەکانی و بەندە باوەڕدارەکانی، جا ئایەتێك ئەم هەموو مانایەیی لەخۆ گرتبێت بێگومان شیاوی ئەوەیە

(١) صحيح موقوف: ئیبن عەباس دەفەرموێت: «الْكُرْسِيُّ: مَوْضِعُ الْقَدَمَيْنِ، والْعَرْشُ لا يَقْدُرُ قَدْرَهُ إلاَّ اللهُ عَزَوجَلّ» رواه الحاكم في المستدرك (٢/ ٢٨٢)، وقال إنه على شرط الشيخين، وقد روي مرفوعا، والصواب أنه موقوف عن إبن عباس. واته: کورسی جێ پێی پەروەردگارە، وە عەرشیش ئەندازەکەی بێجگە لەخودا کەس نایزانێ.

گەورەترین ئایەت بێت لەقورئاندا و، خوێنەرەکەی لەشەڕ و خراپە و شەیتانەکان بپارزێت.

✍ **ئەوەی تێبینی دەکرێت:**

لەم ئایەتەدا خوای پەروەردگار وەسفی خودی خۆی کردووە و هەریەك لە نەفی و ئیسپاتی پێکەوە هێناوە، لەلایەك ئیسپاتی سیفەتی کامڵی و تەواوی تێدایە و لەلایەکی ترەوە نەفی نەقص و ناتەواوی لەخۆی گرتووە، لەفەرمایشتی : ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ نەفی ئولوهییەت کراوە لەهەرچی خەڵکە و لەگەڵیشیدا ئیسپاتی ئولوهیەتی تێدایە بۆ الله. ولەفەرمایشتی ﴿ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ ﴾ ئیسپاتی ژیان و قەیومیەت و بێنیازی خودای تێدایە لەخەڵك و هەموو بوونەوەر، ولەفەرمایشتی : ﴿لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ﴾ نەفی خەوەنوچکێ و نوستن کراوە لەخودا، ولەفەرمایشتی: ﴿لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ ﴾ ئیسپاتی موڵکداری کامڵ و تەواوی تێدایە بۆ الله، ولەفەرمایشتی: ﴿مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ ﴾ نەفی تکا و شەفاعەتی لەخۆگرتووە مەگەر بەئیزن و ڕێپێدانی الله نەبێت ؛ ئەوەش لەبەر کامڵی لەگەورەی وعەزەمەت و بێ پێویستی لەدروستکراوەکانی، ولەفەرمایشتی: ﴿يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ ﴾ ئیسپاتی کامڵی عیلم و زانستی خودای لەخۆگرتووە جا ڕابردوو بێت و ڕووی دابێت یاخود داهاتوو بێت وهێشتا نەهاتبێتە بوون، ولەفەرمایشتی : ﴿ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ ﴾ڕوونکردنەوەی پێویستی خەڵك بەخودای لەخۆگرتووە، هەروەها ئیسپاتی بێ پێویستی خودا لەوان، ولەفەرمایشتی : ﴿وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ﴾ ئیسپاتی کورسی وکامڵی گەورەیی وڕێزداری لەخۆ گرتووە، لەگەڵ بچووکی و بێدەسەڵاتی دروستکراوەکان لەئاستی زاتی ئەودا،

ولەفەرمایشتی: ﴿وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ﴾ نەفی لاوازی و بێتوانایی و بێدەسەڵاتی و ماندوو بوونی کردووە لەزاتی (الله)، ولەفەرمایشتی: ﴿وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ﴾ ئیسپاتکردنی بەرزی و گەورەیی خودای تێدایە .

ووتەی نووسەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کە دەڵێت : **(ولهذا كان من قرأ هذه الآية في ليلة لم يزل عليه من الله حافظ ولا يقربه شيطان حتى يصبح)** ئاماژەیە بەوەی پێشەوا بوخاری لەسەحیحەکەیدا[1] لەئەبوهورەیرەوە (خوا لێی ڕازی بێت) گێڕاویەتیەوە وتێیدا هاتووە: «**إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ فَاقْرَأْ آيَةَ الكُرْسِيِّ،﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ال ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ ﴾ لَنْ يَزَالَ عَلَيْكَ مِنَ اللَّهِ حَافِظٌ، وَلاَ يَقْرَبُكَ شَيْطَانٌ حَتَّى تُصْبِحَ**».

واتە: ئەگەر چویتە سەر جێگاکەت (آيَةَ الكرْسِيِ) بخوێنە و تەواوی بکە، چونکە پارێزەرێکت لە لایەن خواوە لەگەڵدا دەبێت و شەیتان نزیکت نابێتەوە تا بەیانی.

جا وشەی شەیتان بۆ هەموو کەسێکی یاخی و لەفەرمانی دەرچوو بەکار دێت لەجن و مرۆڤ، ولە(شطن)ـەوە هاتووە کەبەمانای دوورکەوتنەوە دێت و بۆیە ناوی نراوە شەیتان چونکە دوورە لەڕەحمەت و بەزەیی خودا .

---

(١) في باب (صفة إبليس وجنوده) (٦ / ٤٠٤) معلقا ، ووصله النسائي في «عمل اليوم والليلة» (٩٥٩) وغيرهما ، انظر : «فتح الباري» (٤/٦١٤) .

## [٢] جەمع کردن لەنێوان بەرزی و بڵندی ونزیکی و ئەزەلی و ئەبەدییەت وهەتا هەتایی زاتی (الله)

فەرمایشتی : ﴿هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ٣﴾ [الحديد: ٣] ، **واتە: هەر ئەویشە یەکەم کە هیچ شتێک لە پێشیەوە نیە، دواهەمینیش هەر ئەوە کە هیچ لە پاشیەوە نیە، و بوونی ئاشکرا بە بەڵگەکانی هەر ئەوە، واتە: لە ژوور ئەوەوە ئاشکراتر نیە، وە پەنهان بە هەقیقەت و کونهی لە دروستکراوەکانی ئەوە، کە لەو پەنهانتر نیە، هەر ئەویش زانایە بە هەموو شتێک (لە گەردیلەیەکەوە تا وردتر) ئاگاداریەتیی.**

### شەرح

فەرمایشتی : ﴿هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ ..﴾ پێغەمبەر ﷺ لەو فەرموودەیەکدا کە پێشەوا موسلیم گێڕاویەتیەوە[١] تەفسیری ئەم ئایەتەی کردووە و فەرموویەتی: «**اللّهُمَّ أَنْتَ الأَوَّلُ فليسَ قَبْلَكَ شيءٌ، وَأَنْتَ الآخِرُ فليسَ بَعْدَكَ شيءٌ، وَأَنْتَ الظّاهِرُ فليسَ فَوْقَكَ شيءٌ، وَأَنْتَ البَاطِنُ فليسَ دُونَكَ شيءٌ، اقْضِ عَنَّا الدَّيْنَ وَأَغْنِنَا مِنَ الفَقْرِ..**» واتە: خوایە هەر تۆ یەکەمینیت و هیچ شتێکت لە پێشتەوە نییەو، هەر تۆیش دواهەمینیت و هیچ شتێک لە پاش تۆوە نییە، هەر تۆ باڵادەستیت، هیچ شتێک لەسەرووی تۆوە نییە، هەر تۆ پەنهان و ئاگاداری نهێنیەکانی خەڵکیت، هیچ لەتۆ شاراوە نییە، قەرز و قۆڵەمان لەسەر لابەرەو، لە دەست هەژاری ڕزگارمان بکە.

---

(١) صحيح مسلم، كتاب الذكر والدعاء والتوبة والاستغفار، باب ما يقول عند النوم وأخذ المضجع، حديث: (٢٧١٣).

جا پێغەمبەر ﷺ تەفسیری ئەم چوار ناوەی زۆر بەکورتی و ڕوونی کردووە، لەم ناوانەدا پەیبردنی خودا هەیە بەهەموو شتێك، بۆنموونە لەناوی(**الأول والآخر**) پەیبردن ( ئیحاتە)ی زەمانی هەیە، ولەناوی(**الظاهر والباطن**) پەیبردن (ئیحاتە)ی جێگا و مەکان هەیە .

پێشەوا **ئیبنولقەیم**(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: (ئەم چوار ناوە بەرانبەرن: دوو ناوی ئەزەلی هەتا هەتاییە ودوو ناوی بۆ بەرزی ونزیکیەتیە جا لەپێش بوونی خودا لەپێشەوەی هەموو شتەکانی ترە جگە لەخۆی و، مانەوە و ئەزەلیەتی خودا جێگیرە و هەرگیز کۆتایی نایەت و دوای هەموو شتەکان و لەناوچوونی بەسەر نایەت، جا لەپێشینەیی خودا: هەبوونیەتی پێش هەموو شتێك و، دوایەمینیەتیشی: مانەوەیەتی دوای هەموو شتێك و، زاهیریەتیشی: بەرزی و علویەتی بەسەر هەموو شتێکدا، مانای دیار(**الظهور**) وا دەخوازێت بەرز (**العلو**)بێت، زاهیری شتێك: ئەوەیە کە لەسەرەوەیەتی و، باتنیەتی خودا: پەیبردنیەتی بەهەموو شتێك و نزیك بوونە لێی بەشێوەیەك لەخودی شتەکە بۆ شتەکە نزیکترە، ئا ئەوا نزیکی پەیبردنی گشتگیرە)[1].

فەرمایشتی : ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ واتە : زانستی خودا دەوری هەموو شتێکی داوە جا ئەو شتە شتی ڕابردوو بێت یاخود ئێستا و داهاتوو، لەجیهانی سەرەوە بێت یاخود جیهانی خوارەوە، دیار و ئاشکرا بێت یاخود شاراوە و نادیار هیچ شتێك لەخودا ون و نادیار نیە تەنانەت بەئەندازەی گەردیلەیەك لەئاسمانەکان و زەویدا .

**ئەوەی تێبینی دەکرێت لەم ئایەتە پیرۆزەدا:**

ئیسپاتکردنی ئەم ناوە جوانانە، کە وادەخوازێت خودا ئاگاداری هەموو شتێك بێت لەهەموو زەمان و کات و جێگایەکدا و ئەندازەگیری و نەخشەسازی بۆهەموویان کردبێت و هەموویان بەڕێوە بەرێت.

(١) صواعق المرسلة (٤١٢).

وفەرمایشتی : ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَيِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا ﴿٥٨﴾ ﴾ [الفرقان : ٥٨] ، واتە:وە پشت ببەستە بەو زیندووەیی کە هەرگیز نامرێت، وفەرمایشتی: ﴿وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١﴾ ﴾ [سبأ: ١] ،واتە: وئەو کاربەجێ و بەئاگایە.

شەرح

﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَيِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ ﴾ پشت ببەستە بەو زیندووەیی کە هەرگیز نامرێت، واتە : کارەکانت بەو بسپێرە، و(**التوكل**) لەڕووی زمانەوانییەوە[1] واتە: کارپێسپاردن و سەرپشك کردن (**التفويض**) ، دەوترێت: (**وكلت أمري إلى فلان أي فوضته**)واتە: کاری خۆم دایە دەست فڵان واتە پێم سپارد وسەرپشکم کرد. وماناکەی لەڕووی شەرعەوە: گرێدانی دڵە بەخوداوە و پشت بەستنە پێی لەهێنانی خێر و چاکە ودوور خستنەوەی خراپە وزیان و، پشت بەستن بەخودا جۆرێکە لەجۆرەکانی عیبادەت و واجبە، پێچەوانەی گرتنە بەری هۆکار و سەبەب نییە، بەڵکو بەتەواوی هاوتەریبە لەگەڵی. بۆیە سیفەتی ژیان(**الحياة**)ـی بەتایبەت هێنا وەك ئاماژەیەك بەوەی تەنها کەسی زیندوو (**الحيِّ**)ـە جێگای متمانەیە بۆ دەسخستنی مەسڵەحەت و خێر. ژیانی هەتا هەتایی و بەردەوام بوونی نییە جگە بۆ خودا نەبێت و، هەرچی ئەوانەشە کە زیندوون ئەوانە زیندوویەتیەکەیان کاتیە، ئەوانە کاتێ مردن ئەوانەی پشتیان پێیان بەستوون سەرگەردان دەبن .

(١) «النهج الأسمى» (٤٥٥) ، و «تهذيب مدارج السالكين» (٥٣٣) .

✍ **شایەتحاڵ لەم ئایەتە پیرۆزەدا:**

ئەم ئایەتە ئیسپانی ژیانی کامڵ و تەواوی تێدایە بۆ خودا، لەگەڵیشدا نەفی مردن و لەناوچوونی تێدایە بۆ زاتی الله، کەواتە هەریەك لەنەفی و ئیسپاتی سەبارەت بەسیفاتەکانی خودای تێدا هاتووە .

جا فەرمایشتی: ﴿وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ﴾ دوو مانای هەیە[1]:

**یەکەمیان:** خودا دەسڵاتدارە و دادوەرە لەدونیا و دوارۆژدا لەنێوان دروستکراوەکانی بەفەرمانە کەونی و شەرعییەکانی .

**دووەم** : ورد و هەڵسوڕێنەرێکی (**المُحكم**) دەقیقی شتەکانە، ولە دانایی (**الحكمة**)ـەوە هاتووە کە بەمانای دانانی شتەکان دێت لەجێگای خۆیاندا، خوای پەروەردگار حیکمەت و دانایی هەیە لەدروستکراوەکانیدا و هیچ شتێکی بێ حیکمەت دروست نەکردووە و هیچ شتێکی تەشریع نەکردووە مەگەر لە پێناو بەرژەوەندییەك نەبێت.﴿ ٱلْخَبِيرُ ﴾[2]: لە ئەزموون ولێزانین(**الخبرة**)ـەوە هاتووە، کە ئەویش پەیبردنە بەڕووە دیار و شاراوەکانی شتەکان، دەوترێت: (**خَبَرْتُ الشيء**) کاتێ کە شتەکەم زانی وەك خۆی. جا زاتی (الله) خەبیر و ئاگادارە، واتە: ئاگاداری ڕووە نادیار وشاراوەکانی شتەکانە، هەروەك چۆن ئاگاداری ڕووە دیار و ئاشکراکانیەتی .

✍ **ئەوەی تێبینی دەکرێت لەم ئایەتە پیرۆزەدا:**

ئەم ئایەتە ئیسپاتکردنی دوو ناو لەناوەکانی خودای لەخۆ گرتووە کە ئەوانیش ناوی: (**الحكيم، الخبير**)ـە، کە ئەوانیش دوو سیفەت لەسیفەتەکانی خودا لەخۆ دەگرن کە بریتین لە دانایی (**الحكمة**) و، لێزانی و ئەزموون (**الخبرة**) .

---

(١) «النهج الأسمى» (٢٢٨).

(٢) «معالم التوحيد» (١٣٦).

## [٣] پەیبردنی زانستی خودا بەهەموو درووستکراوەکانی:

﴿ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَاۚ ﴿٢﴾ ﴾[سبا: ٢] ، واتە:هەرچی دەچێتە ناو جەرگەی زەویی، وەک باران و شتی تر، وە هەرچیش لێی دێتە دەرێ وەک ئاوو شتی تر، وە هەرچیش لە ئاسماندا دێتە خوارێ، وەک فریشتە و باران و بروسکەو شتی تر، وە هەرچیش لێیەوە سەر دەکەوێ و بەرز دەبێتەوە وەک فریشتەو کردەوەی بەندەکان و شتی تر، ئەو خوایە پێی دەزانێ و بە ئاگایە ،﴿ وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٥٩﴾ ﴾ [الانعام : ٥٩] ، واتە:کلیلی گشت گەنجینەکانی غەیب، تەنها لای خوایەو، تەنها هەر ئەویش پێیان دەزانێت و، تەواوی کارە نادیارەکانیش لای ئەو ئاشکراو دیارن ،خۆ ئەوکاتەش کەخاتوو عائیشە تۆمەتبارکراو، بوختانەکەی بۆ هەڵبەسترا، پەیامبەر -ﷺ- ئەگەرچی بەهیچ شێوەیەک لێی بەدگومان نەبوو، بەڵام بەشێوەیەکی (عین الیقین)یش ئاگای لە هەواڵەکە نەبوو، هەرچیش لە وشکانیی و دەریادایە ئەو دەیزانێ، هیچ گەڵا دارێکیش بێ ئاگاداری ئەو ناوەرێت، هەردانەیە کە لەناو تاریکایی زەوییدا بێ، و هەرچی تەڕو وشکیشە، گشت ئەوانە لەناو کتێبێکی ئاشکرادایە وەکو (لوح المحفوظ)، واتە: خوای کارزان بە گشت بوونەوەر -بەگیاندارو بێ گیانیەوە- زانست و زانیاریی هەیە.



﴿ يَعۡلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ [1]، واتە : خودا ئاگاداری هەموو ئەو شتانەیە کە دەچێتە ناخی زەویدا لە ئاو و دانەوێڵە و کەنز و مردوو و جگە لەمانەش، ﴿وَمَا يَخۡرُجُ مِنۡهَا ﴾و ئاگاداری ئەوەشە کە لەزەوی دەردەچێت لەڕووەك و کانزا وجگە لهمانەش، ﴿وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾وئاگاداری ئەوەشە کە لەئاسمانەوە دادەبەزێت لە باران و فریشتە و جگە لەمانەش، ﴿وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَا﴾و ئاگاداری ئەو شتانەشە کە بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان لەفریشتە و کردەوە و جگە لەمانەش .

**شایەتحاڵ لەم ئایەتەدا:**

لەم ئایەتەدا ئیسپاتی عیلم و زانست کراوە بۆ خودا، عیلم و زانستێك کە دەوری هەموو شتێکی داوە و پەی بەهەموو شتێك دەبات.

فەرمایشتی : ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ ﴾ واتە : زانستی غەیب و نادیار و شاراوە تەنها لای خودایە ، ﴿لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَ﴾کەس نایزانێ و ئاگاداری نییە، جا هەرکەسێك بانگەشەی شتێك لەزانستی غەیب بکات ئەوا بێگومان کافر دەبێت.

لەفەرموودەیەکدا کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر گێڕاویەتیەوە هەروەك لەصەحیحی بوخاری و موسلیم دا[2]هاتووە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «**مفاتح الغيب خمس لا يعلمهن إلا الله**»، **ثم قرأ هذه الآية :** ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٞ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗاۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٖ تَمُوتُۚ ﴿٣٤﴾ ﴾ [لقمان:٣٤].واتە: کلیلی زانستی غەیب پێنجە و کەس نایانزانێ جگە لە الله، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: بەڕاستیی زانیاریی هاتنی ڕۆژی قیامەت هەر لای

---

(١) عیلم و زانست سیفەتێکە لەسیفەتەکانی خودا لەڕێگەیەوە ئاگاداری هەموو شتێکە بەو شێوەیەیی کە هەیە، هیچ شتێك لێی شاراوە نییە.

(٢) متفق عليه : أخرجه البخاري (٤٧٧٨) ، ومسلم ( ٩).

خوایە، ١- جگە لەو هیچ کەسێک نازانێ قیامەت کەی دێت. ٢- تەنها ئەویش باران دەبارێنێ لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا، کەسێکی تر ناتوانێ باران ببارێنێ. ٣- ئەویش دەزانێ چی لە منداڵدانەکاندایە، واتە: هەر لەو کاتەوە کە هێشتان ئاوە، خوا خۆی دەزانێ چییە: کوڕە یان کچ، بەختیارو سەرفرازە، یان لاسارو بەدبەختە، بەژن و باڵای کورتە، یا..هتد. ٤- هیچ کەسێک - نە چاکەکار و نەخراپەکار- سەد لە سەد نازانێت سبەینێ چی دەکا لە چاک و لە خراپ. ٥- هیچ کەسیش نازانێ لە کام سەر زەویی دەمرێ.

﴿وَيَعْلَمُ مَا فِي ٱلْبَرِّ﴾ واتە : ئاگاداری جێگای وشکانی وچۆڵی و دەشتیە ئەوەی کە هیچ کەسێکی لێ ناژیت و، هیچ ڕووەک و ئاژەڵ و هیچ جۆرە گیاندارێکی تێدا نییە، ﴿وَٱلْبَحْرِ﴾، واتە : ئاگاداری ئەوەشە کە لەڕووبارەکاندا هەیە لەگیانلەبەر و گەوهەرەکان و هاوشێوەکانی، ﴿وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ﴾ واتە : وە هەرگەڵایەك کە دەوەرێت، لەداری ناوچە وشکانی و ڕووبارەکان و جگە لەوانیش ﴿إِلَّا يَعْلَمُهَا﴾ تەنهاو تەنها خودا دەیزانێ و ئاگادارییی کاتی وەرینی گەڵاکان و وشوێنی وەرینەکەیەتی، ﴿وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَتِ الْأَرْضِ﴾وهیچ دانەوێڵەیەک لەجێگا دوورە دەست و تاریکەکاندا یاخود ناخی زەویدا نییە، ﴿وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ﴾ ونەتەڕ و نە وشك ﴿ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾واتە : هیچ یەکێك لەوانە ڕوو نادات ئیللا لە(لەوحولمەحفوزدا) نووسراوە.

✍ **ئەوەی تێبینی دەکرێت لەم ئایەتەدا:**

ئیسپاتی ئەوەی تێدایە کە هیچ کەسێك ئاگاداری شتە غەیبی و نهێنییەکان نییە جگە لە (الله)، وزانستی خودا دەوری هەموو شتێکی داوە و، ئیسپاتی قەدەر و نووسین لە(لەوحولمەحفوز)ی لەخۆ گرتووە .

**﴿وَمَا تَحۡمِلُ مِنۡ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلۡمِهِۦۚ ١١﴾ [فاطر: ١١]، واتە:هەر مێینەیەکیش، ئاوس و دووگیان دەبێ و، حەملەکەی دادەنێ، خوا پێی دەزانێ، واتە: بێ زانینی ئەو هیچ شتێک نابێ ، ﴿لِتَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عِلۡمَۢا ١٢﴾ [الطلاق : ١٢] ،واتە: تا بزانن کە بەراستی ئەو خوایە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو هەرچی بیەوێ ئەیکات، وە بێگومان زانست و زانیاریی ئەو خوایە دەورەی هەموو شتێکی داوە، واتە: ئاگاداری کاروباری بوونەوەرەو هیچ شتێکی لێناشارێتەوە، جا کەوابوو ئێوەیش زیاتر لە خوا بترسن و سنوورەکانی مەبەزێنن، وە فەرمایشتی : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ ٥٨﴾ [الذاريات : ٥٨]،واتە : چونکە تەنها هەر خوایە رۆزیدەر، خاوەن هێزی چار نەکراو، کەس ناتوانێ چاری خوا بکاو زاڵ ببێ بەسەریدا.**

---

## شەرح

﴿وَمَا تَحۡمِلُ مِنۡ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلۡمِهِۦۚ﴾ ،واتە : هیچ سك پڕ بوون و دوو گیان بوونێك و دانانی ئەو دوو گیانیە ڕوو نادان ئیللا خودا ئاگاداریەتی، هەر شتێك کە ڕوو دەدات لەعیلم و زانستی خودا بەدەرنییە و ئاگاداریەتی و بەویستی ئەو ڕوو دەدات، بەشێوەیەك دەزانێت مێینە کەی دوو گیان بووە، ولەچ ڕۆژێکدا سکەکەی دادەنێت، وجۆری سکەکەی چییە نێرە یاخود مێ.

﴿لِتَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾لامەکە پەیوەستە بەفەرمایشتی : ﴿خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ وَمِنَ ٱلۡأَرۡضِ مِثۡلَهُنَّ﴾ ، واتە : ئەوەی کردووە بەڵکو ئاگاداری تەواوی هێز و قودرەتی خودا بن ، ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عِلۡمَۢا﴾ واتە : بۆ ئەوەی بزانن زانستی

خودا دەوری هەموو شتێکی داوە، هیچ شتێك لەزانستی خودا بەدەرنییە جا هەرجۆرە شتێك بێت، و﴿عِلۡمَۢا﴾ مەنصوبە بەهۆی ئەوەی تەمییزە یاخود مەسدەرە؛ چونکە﴿أَحَاطَ﴾ بەمانای (عَلِمَ)دێت.

✍ **شایەتحاڵ لەم دوو ئایەتەدا:**

ئیسپاتی عیلمی خوای تێدایە ئەو عیلمەی کە دەورەی هەموو شتێکی داوە، هەروەها ئیسپاتی هێز و قودرەتێك کە بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە.

فەرمایشتی : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ﴾ :واتە: هیچ ڕۆزی دەرێك نییە جگە لە (الله)، ئەوەی کە ڕزقی دروستکراوەکانی دەدات و بەرژەوەندییەکانیان بەجێ دێنێت، پەروەردگار ڕۆزی دەرێکی بێ ئەژمارە بۆیە جگە لەو هیچ کەسێك مەپەرستن، ﴿ذُو ٱلۡقُوَّةِ﴾ ، واتە : خاوەنی هێزێکی تەواوە هێزێك کە هەرگیز توشی لاوازی و بێدەسەڵاتی نابێت، ﴿ٱلۡمَتِينُ﴾، واتە : زۆر بەهێز و بەتوانایە و لەکارەکانیدا تووشی هیچ جۆرە ماندوویی و بێتاقەتییەك نابێت . و(**المتانة**) بەمانای: بەهێزی و بەتوانایی دێت .

✍ **شایەتحاڵ لەم ئایەتە پیرۆزە دا:**

ئەم ئایەتە ئیسپاتی ناوی (**الرَّزاق**)ـی تێدایە بۆ زاتی (الله)، و وەسفکردنی بەهێز و توانایەکی لەڕادەبەدەر کە بەهیچ شێوەیەك تووشی لاوازی و بێتوانای نابێت، ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەشی تێدایە کە دەبێت تەنها عیبادەت و بەندایەتی بۆ ئەو بکرێت و هیچ هاوەڵ و شەریکێکی بۆ دانەنرێت.

بیستن بینین

## [٤] ئیسپاتکردنی گوێ و چاو بۆ زاتی الله سبحانه وتعالی:

**وە فەرمایشتی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ۝١١﴾ [الشورى: ١١] ، واتە:هیچ شتێک نیە لە وێنەی ئەو (خوا)یە، نە لە زاتیدا، نە لە سیفاتیدا، نە لە کرداریا، بۆ خۆی تەنیایەو، لە هەموو شتێک، بێ نیازەو، هەموو شتێکیش نیازمەندە بەو، ئەویشە بیسەری بینا، بە ئاگایە بە وتەی بەندەکانی، بینایە بۆ کاروکرداریان ، وفەرمایشتی :﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ۝٥٨﴾ [النساء : ٥٨]، واتە: بێگومان خوا هەمیشە ژنەوایە بۆ گشت شتێ، بینایە بۆ دیارو نادیار.**

---

شەرح

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾ سەرەتای ئایەتەکە فەرمایشتی : ﴿فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ أَزْوَٰجًا﴾ ،واتە: بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە هەر لە خۆشتان هاوسەرو ژنانی بۆ داناون وە لە وشترو گاو مەڕو بزن، جووتێ نێرو مێی.

﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ﴾ بیسەری هەموو جۆرە دەنگێکە، ﴿ٱلْبَصِيرُ﴾ ئەوەی کە هەموو شتێك دەبینێ و هیچ شتێك نە لەزەوی و نەلەئاسمان شاراوە و نادیار نییە لەلای.

پێشەوا شەوکانی لەتەفسیرەکەیدا [(١)] دەڵێت: هەرکەسێك لەم ئایەتە پیرۆزە وەك خۆی تێبگات و وەك پێویست لێی ورد بێتەوە ئەوا لەکاتی خیلاف و ڕاجیایی لەبارەی سیفاتەکانەوە بەکاری بێنێت ئەوا ڕێگایەکی ڕوون و دیاری گرتووە، وزیاتر بەرچاو

---

(١) فتح القدير (٤/ ٥٠٧).

ڕووندەبێت کاتێ لەمانای ئەم فەرمایشتە ورد بیتەوە : ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ئەم ئیسپاتکردنە دوای نەفی کردنی هاوشێوە بەڕاستی دڵنیایی و شیفای تێدایە بۆ دڵ و دەروون، دەی ئەی قوتابی زانست وەك خۆی قەدری ئەم بەڵگە ڕوون و دیار و بەهێزە بزانە، چونکە بەڕاستی بەم بەڵگەیە چەندان بیدعە تێکدەشکێنیت و، سەری چەندان کەسی گومڕای پێ دادەنەوێنیت، ولوتی چەندان کەسی ئەهلی کەلامی پێدەشکێنیت، بەتایبەت گەر لەگەڵیشیدا ئەم فەرمایشتەی الله تەعالی بێنیت : ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا﴾ [طه:١١٠]، مرۆڤەکان ناتوانن پەی بەخودا و حیکمەت و دانابیە شاراوەکانی بەرن .

هەروەها فەرمایشتی : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا﴾ [النساء:٥٨]،لەپێشیەوە ئەم فەرمایشتە هاتووە : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِٱلْعَدْلِ﴾ ، واتە: بێگومان خوا فەرمانتان پێدەدا کە هەموو ئەمانەت و سپاردەیەک بدەنەوە دەست خاوەنەکەی و هەرکات دادگایی نێوان مەردوم دەکەن، بە دادگەرانە و یەکسانیی داوەریی بکەن، واتە: بەلای هیچ کەسێکدا دامەبڕن.

جا وشەی (نِعْمَ) لەئەلفازی مەدحە، و(ما) وتراوە : نەکیرەیەکی وەسفکراوە، وەك ئەوەی بڵێت: باشترین شتێک ئامۆژگاریتانی پێ بکات، وە بۆچوونێکی تر هەیە دەڵێت: (ما) مەوصولەیە[1]، واتە: باشترین شتێکە کەئامۆژگاریتانی پێ بکات، وفەرمایشتی: ﴿يَعِظُكُم﴾ ،واتە: فەرمانتان پێدەکات بەوەی سپاردە بگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان و کاتێ حوکمتان کرد لەنێوان خەڵکدا دادگەر بن، وفەرمایشتی: ﴿إِنَّ

(١) بڕوانە: «مغني اللبيب» لابن هشام (٣٩١) .

ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴾ واتە : خودا بیسەری ئەوەیە کە دەیڵێن، وئەوەش دەبینێت کە دەیکەن و ئەنجامی دەدەن.

✍ **شایەتحاڵی ئەم ئایەتە پیرۆزە :**

ئەم دوو ئایەتە ئیسپاتکردنی چاو و گوێی تێدایە بۆ (الله)، لەئایەتی یەکەمدا نەفی لێکچوونی کردووە لەنێوان سیفەتی خودا و دروستکراوەکانی، لەمەشدا هەریەك لەنەفی و ئیسپات کۆ بووەتەوە. لەوەی کە خوای پەروەردگار وەسفی خۆی پێ کردووە.



## [٥] ئیسپاتکردنی ویست و خواست(المشيئة والإرادة)بۆ خودا (جل جلاله) :

وفەرمایشتی: ﴿ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ﴿٣٩﴾ ﴾ [الكهف : ٣٩] ،واتە: دەبوو ئەوکاتە چوویتە ناو باخەکەتەوەو ئەو گشت بەروبوومەت دییت، گوتبات: (ماشاءالله) لەم هەموو بەهرەو نیعمەتەیە خوا بەمەیلی خۆی پێیداوم، دیارە هەرچی بدات دەیدات، باوەڕیشم وایە هیچ هێزێک بۆمن نیە لەفەراهەمهێنانی، بەهێزو پشتیوانی خوا نەبێ، ئەوە دەستەبەربوو بۆ بەردەوامی ئەو نیعمەتەت، وفەرمایشتی ، ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلُوا۟ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿٢٥٣﴾ ﴾ [البقرة : ٢٥٣] ، واتە: ئەگەر خوا ویستبای بەر نەدەبوونە گیانی یەکترو یەکتریان نەدەکوشت، چونکە هەموو شتێ هەر بەدەستی ئەوەو، ئەوخۆی ئەتوانێ بە پێی ویستی خۆی بیکات، وەک ئەفەرموێ: بەڵام ئەوەی کە خوا خۆی دەیەوێ لە ڕووی حیکمەت و زانینەوە بیکا، دەیکا، ئیتر بەزۆر هیچ شتێک بەکەس ناکات. بەڵکو دەیخاتە بەر ئەقڵ و ویژدانی خۆیی وسەربەستی دەکات، وفەرمایشتی :﴿ أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلْأَنْعَٰمِ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ غَيْرَ مُحِلِّى ٱلصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ ﴿١﴾ ﴾ [المائدة:١] ، واتە: خواردنی گۆشتی وشترو گاو مەڕو بزن -دوای سەربڕینیان- حەڵاڵکراوە بۆتان، ئەو پەلەوەرو ئاژەڵە نەبێ کە: لەم سوورەتەدا هەرئێستا بۆتان دەخوێنرێتەوە،بەراستیی خواش هەرچۆنێکی ویست، بڕیاردەدات، چونکە ئەو چاکتر دەزانێ چی حەڵاڵ بکات و، چیش حەرام بکات .

## شەرح

فەرمایشتی: ﴿ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ ﴾ واتە : ئەگەر کاتێ چوویتە ناو باخەکەتەوە ﴿قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ﴾واتە : گەر خودا ویستی لەسەر بێت دەیهێڵێتەوە، وگەر ویستی لەسەر بێت لەناوی دەبات؛ ئەوەش وەك داننان بەبێدەسەڵاتی خۆتدا، وهێز و توانای هەقیقی تەنها بۆ خودایە، هەندێ لەسەلەف گوتویانە[1]: هەرکەسێك بەشتێك سەرسام بوو با بڵێت : ( ما شاء الله لا قوة إلا بالله).

هەروەها فەرمایشتی : ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلُوا۟ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ﴾ واتە : گەر ویستی خودای لەسەر نەبوایە کوشتاری یەکتریان نەدەکرد بەڵام خودا کارێك دەکات کە خۆی ویستی لەسەرە ؛ لەبەرئەوەی هیچ شتێك لەدەسەڵات و موڵکی خودادا ڕوو نادات تەنها ئەوە نەبێت کە خودا دەیەوێت، هیچ کەسێك نییە ڕێگری بکات لەحوکم و بڕیاری و، هیچ کەسێك نییە گۆڕانکاری لەبڕیار و یاساکانیدا بکات.

هەروەها فەرمایشتی: ﴿أُحِلَّتْ لَكُم ﴾واتە : بۆتان حەڵاڵ کراوە ، قسەکە ڕووی لەباوەڕدارانە، ﴿بَهِيمَةُ ٱلْأَنْعَٰمِ ﴾ واتە : وشتر و مانگا و مەڕ، ﴿ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ﴾ ئیستیسنا(استثناء) و جودا کردنەوەیە لە بڕگەی ﴿بَهِيمَةُ ٱلْأَنْعَٰمِ ﴾ ، ومەبەست لێی ئەوە کە لەم فەرمایشتەیدا باسکراوە : ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ ﴾ الآية..کە کەمێك دواتر بەدوایدا دێت . وفەرمایشتی : ﴿غَيْرَ مُحِلِّى ٱلصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌ﴾ ئیستیسنا(استثناء)

(١) تفسير ابن كثير (٢١٤/٤).

و جوداکاریەکی تره له برگەی﴿بَهِيمَةُ ٱلْأَنْعَٰمِ﴾ . وماناکەی: وشتر و مانگا و مەڕتان هەموو بۆ حەڵاڵ کراوە تەنها ئاژەڵ و گیاندارە کێویەکان نەبێت کە بەنێچیر ئەژمار دەکرێت و دروست نییە بۆتان لەکاتی ئیحرامدا ڕاوی بکەن، وفەرمایشتی: ﴿وَأَنتُمْ حُرُمٌ﴾ لەمەحەلی نەصبدا دەبێتە حال، ومەبەست لەوشەی(الحرم) ئەو کەسەیە کە ئیحرامی بەستووە جا بۆ حەج بێت یاخود عومرە یاخود بۆ هەردووکیان، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ﴾ خودا بڕیارێك دەدات کە خۆی ویستی لەسەرە لەحەڵاڵ و حەرام کردن، هیچ پەڵپ و ڕەخنەیەکی لەسەر نییە و کەس بۆی نییە بەرهەڵستی بکات و ڕەخنە لەئیشی بگرێت .

✍ **شایەتحاڵ لێرەدا :**

لەم ئایەتەدا ئیسپاتی سیفەتی ویست و قوەت و حوکم و خواست کراوە بۆ الله (جل جلاله) بەو شێوەیەی کە شایستە و شیاوە بەزاتی (الله) .

✥ ✥ ✥

**وفەرمایشتی:** ﴿ فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِۖ وَمَن يُرِدۡ أَن يُضِلَّهُۥ يَجۡعَلۡ صَدۡرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجٗا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِۚ ﴿١٢٥﴾ ﴾ [الأنعام :١٢٥]. **واتە : ئینجا ئەوکەسە کە خوا بیەوێ ڕێنمایی بکات بۆ دینی ئیسلام، دڵ و سنگی فراوان و گوشاد دەکاو، پاداشی قیامەتی لاشیرین دەکات و، ئەوجا کێش خۆی حەز بکا گومڕای بکا وا بەتوندی نەفەس تەنگی دەکات دەڵێی بەرەو ئاسمان سەردەکەوێ، ئەوکەسانەی وا بڕوا ناهێنن، هەر بەو شێوازە خوای گەورە شەیتان زاڵ دەکات بەسەریاندا.**

---

## شەرح

﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ﴾ واتە : هەرکەسێك خودا خێری بوێ و بیەوێ هیدایەتی بدات، دڵی وا لێبکات خێر و چاکە وەرگرێت و (مَن): ناوی شەرتە و فعلی دوای خۆی مەجزوم دەکات، و(یرد) مەجزومە بەهۆی ئەوەی فیعلی شەرتە، ﴿يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِ﴾ بەهەمان شێوە مەجزومە بەهۆی ئەوەی جەوابی شەرتە و(**الشرح**) : بەمانای فراوانی دێت، دەوترێت: (**شرحتُ الأمر**)بابەتەکەم شەرح کرد: کاتێ شیم کردەوە و ڕوونم کردەوە، ماناکەی لێرەدا: خودا دڵی فراوان دەکات بۆ هەق کە بریتیە لەئیسلام تاوەکو بەدڵێکی فراوانەوە قەبوڵی بکات ، ﴿وَمَن يُرِدۡ أَن يُضِلَّهُۥ﴾ واتە : هەرکەسێك خودا بیەوێت گومڕای بکات، ﴿يَجۡعَلۡ صَدۡرَهُۥ ضَيِّقًا﴾واتە : دڵی تەنگ دەکات و هەقی پێ قەبوڵ ناکرێت، جا ﴿حَرَجٗا﴾ واتە : زۆر بەرتەسکی دەکاتەوە، هیچ مەجالێکی خێر و چاکەی تێدا نامێنێت، ئەمە جەختکردنەوەیە لە مانای وشەی﴿ضَيِّقًا﴾ .

﴿كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ ئەسڵی وشکە : (يتصعد)بووە، واتە: وەك ئەوەی چەند جارێك زۆر لەخۆی بکات بۆ شتێك کە لەتوانایدا نەبێت هەروەك چۆن کەسێك بیەوێت سەرکەوێت بۆ ئاسمان، لێرەدا کافری شوبهاندووە لەقورسی ئیمان لەسەری بەکەسێك کە هەوڵی کارێك دەدات کە لەتوانایدا نییە هاوشێوەی سەرکەوتن بۆ ئاسمان .

**✍ شایەتحاڵ لەم ئایەتە پیرۆزەدا:**

ئیسپاتی ویست و ئیرادەی تێدایە بۆ الله سبحانه وتعالی، هەریەك لەڕێنوێنی و گومڕایی دەگرێتەوە، واتە: ویستی ڕێنوێنی و ویستی گومڕایی ئەوەش لەپێناو حیکمەتێکە کە خودا خۆی دەیزانێت .

**جا ویست و ئیرادەی ڕەببانی دوو جۆرە**(١):

**جۆری یەکەم** : ئیرادەی کەونی قەدەری، ئەم وشەیە موورادیف و هاومانای مەشیئەیە، یەکێك لەنموونەکانی : ئەم فەرمایشتەی خودایە : ﴿وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا﴾ [الإسراء: ١٦] ،واتە: کاتێکیش ویستبێتمان شارو ئاواییەک لەناو بەرین، ئەوا بەفەرمانێکی (ئەزەل)یی فەرماندراوە - بەتایبەتی بەسەرکردە یاخیی و خۆشگوزەرانەکانیان -کە فەرمانی پەیامبەران جێبەجێ بکەن و گوێڕایەڵیان بن جا ئەوانیش لەباتی گوێڕایەڵی، نافەرمانی و سەرپێچیان تیا کردووەو لێی دەرچوون.

هەروەها فەرمایشتی : ﴿وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوْمٍ سُوٓءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥ﴾ [الرعد: ١١]،واتە: خۆ هەرکات خوا ویستی زیان و ناڕەحەتییەک بەسەر هۆزێکدا بهێنێ، هەرگیز گەڕانەوەی بۆنیە. وفەرمایشتی : ﴿وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا

---

(١) «شرح العقيدة الطحاوية» (٥٠٥) ، و «مجموع الفتاوى» (٨ / ١٥٧ - ١٦٥) .

حَرَجًا ﴾[الأنعام:١٢٥]،واتە:کێش خۆی حەز بکا گومڕای بکا وا بەتوندی نەفەس تەنگی دەکات.

**جۆری دووەم** : ئیرادەی دینی شەرعی، یەکێك لەنموونەکانی ئەم فەرمایشتەی خوای پەروەردگارە: ﴿وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ ﴾ [النساء : ٢٧] ،واتە:خوا ئەیەوێ تەوبەو پەشیمانیتان لێوەرگرێت. سەرنجێک: دووپاتکردنەوەی تەوبە لێرەدا ئاماژەیە بەوەی کە بەزەیی خوا فراوانەو، بۆ ئەوەی ئەوانیش لە تەوبەکردن کۆڵ نەدەن، وفەرمایشتی : ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ﴾ [المائدة: ٦] ،واتە: خوا نایەوێ لە دینداریيدا هیچ جۆرە نارەحەتیەک بخاتە سەرشانتان و سەغڵەتتان بکات بەڵکو ئەیەوێ لەگوناهـ و تاوان پاکتان بکاتەوە، وفەرمایشتی : ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذۡهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجۡسَ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ﴾ [الأحزاب: ٣٣] ، واتە: بەڕاستی لەم - ئاراستانەدا- خوا هەر دەیەوێ هەموو چڵک و چەپەڵیی و، گشت کارێکی نارەواو نا دروستان لێ دوور بخاتەوە (ئەی خانەوادەی پێغەمبەر!).

**جیاوازی نێوان دوو ئیرادەکە :**

١- ئیرادەی کەونی دەکرێت خودا خۆشی بوێت و لێی ڕازی بێت، دەشکرێت حەزی پێی نەبێت و لێی ڕازی نەبێت، وئیرادەی شەرعی ئەمەیان بێگومان دەبێت خودا خۆشی بوێت و لێی ڕازی بێت. خوای پەروەردگار لە ئیرادەی کەونیدا تاوانی بەدیهێناوە ولەهەمان کاتدا لەڕووی ئیرادەی شەرعیەوە لێی ڕازی نییە وقەدەغەی کردووە .

٢- ئیرادەی کەونی خودی شتەکە مەبەست نییە بەڵکو بۆ حیکمەتێکی تر بەدیهێنراوە هاوشێوەی بەدیهێنانی شەیتان و گشت شەڕ و خراپەکان ؛ ئەوەش لەپێناو موجاهەدەی شەیتان و تۆبەکردن و داوای لێخۆش بوون کردن، جگە لەمانەش

لەوانەی کە خودا پێی خۆشە و خۆشی دەوێت، بەڵام ئیرادەی شەرعی خودی شتەکە ئامانجە، خوای پەروەردگار ویست و ئیرادەی لەسەرە لەکەون و شەرعدا، خۆشی دەوێت و لێشی ڕازییە .

٣- ئیرادەی کەونی هەردەبێ بێتە بوون و هیچ مەجالێکی تێدا نییە بەڵام ئیرادەی شەرعی مەرج نییە هەموو کات بێتە بوون، هەندێ جار دێتە بوون و هەندێ جاریش لەئەرزی واقعدا نایەتە بوون.

**تێبینی:** هەریەك لەئیرادەی کەونی و شەرعی یەك دەگرن بەنیسبەت کەسی دڵسۆز و گوێڕایەڵەوە، وئیرادەی کەونی بەتەنها دێتە دی بەنیسبەت کەسی تاوانبار و سەرپیچی کارەوە.

**تێبینیەکی تر :** هەرکەسێك دان نەنێت بەهەردوو ئیرادەکەدا ئەوا بێگومان گومڕا دەبێت ؛ هاوشێوەی جەبری و قەدەرییەکان.

**جەبرییەکان:** تەنها ئیرادەی کەونیان ئیسپات کرد، **قەدەرییەکانیش** تەنها ئیرادەی شەرعی، بەڵام ئەهلی سوننە هەردوو جۆری ئیرادەکە ئیسپات دەکەن و جیاوازی دەکەن لەنێوانیاندا .



## [٦] ئیسپاتکردنی خۆشویستنی خودا و سۆزی بۆ بەندە چاکەکانی بەو شێوازەی کە شایستەی زات و گەورەییەتی:

هەروەها فەرمایشتی: ﴿وَأَحْسِنُوٓا۟ ۛ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾﴾ [البقرة: ١٩٥]، واتە: و خێرو چاکە بکەن، بەراستی خوا ئاکارچاکانی خۆش دەوێ. ﴿وَأَقْسِطُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٩﴾﴾ [الحجرات : ٩] ، واتە: وە دادپەروەر بن و بەلای هیچ کەسێکیاندا دامەبڕن، چونکە بێگومان خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێ .﴿فَمَا ٱسْتَقَـٰمُوا۟ لَكُمْ فَٱسْتَقِيمُوا۟ لَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٧﴾﴾ [التوبة: ٧] ، واتە: ئەوانە هەتا بەڕێک و پێکی لەسەر پەیمانەکەیان بن و وەفاداربن ، دەبێ ئێوەیش پەیمانەکەیان بەڕێک و پێک ڕاگرن و وەفادارین، بەراستی خوا پارێزکارانی خۆشدەوێ. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾﴾[البقرة: ٢٢٢] ، واتە: بەراستیی خوا ئەو کەسانەی خۆش دەوێ کە لە گوناە پەشیمان دەبنەوەو، خۆیان بەپاک وخاوێن ڕادەگرن تەبیعەت پاکن لەکاتی حەیزدا، لەپاشەوەی قەدەغەکرا ناچنە لای ژنەکانیان. وفەرمایشتی: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ ﴿٣١﴾﴾ [آل عمران : ٣١] ، واتە: پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم- ئەگەر ئێوە خواتان خۆش ئەوێ و «ئەتانەوێ لێی نزیک ببنەوە» دەبێ پەیڕەوی لەشەریعەت وبەرنامەکەی من بکەن، ئەوسا خوایش ئێوەی خۆش دەوێ. وفەرمایشتی: ﴿فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ ﴿٥٤﴾﴾ [المائدة: ٥٤] ، واتە: جا خوا لەمەولا کەسانێک دێنێت، ئەوەندە بەرفەرمانی دەبن، خۆشی دەوێن و، ئەوانیش ئەویان خۆشدەوێ.وفەرمایشتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَـٰنٌ مَّرْصُوصٌ ﴿٤﴾﴾ [الصف: ٤] ، واتە: بێگومان خوا ئەو کەسانەی

**خۆش دەویٚ دەجەنگن لە پێناوی ڕێگای ئەودا بە یەک صەف و، یەک ڕیز، وەک دیواری بینایەکی مەحکەمی بە قوڕقوشم داڕێژراو، واتە: بە شێوەیەک دەجەنگن هەرگیز لە جێگەی خۆیاندا ناجوڵێن و سەنگەر چۆڵ ناکەن. وفەرمایشتی:﴿ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلْوَدُودُ ﴿١٤﴾ ﴾ [البروج : ١٤] ، واتە: وە هەر ئەویشە خوای لێبووردەی خاوەنی خۆشەویستی بۆ بەندە تەوبەکارو گوێرایەڵەکانی .**

---

## شەرح

دوای ئەوەی شێخ ئەو ئایەتانەی هێنا کە ئیسپاتی(**المشيئة والإرادة**)دەکات پاشان ئەو ئایەتانەی هێنا کە ئیسپاتی خۆشویستن دەکات بۆ خودا جل جلاله . لەمەشدا وەڵامی ئەوانە هەیە کە جیاوازی ناکەن لەنێوان (**المشيئة والمحبة**←ویست و خۆشویستن)ـدا و، دەڵێن : هەردووکیان موتەلازمی یەکن و پێکەوە گرێدراون و دەڵێن: هەرشتێك خودا ویستی لەسەر بێت ئەوا خۆشی دەوێت و لێی ڕازییە!. پێشتر بەتەفصیلی ئەم بابەتەمان ڕوونکردەوە و، گوتمان هەندیٚ جار خودا شتانێك دروست دەکات و ئیرادەی لەسەرە بەڵام خۆشی ناوێت و لێی ڕازی نییە ؛ هاوشێوەی کوفری کافر و گشت تاوانەکانی تر، هەندیٚ جاریش ویستی لەسەر شتێکە و خۆشیشی دەوێت ؛ هاوشێوەی ئیمان و گشت تاعەت و عیبادەتەکان.

فەرمایشتی: ﴿وَأَحْسِنُوٓاْ﴾ ئەمە فرمانی خودایە بەئیحسان و چاکە، کە ئەویش بریتییە لە: ئەنجامدانی کاری چاکە بەجوانترین و باشترین شێواز، ئیحسان بەرزترین پلەو مەرتەبەی تاعەت و چاکەیە .

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ ئەمە تەعلیل و ڕوونکردنەوەی فەرمان کردنە بەئیحسان، خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردووە ؛ چوکە خۆشی دەوێت و ئەوانەشی خۆش

دەوێت کە ئەنجامی دەدەن، ئەوەش دەبێتە پاڵنەر بۆ بەجێهێنانی ئەوەی فرمانی پێکراوە.

هەروەها فەرمایشتی: ﴿وَأَقْسِطُوٓاْ﴾ فەرمان کردنە بە(**الإقساط**) کەبریتییە لە: دادپەروەری لەمامەڵە و حوکمدا لەگەڵ کەسانی دوور و نزیکدا، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ﴾ئەم فەرمایشتە ڕونکردنەوەی هۆکاری فرمان کردنە بەدادپەروەری، خوای تەعالا فرمانی پێکردووە؛ چونکە ﴿ٱلْمُقْسِطِينَ﴾،واتە : دادپەروەرانی خۆش دەوێت، وخۆشویستنی بۆیان وا دەکات بەباشترین شێوە پاداشتیان بداتەوە .

هەروەها فەرمایشتی: ﴿فَمَا ٱسْتَقَٰمُواْ لَكُمْ فَٱسْتَقِيمُواْ لَهُمْ﴾ واتە : هەرکات هاوبەش دانەران لەسەر پەیمانەکەیان لەگەڵتان بەردەوام بوون و نەیان شکان ئەوا ئێوەش پابەندی پەیمانەکە بن و کوشتاریان مەکەن، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ئەمەشیان تەعلیل و ڕوونکردنەوەی هۆکاری فەرمان کردنە بەپابەند بوون بەعەهد و پەیمانەوە، جا خوای پەروەردگار فرمانی بەپاراستنی پەیمان کردووە؛ چونکە ئەوە کار و ئاکاری کەسانی موتتەقی و لەخوا ترسە ئەوانەی کە خودا خۆشی دەوێن ، لەمەشدا ئاماژە هەیە بەوەی پابەند بوون بەپەیمانەوە کاری کەسانی موتتەقیە.

**تەقواش:** ئەنجامدانی تاعەتە و دوور کەوتنەوەیە لەتاوان و سەرپێچی بەئومێدی پاداشتی خودا و وەك ترسێکیش لەسزاو عوقەبەکانی .

هەروەها فەرمایشتی : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ ﴾ وشەی(**التوابين**) : جەمعی(**تواب**) صیغەی موبالەغەیە و لە(**التوبة**)ـەوە وەرگیراوە، ولەڕووی زمانەوانییەوە بەمانای : گەڕانەوە (**الرجوع**)دێت .

لەڕووی شەرعەوە: گەڕانەوە و پەشیمان بوونەوەیە لەتاوان و، ئەم تەفسیرە بەنیسبەت بەندەوەیە، بەنیسبەت خوداوە وشەی(**التوّاب**) ناوێکە لەناوەکانی خودا، پێشەوا ئیبنولقەیم دەڵێت[١]: بەندە تەووابە، وخوداش تەووابە، تەوبەی بەندە گەڕانەوەیەتی بۆلای سەید و گەورەکەی، وتەوبەی خودا دوو جۆرە : ڕێگەدان و تەوفیق دانە، وقەبوڵکردن و ئەژمارکردنە. ﴿وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ﴾ وشەی ﴿ٱلْمُتَطَهِّرِينَ﴾: جەمعی (**متطهر**)ـە، وئیسمی فاعیلە لە(**الطهارة**)ـەوە هاتووە کە ئەویش پاکی و بێخەوشیە و دوور بوونە لەهەر پیسییەك جا حسی بێت یاخود مەعنەوی، لەئایەتەکەدا خوای پەروەردگار هەواڵی داوە بەوەی ئەم دوو جۆرە تاقمەی خۆش دەوێت لەبەندەکانی، واتە: ئەوانەی زۆر تەوبە دەکەن و ئەوانەش پاکن و دوورن لەهەر جۆرە پیسیەك (**التوابين والمتطهرين** ).

هەروەها فەرمایشتی: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ﴾ هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە هەروەك پێشەوا ئیبن کەسیر باسی کردووە[٢]: کۆمەڵە کەسێك هەبوون بانگەشەی خۆشویستنی خودایان دەکرد خوای پەروەردگاریش بەم ئایەتە تاقی کردنەوە، جا ئەم ئایەتە سەنگی مەحەک و تەرازووە و بەدرۆ خەرەوەی بانگەشەی هەرکەسێکە کە بانگەشەی خۆشویستی خودا بکات بەڵام لەسەر ڕێباز و بەرنامەی پێغەمبەر ﷺ نەچێت.

هەروەها فەرمایشتی: ﴿يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ﴾ واتە : زیاد لەوەتان دەست دەکەوێت کە داوای دەکەن بەوەی ئێوە ئەوتان خۆش دەوێت کە ئەویش خۆشویستنی خودایە بۆ ئێوە، ئەمەش گەورەترە لەوەی یەکەم . وفەرمایشتی : ﴿فَسَوْفَ يَأْتِي ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ

---

(١) مدارج السالكين (١/ ٣١٣).
(٢) تفسير ابن كثير (٢/ ٢٩).

﴿وَيُحِبُّونَهُۥٓ﴾ ئەمە وڵامی مەرجەکەیە کە لەئایەتی : ﴿مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ﴾ـدا هاتبوو ، خوای پەروەردگار باسی هێز و توانای بێئەژماری خۆی دەکات بەوەی گەر کەسانێك پشت بکەن لەئاینەکەی و سەری نەخەن و شەریعەتەکەی جێ بەجێ نەکەن ئەوا خودا دەیانگۆڕێت بەکەسانێکی تر کە زۆر لەمان چاکتر و باشترن.

ئەوانیش کەسانێکن کە کۆمەڵە سیفەتێکی گەورەیان تێدایە، گەورەترینیان ئەوەیە: خودایان خۆش دەوێت وخوداش خۆشی دەوێن، مەبەست لێی: ئەبو بەکر و هاوەڵان و تابیعیەکانە ئەوانەی جەنگان لەگەڵ هەڵگەڕاوەکاندا، پاشان هەموو ئەوانەی دوای ئەوانیش لەجەنگاوەران ئەوانەی دەجەنگن لەگەڵ هەڵگەڕاواندا تاوەکو ڕۆژی دوایی .

هەروەها فەرمایشتی : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ﴾ هەواڵدانی پەروەردگارە بەوەی هەموو ئەوانەی خۆش دەوێت کە ئەم سیفەتەیان تێدایە﴿يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ﴾ واتە : بەماڵ و گیانیان لەپێناو بەرزکردنەوەی بەرنامە و پەیامەکەی خودادا ﴿صَفًّا﴾ ڕیز ڕیز دەجەنگن، واتە: لەکاتی جەنگدا ڕیز دەبەستن و جێگاکانیان بەجێ ناهێڵن، ﴿كَأَنَّهُم بُنْيَٰنٌ مَّرْصُوصٌ﴾ وەك ئەوەی یەك دیواری پێکەوە گرێدراو بن و هیچ کون و کەلەبەر و بۆشاییەک لەنێوانیاندا نییە .

هەروەها فەرمایشتی : ﴿وَهُوَ ٱلْغَفُورُ﴾، واتە : زۆر لێخۆش بوو و لێبوردەیە، و(**الغفر**)بەمانای سیتر و داپۆشین دێت، خوای پەروەردگار لەو کەسە دەبوورێت کە تۆبە دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ لای، واتە: گوناهەکانی دادەپۆشێت و لەتاوانەکانی دەبوورێت.

﴿ٱلْوَدُودُ﴾ لە(**الود**)ـەوە هاتووە کە بەمانای ئەوپەڕی خۆشەویستی دێت، جا الله تەعالا (**ودود**)ـە، بەومانایەیی: ئەوانەی خۆش دەوێت کە تاعەت و عیبادەتی دەکەن، هاتنی ئەم دوو ناوە جوان وبەڕێزە پێکەوە نهێنییەکی تێدایە، کە ئەویش ئەوەیە:

بەندەکەی خۆش دەوێت دوای لێخۆش بوون بەشێوەیەك لێی خۆش دەبێت و دواتر خۆشی دەوێت .

**مەوزوعی شاهید لەم ئایەتەدا:**

لەم ئایەتەدا ئیسپاتی(**المحبة والمودة** )ـەی تێدایە بۆ الله سبحانه وتعالى و، خودا هەندێ کەس و هەندێ کردەوە و ڕەوشتی خۆش دەوێت، جا خودا هەندێ شتی خۆش دەوێت و حەزی بەهەندێ شتی تر نییە ئەوەش بەگوێرەی ئەو حیکمەت و دانایییەی کە هەیە و دەیخوازێت، خوای پەروەردگار کەسانی چاکەکاری خۆش دەوێت، وکەسانی دادپەروەری خۆش دەوێت و، کەسانی بەتەقوای خۆش دەوێت و، کەسانی شوێنکەوتەی پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێت و، کەسانی موجاهید و تێکۆشەر لەپێناو خۆیدا خۆش دەوێت و، کەسانی تەوبەکار و پاکی خۆش دەوێت.

ئەمەش ئیسپاتکردنی خۆشویستنی لەدوو لاوە تێدایە، بۆ لایەنی بەندە، ولایەنی پەروەردگار ، ﴿ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ ﴾ ، ﴿إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ﴾ ئەم ئایەتە وڵامی ئەوانەیە کە نەفی خۆشەویستی دەکەن لەهەردوولا: هاوشێوەی جەهمی و موعتەزیلییەکان[1]، ئەوان دەڵێن: خوا نەخۆشدەویسترێت و نەئەویش خەڵکی خۆش دەوێت و، خۆشویستنی بەندەکان بۆی بەوە لێکدەدەنەوە گوایە مەبەست لێی بەندەکان حەزیان بەعیبادەت و تاعەتیەتی، وخۆشویستنی خوداش بۆ بەندەکان تەئویل دەکەن و دەڵێن: مەبەست لێی ویستی چاکەکارییە لەگەڵیان و لەگەڵ ویستی پاداشتدانەوەیان، ئەمەش تەئویل و لێکدانەوەیەکی هەڵە و باتڵە ؛ چونکە خۆشویستنی خودا بۆ بەندەکانی خودی خۆشویستنە و مەبەست لێی شتی تر نییە، حەتمەن بەو شێوەیەی کە شیاوی زاتی خودایە، هاوشێوەی گشت سیفاتەکانی تریەتی و خۆشویستنەکەی هاوشێوەی خۆشویستنی بەندەکانی نییە.

---

(١) التنبيهات السنية على العقيدة الواسطية للرشيد (٧٦).

## [٧] ئیسپاتکردنی سیفەتی ڕەحمەت و لێخۆش بوون(الرحمة والمغفرة)بۆ خوای پەروەردگار

وفەرمایشتی : ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ ﴾ [النمل:٣٠] ، واتە: دەبێ هەموو کاروبارێک تەنها بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبانەوە بکرێت،﴿ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا ﴿٧﴾ ﴾ [غافر: ٧] ، واتە: ئەی پەروەردگاری هەموان! ڕەحمەت و میهرەبانیی و زانیاریی تۆ هەموو شتێکی داگرتووە، واتە: میهرەبانیی تۆ زۆر گەورەترو فراوانترە لە گوناهو تاوانەکانی ئەوان و، خۆیشت بە حاڵ و ئەحواڵیان چاک دەزانی،﴿ وَكَانَ بِالْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾ ﴾ [الأحزاب: ٤٣] ، واتە: خواش بەردەوام لەگەڵ بڕواداران میهرەبان و دلۆڤانە، ﴿ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ﴿١٥٦﴾ ﴾ [الأعراف: ١٥٦] ، واتە: بەزەیی و میهرەبانیشم ئەوەندە زۆرە هەمووشتێکی داگرتووەو، بەشی هەمووکەسێک دەکات ،﴿ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ ﴿٥٤﴾ ﴾ [الأنعام: ٥٤] ، واتە: دڵنیابن کە پەروەردگارتان لەسەر خۆی نوسیوە بەبەزەیی و بە ڕەحم بێت لەگەڵتان، ﴿ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾ ﴾ [یونس: ١٠٧] ، واتە: تەنها هەر خۆیەتی زۆر پۆشەرو لێبوردە، میهرەبان و ڕەحیم و دلۆڤان، ﴿ فَاللَّهُ خَيْرٌ حَافِظًا ۖ وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ﴿٦٤﴾ ﴾ [ یوسف : ٦٤] ، واتە: ئەویش لەهەموو خاوەن بەزەییەک، بە بەزەیی ترە، واتە: بەتەمای ڕەحم و بەزەیی خوام .

## شەرح

فەرمایشتی : ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ پێشتر و لەسەرەتای کتێبەکەدا تەفسیر کرا و هۆکاری هێنانی لێرەدا : ئیسپاتکردنی سیفەتی ڕەحمەتی تێدایە بۆ خودا کە سیفەتێکە لەسیفەتەکانی، هەروەك لەئایەتەکانی دواییدا هاتووە، پێشەوا ئیبنولقەیم دەڵێت[1]: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ دەلالەت دەکاتە سەر سیفەتێك کە لەزاتی (الله) دا هەیە، و ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ سیفەتێکە لە خودادا هەیە و پەیوەستە بەکەسی ڕەحم لێکراوەوە، هەروەها خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا﴾ ،واتە:خواش بەردەوام لەگەڵ بڕواداران میهرەبان و دلۆڤانە، وهیچ کاتێك نەهاتووە بفەرموێت: **(رحمن بهم)** واتە: خودا بەڕەحمە بەوان، یەکەم ، واتە: **(الرحمن)** بۆ وەسفە، دووەم بۆ فیعلە، ویەکەم بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ڕەحمەت سیفەیەتییەتی، ودووەم بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەڕەحمی خۆی ڕەحم بەدروستکراوەکانی دەکات .

فەرمایشتی : ﴿رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا﴾ ئەمە سەرگوزشتەی ئەو فریشتانەیە کەعەرش هەڵدەگرن و ئەوانەی لەو دەور و بەرەن ئەوان داوای لێخۆش بوون دەکەن بۆ باوەڕداران و، دەڵێن: ﴿رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا﴾ ،واتە : ڕەحم وزانستت هەموو شتێکی گرتۆتەوە، جا ﴿رَّحْمَةً وَعِلْمًا﴾ مەنسوبن بەهۆی ئەوەی تەمییزن و لەفاعیلێکەوە تەحویل کراون، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەرفراوانی و گشتگیری ڕەحمەتی خودا و، هیچ موسوڵمان و کافرێك نییە

---

(١) بدائع الفوائد (١/ ٢٤).

ئیللا لەدونیادا لەو ڕەحمەتەی بەرکەوتووە، بەڵام بەنیسبەت قیامەتەوە تایبەتە بەباوەڕداران .

فەرمایشتی : ﴿وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا﴾ ئەمە هەواڵێکە لەبارەی ئەوەی خودا بەڕەحمە بەرانبەر باوەڕداران لەدنیا و دواڕۆژدا ڕەحمیان پێدەکات، هەرچی دنیایە ئەوەتا ڕێنوێنی کردوون بۆ هەق ئەوەی کە کەسانی تر بێئاگان لێی و، ڕێگایەکی پێ پیشانداون کە کەسانی تر ونیان کردووە، بەنیسبەت ڕەحمەتی بۆیان لەدواڕۆژدا ئەمین و دڵنیایی کردوون لەترسە گەورەکە و دەیانخاتە بەهەشتەوە ، وفەرمایشتی : ﴿كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ﴾، واتە : پێویستی کردووە لەسەر زاتی پیرۆزی، وەك فەزڵ و بەخشش، وئەم نوسینە نوسینێکی کەونی قەدەریە و کەس پێویستی نەکردووە لەسەری .

هەروەها فەرمایشتی : ﴿وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ خوای پەروەردگار هەواڵی داوە لەبارەی خۆیەوە کە سیفەتی ڕەحمەت و لێخۆش بوونی تێدایە بۆ کەسێك تۆبە بکات بۆلای خودا و پشتی پێ ببەستێت، جا بۆ هەر تاوانێك بێت هاوشێوەی هاوبەش دانانیش ئەوا خودا تۆبەکەی وەردەگرێت و لێی خۆش دەبێت و ڕەحمی پێدەکات.

هەروەها فەرمایشتی: ﴿فَٱللَّهُ خَيْرٌ حَٰفِظًا﴾ ئەمە ئەوەیە کە خودا لە پێغەمبەرەکەی یەعقوبەوە (علیه السلام) گێڕاویەتیەوە کاتێ کە منداڵەکانی داوایان لێکرد براکەیان لەگەڵدا بنرێت، پەیمانی پاراستنیان پێدا، ئەویش پێیانی فەرموو: پاراستنی خودا بۆی باشترە لەپارێزگاری ئێوە لێی. ئەمە خۆ تەسلیم کردنی یەعقوبە بەپەروەردگاری بەوەی منداڵەکەی بپارێزێت.

یەکێك لەناوەکانی خودا پارێزەر (**الحفيظ**)ـە : ئەوەی کەبەندەکانی دەپارێزێت بەپاراستنێکی گشتی لە لەناوچوون و بەهیلاك چوون و، کردەوەکانیان بۆ دەپارێزێت،

وبەندە باوەڕدارەکانی دەپارێزێت بەپاراستنێکی تایبەت لەوەی کە باوەڕەکەیان هەڵدەوەشێنێتەوە و ئەوەش کە زیانیان پێدەگەیەنێت لەدین و دنیایاندا .

✍ **شایەتحاڵ لەم ئایەتە پیرۆزانەدا:**

ئەمە وەسفی خودای تێدایە بەڕەحمەت و لێخۆش بوون بەو شێوەیەی کە لایەقی زاتی پیرۆزیەتی وەك گشت سیفاتەکانی تری و، ئەمە وەڵامە بۆ جەهمی و موعتەزیلییەکان و هاوشێوەکانیان ئەوانەی کە نەفی ئەوە دەکەن خودا سیفەتی ڕەحمەت و لێخۆش بوونی هەبێت ئەوەش لەپێناو توش نەبوون بەچواندن بەگومانی خۆیان.

**ئەوان دەڵێن:** لەبەرئەوەی مەخلوق وەسف دەکرێت بەڕەحم، بۆیە ئەم ئایەتانەیان تەئویل کردووە بەوەی مەجازە و مانا هەقیقیەکەی مەبەست نییە، ئەمەش بۆچوونێکی هەڵە و باتڵە؛ چونکە خودا ئەم سیفەتەی بۆ خۆی ئیسپات کردووە، پاشان ڕەحمەتی خودا هاوشێوەی ڕەحمەتی دروستکراوەکان نییە تاوەکو چواندن بخوازێت، وەك ئەوەی ئەوان بانگەشەی بۆ دەکەن ، خوای پەروەردگار ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾ ﴾،واتە: هیچ شتێك هاوشێوەی خودا نییە وئەو بیسەر و بینایە. ویەککگرتنەوە لەناودا یەکبوون ناخوازیت لەناوەڕۆکدا، خالیق و بەدیهێنەر سیفات گەلێکی هەیە کە شیاویەتی و تایبەتە بەخۆی، ومەخلوق و بەدیهێنراویش سیفات گەلێکی هەیە کە شیاویەتی و تایبەتە بەخۆی ، والله أعلم.

⊷⊷⊷

## [٨] باسکردنی ڕازی بوونی خودا و توڕەبوون و زووير بوون و ڕق لێبوونەوەی لەقورئانی پیرۆزدا و، خودا ئەو سیفاتانەی هەیە:

فەرمایشتی : ﴿ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ﴾ [المائدة: ١١٩] ، **واتە:** خوای میهرەبان لێیان ڕازییە، واتە: کردەوەکانی وەرگرتوون، و ئەوانیش لەخوا ڕازین، وفەرمایشتی : ﴿ وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدٗا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَلَعَنَهُۥ ﴾ [النساء : ٩٣] ، **واتە:** هەرکەسێک بەدەستی ئەنقەست مرۆڤێکی خاوەن باوەڕ بکوژی، سزاو تۆڵەی هەر دۆزەخە و بەهەتاهەتاییش تێیدا دەمێنێتەوە، و توڕەبی و نەفرەتی خودای لە سەرە ، وفەرمایشتی : ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُواْ مَآ أَسۡخَطَ ٱللَّهَ وَكَرِهُواْ رِضۡوَٰنَهُۥ ﴾ [محمد: ٢٨] ، **واتە:** ئەو تۆڵەیەشیان بەو جۆرە، بەهۆی ئەوەوەیە کە بەڕاستیی شوێنی شتێ کەوتن خوا تووڕە دەکات، وە لەوەش ڕقیان دەبووەوە کە دەبوویە هۆی ڕەزامەندیی و خۆشنوودی خوای گەورە، وفەرمایشتی : ﴿ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ ﴾ [الزخرف: ٥٥] ، **واتە:** جا کاتێ توڕەیان کردین بە کارە خراپەکانیان، تۆڵەمان لێسەندن، وفەرمایشتی : ﴿ وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمۡ فَثَبَّطَهُمۡ ﴾ [التوبة : ٤٦] ، **واتە:** بەڵام چونکە خوا هاتنیانی پێخۆش نەبوو، گرێی خستە بەردەمیان و، وریان نەماو پاڵیان لێدایەوە، وفەرمایشتی : ﴿ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ﴾ [الصف: ٣] ، **واتە:** خوا لەلای زۆر سەختە، کە شتێ بڵێن و کاری پێنەکەن.

## شەرح

فەرمایشتی : ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ﴾ واتە : ڕازی بوو لێیان بەهۆی ئەو تاعەت و عیبادەتەیانەوە کە تەنها بۆ خودای ئەنجام دەدەن و ئەوانیش لەو ڕازی بوون بەهۆی ئەو پاداشتدانەوەیان و ئەو نیعمەتانەی کە خودا پێی بەخشیون کە گرنگترینیان ڕازی بوونی خودایە لێیان بەڕاستی هیچ نیعمەتێك ناگات بەوەدا، خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۚ﴾ [التوبة : ٧٢] ،واتە: ڕەزامەندیی خوا لەهەموو شت گەورەتر و خۆشترە. وڕازی بوونی ئەوان لەخودا ڕازی بوونی هەریەکەیانە بەو پلەو نیعمەتەی پێی بەخشراوە لەلایەن خودا بەشێوەیەك هەریەکەیان وا گومان دەبەن کەس بە ئەندازەی ئەو نیعمەتی پێ نەبەخشراوە.

هەروەها فەرمایشتی : ﴿وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا﴾ کاتێ دەفەرموێت ﴿مُؤۡمِنٗا﴾ کوشتنی کافر دەچێتە دەرەوە و هەمان ئەم حوکمەی نییە کە دواتر باسی دەکات، وبڕگەی : ﴿مُّتَعَمِّدٗا﴾ کوشتنی هەڵە دەچێتە دەرەوە، وکوشتنی بەئەنقەست: ئەوەیە کەسێك هێرش بکاتە سەر مرۆڤێك کە خوێنی پارێزراوە و بیکوژێت بەشتێك کە زۆر جار ئەو شتە مرۆڤ دەکوژێت، وبڕگەی : ﴿فَجَزَآؤُهُۥ﴾ واتە : سزاکەی لەڕۆژی دواییدا ﴿جَهَنَّمُ﴾ـە کەمەبەست لێی ئاگری دۆزەخە ﴿خَٰلِدٗا فِيهَا﴾ واتە: لەدۆزەخ دا دەمێنێتەوە و مەبەست لەخلود لێرەدا مانەوەیە بۆ ماوەیەکی زۆر ، ﴿وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ﴾ عەتفە لەسەر پێش خۆی، واتە: پاداشتەکەی دۆزەخە و توڕەبی خودا و نەفرەتی خودای لەسەرە، واتە : خودا

لەڕەحمەتی خۆی بێبەشی دەکات، جا لەعنەت واتە: دوور خستنەوەو دەرکردن لەڕەحمەت .

هەروەها فەرمایشتی : ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ﴾، واتە : ئەوەی لەئایەتەکەی پێشتر باسکراوە لەتوندی فریشتەکان لەگیان کێشانی کافراندا لەبەرئەوەی ئەوان ﴿ٱتَّبَعُواْ مَآ أَسۡخَطَ ٱللَّهَ﴾ ڕۆچوون لەتاوان و سەرپێچی و شوێنکەوتنی ئارەزووی حەرام، ﴿وَكَرِهُواْ رِضۡوَٰنَهُۥ﴾ واتە : ڕقیان لەوشتانەیە کە خودای لێی ڕازییە لەئیمان هێنان و کردەوەی چاکە، وفەرمایشتی: ﴿ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ﴾ واتە : کاتێ توڕەیان کردین ﴿ٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ ﴾ واتە: سزامانداون و، ئینتیقام: ئەوپەڕی سزادان و عقوبەیە.

هەروەها فەرمایشتی : ﴿وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمۡ ﴾ واتە : خودا ڕقی لەدەرچوونیان بوو لەگەڵتان بۆ غەزا، ﴿فَثَبَّطَهُمۡ﴾ واتە : بەندی کردن و دوای خستن لەوەی لەگەڵتان دەرچن و،سەرشۆڕی کردن، هەرچەند لەڕووی شەرعەوە فرمانی پێکردبوون بەدەرچوون و، لەڕووی حسییەوە توانای پێبەخشیبوون، بەڵام هاریکاریان نەبوو تێیدا؛ ئەوەش لەبەر ئەو حیکمەت و دانایەکەی کە خۆی دەیزانی، لەئایەتەکەی دواتردا ئەو حیکمەتەی ڕوونکردووەتەوە و فەرموویەتی: ﴿ لَوۡ خَرَجُواْ فِيكُم مَّا زَادُوكُمۡ إِلَّا خَبَالٗا ﴾ [التوبة : ٤٧] ، واتە: ئەگەر-ئەو دووڕووانە- دەریش چووبان لەگەڵتـان بۆ مەیدانی جەنگ، دوودڵی و خراپەو گێرە شێوێنی نەبوایە خێرێکیان بۆ زیاد نەدەکردن .

هەروەها فەرمایشتی : ﴿ كَبُرَ مَقۡتًا﴾ واتە : ئەوا کارێکی زۆر خراپە و خودا زۆر توڕە دەکات، و﴿مَقۡتًا﴾ مەنصوبە بەهۆی ئەوەی تەمییزە، ﴿أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ﴾واتە : پەیمانی چاکە بدەن و پاشان پابەندی بەڵێنەکەتان نەبن .

لەگێڕانەوەیەکدا هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە خراوەتە ڕوو[١] کە ئەویش ئەوەبوو کۆمەڵێ لەباوەڕداران پێش ئەوەی جیهاد فەرز بکرێت دەیانگوت: خۆزگە خودا هەواڵی پێ دەداین لەبارەی باشترین کارەوە و ئێمەش ئەنجاممان دەدا، جا ئەوەبوو خوای پەروەردگاریش هەواڵی بەپێغەمبەرەکەیدا بەوەی خۆشەویسترین کردەوە بەلای خوداوە ئیمان هێنانە بەخودا ئیمانێك کە هیچ گومانێکی تێدا نەبێت، هەروەها جیهادی ئەوانەی پێچەوانەی ئیمان دەجوڵێنەوە و دانی پێدا نانێن، جا کاتێ جیهاد فەرز کرا و فرمانی پێکرا کۆمەڵێ لەباوەڕداران پێیان ناخۆش بوو و قورس بوو لەسەریان، خوای پەروەردگار فەرمووی : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ﴾[الصف:٢] ، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! بۆچی شتێ دەڵێن و ڕەفتاری پێ ناکەن؟ مەگەر ئێوە نەتانوت: ئەگەر بمانزانیبا چ کارێ بەلای خواوە زۆرباشە دەمانکرد؟ کەچی کاتێ باسی گەورەیی و مەزنی جیهاد کرا لای خوا، هەندێکتان قسەکەی خۆتانتان شکاندو پێتان ناخۆش بوو[٢].

**✍ ئەوەی تێبینی دەکرێت لەم ئایەتە پیرۆزانەدا :**

لەم ئایەتانەدا وەسفی خودا کراوە بەوەی تووڕە دەبێت و ڕازی دەبێت و نەفرەت دەکات و تۆڵە دەکاتەوە ورقی لەهەندێ شت دەبێتەوە و دڵگران دەبێت، جا هەموو ئەمانە سیفاتی فیعلین بۆ خوای پەروەردگار هەرکات ویستی لەسەر بێت ئەنجامیان دەدات، گەر ویستی لەسەر بێت و، هەرچۆنێك ویستی لەسەر بێت.

ئەهلی سوننە هەموو ئەمانە بۆ خودا ئیسپات دەکەن هەروەك چۆن خودا بۆخۆی ئیسپاتی کردووە بەو شێوەیەی کە شایستە و گونجاوە لەگەڵ زاتی خۆیدا .

---

(١) تفسير ابن كثير (٦/ ٢٠٣).

(٢) الدرر المنثور (٨/ ١٤٦).

## [٩] باسکردنی هاتنی خودا (جل جلاله) بۆ دادوەری کردن لەنێوان بەندەکانیدا بەو شێوەیەی کە شایستەیەتی:

فەرمایشتی: ﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِى ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ ﴿٢١٠﴾ ﴾ [البقرة : ٢١٠] ، واتە: ئاخۆ پەیڕەوانی شەیتان بێ لەمە لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە لەسەرووی پەڵە هەورێکی سپیدا بێتە لایان و داوەرییان بکا، فریشتەکانیش بە ڕیز ئامادە ببن بۆ تێپەرانی بڕیارەکانی خوا، دادگایشیان ببرێتەوەو، بنێردرێن بۆ دۆزەخ، دەبێ بەدەر لەمە چاوەڕوانی چی بن؟، وفەرمایشتی:﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ﴿١٥٨﴾ ﴾ [الأنعام: ١٥٨] ، واتە: ئاخۆ ئەوانە کە تەوبە ناکەن و ناگەڕێنەوە لای خوا، تەنیا چاوەڕوانی ئەمەناکەن کتوپڕ فریشتەی گیانکێشان بێتە لایان و گیانیان بکێشێ؟ یان پەروەردگارت لە وێستگەی قیامەتدا بێتە لایان بۆ داوەریی نێوانیان ؟یان نیشانەکانی پەروەردگارت بڕێکیان - بەر لەهاتنی ڕۆژی دوایی وەک خۆر هەڵاتن لە خۆرئاواوە- بێن و سەر هەڵبدەن و، دەرگای تەوبەیان لێ دابخرێت،﴿ كَلَّآ إِذَا دُكَّتِ ٱلْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا ﴿٢١﴾ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ﴿٢٢﴾ ﴾ [الفجر: ٢١ ، ٢٢] ، واتە: دەست هەڵگرن لەو کارانە، کاتێ زەویی هەژێنرا بە هەژان دوای هەژان، وە پارە پارە کراو، شاخەکان یەکسان بوون و قیامەت پێش هات،﴿ وَيَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلْغَمَٰمِ وَنُزِّلَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا ﴿٢٥﴾ ﴾ [الفرقان : ٢٥] ، واتە: ئاسمان بەهۆی دەرکەوتنی هەورێک دەقەڵەشێ و شەقار شەقار دەبێ، فریشتەکانیش - بەنامەی کاروکردەوەی ئەوانەوە- پۆل پۆل و دەستە دەستە، دادەبەزێنرێن بۆ سەر زەوی بۆ حیساب و لێپرسینەوە.

---

### شەرح

﴿هَلْ يَنظُرُونَ﴾ ئەمە هەڕەشەیە لەبێباوەڕان ئەوانەی نایەنە نێو ئیسلامەوە و شوێنی شەیتان دەکەون، و ﴿يَنظُرُونَ﴾ بەمانای: چاوەڕێ دەکەن (**ينتظرون**)، جا : (**نظرته و انتظرته**) یەك مانایان هەیە، ﴿إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ﴾ ، واتە: تاوەکو لەڕۆژی دواییدا زاتی خودا بێت بۆ داوەری کردن لەنێوانیاندا، هەرکەسە بەگوێرەی کردەوەکەی پاداشت و سزا وەردەگرێت، ﴿فِى ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ﴾(١)وشەی(**الظلل**) : جەمعی (**ظلة**)وئەوەش ئەوەیە کەسێبەرت بۆ دەکات، و(**الغمام**): هەورێکی سپی تەنکە، ئەو ناوەی لێنراوە؛ چونکە سترە و پەردە دروست دەکات(٢)، ﴿وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ﴾ ،واتە : فریشتە لەناوهەورەکانەوە بێن، ﴿وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ﴾ واتە : بابەتەکە کۆتایی بێت کە ئەویش لەناوچوونیانە .

هەروەها فەرمایشتی : ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ﴾،واتە : فریشتەکان بێن بۆ گیان کێشانیان،﴿أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ﴾ یاخود پەروەردگارت بێت واتە: بەزاتی خۆی بۆ دادوەری کردن لەنێوان بەندەکانیدا، ﴿أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ﴾ یاخود هەندێ لەبەڵگە و نیشانەکانی پەروەردگارت بێت کە بریتییە لەهەڵهاتنی خۆر لەخۆرئاواوە،

---

(١) (ئیبن کەسیر) دەڵێ: (وهو: الغَمَام/ ظِلّ النُّورِ العَظِيمِ الذي يُبهِـرُ الأبْصَـار). واتە: مەبەسـت بە (غەمام)، ئەو هەورەیە: سێبەری ئەو، نوورێکی گەورەیەو چاوەکان دەبەزێنن، وەک ئەفەرموێ: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِى ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ﴾[٢/٢١٠]. مەبەست پێی هاتنی زاتی خوایە- جل جلالە- سێبەرەکەش، سێبەری زاتی خۆیەتی، (خوایش بۆ خۆی باشتر دەزانێ). جـا کە ئەو ڕۆژە هـات، ئیتـر تەواوی خۆرەکـان و ئەسـتێرە گەڕۆکەکـان، وەک تۆزێکی پرژو بڵاویان لێ دێ و، دڵەکانیش هەمـوو لە حەیبەتـا تروسـکاییان تیـا نـامێنێ. (**تەفسیری ڕامان**).

(٢) لسان العرب (١٢/ ٤٤٤).

ئەوەش یەکێکە لەنیشانە گەورەکانی ڕۆژی دوایی و کاتێ ئەوە ڕوو دەدات ئیتر دەرگای تۆبەکردن دادەخرێت و تۆبە لەکەس وەرناگیردرێت .

هەروەها فەرمایشتی : ﴿كَلَّآ﴾ حەرفی ڕەدعە بۆ سەرزەنشت کردن بەکار دێت و پەیوەندی بەپێش خۆیەوە هەیە، واتە: بەڕاستی بەوشێوەیە کارکردنتان باش نییە کە ئەویش ڕێزنەگرتنە لەهەتیو و خواردن نەدانە بەهەژار و بێنەوایان و، خواردنی میراتی کەسانی ترە و، خۆشویستنی ماڵە زیاد لەحەد، ﴿إِذَا دُكَّتِ ٱلْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا﴾ واتە : بلەرزێت و زۆر بەتوندی بجوڵێت، تاوەکو هەرچی خانو و بینا هەیە هەموو بڕوخێت و، تەختی زەوییەکە بێت و ببێت بەتۆز و با، ﴿وَجَآءَ رَبُّكَ﴾واتە: پەروەردگارت بەزاتی خۆی بێت بۆ دادوەری کردن لەنێوان بەندەکانیدا، ﴿وَٱلْمَلَكُ﴾واتە : جنسی فریشتە ، ﴿صَفًّا صَفًّا﴾ مەنصوبە لەبەر ئەوەی حاڵەتی ئیعرابیەکەی حالە، واتە: پۆل پۆل و پۆل لەدوای پۆل، وەدەوری جن و مرۆڤەکان دەدەن، ئەهلی هەر ئاسمانێك لەزەویدا دەبنە یەك پۆلەوە و ئەوەش کە تێیدایەتی دەبنە حەوت پۆلەوە .

هەروەها فەرمایشتی: ﴿ وَيَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ﴾واتە : لەڕۆژی دواییدا ، ﴿تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ ﴾واتە : درز و کەلێنی لێ دەبێتەوە، ﴿بِٱلْغَمَٰمِ﴾بەهەورێك کە سپیەری نورێکی گەورەیە کە چاو توشی شۆك دەکات، ﴿وَنُزِّلَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا ﴾واتە: فریشتەکان دادەبەزێندرێن بۆ سەر زەوی و لەساحەی مەحشەردا دەوری خەڵکەکە دەدەن پاشان پەروەردگار دێت بۆ دادوەری کردن لەنێوان بەندەکانیدا .

### ✍ شایەتحاڵ لەم ئایەتانەدا:

ئیسپاتکردنی هاتنی تێدایە بۆ خودا و هاتنی خودا بەزاتی خۆی لەڕۆژی دواییدا بەو شێوەیەیە کە لایەقی گەورەیی و عەزەمەتی زاتی (الله) یە بۆ دادوەری کردن لەنێوان بەندەکانیدا، هاتنی خودا یەکێکە لەسیفاتە فعلییەکان کە پێویستە وەك خۆی

ئیسپات بکرێت، ونابێت تەئویل بکرێت بەهاتنی فرمان و ئەمرەکانی، هاوشێوەی ئەوانەی نەفی سیفات دەکەن و هاتنی خودا بەهاتنی فرمانەکانی تەئویل دەکەن و، دەڵێن : ﴿وَجَآءَ رَبُّكَ﴾ واتە : (**جاء أمره**←ئەمر و فرمانەکانی هات)، وئەمەش تەحریف و گۆڕینی مانای ئایەتەکانی خودایە .

پێشەوا ئیبنولقەیم(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت[1] : هاتن و مەجیئی خودا کە ئیزافە کراوەتە لای خودا دوو جۆرە: موتڵەق و موقەیەد، گەر مەبەست لێی هاتنی ڕەحمەت یاخود سزای خودا بێت ئەوە تەقیید وتایبەت دەکرێت بەوە، هەروەك لەفەرموودەیەکدا هاتووە: «**حتى جاء الله بالرحمة والخير**»واتە: تاوەکو خودا ڕەحمەت و خێری هێنا، وفەرمایشتی: ﴿وَلَقَدْ جِئْنَٰهُم بِكِتَٰبٍ فَصَّلْنَٰهُ عَلَىٰ عِلْمٍ﴾[الأعراف:٥٢] ، واتە: بێگومان ئێمە لەگەڵ پێغەمبەرەکانماندا نامەیەکی وامان بۆهێنان کە بەزانست و زانیاریی، ڕاست و ناڕاستمان تێیدا لە یەکداوەتەوە.

**جۆری دووەم** : هاتن و مەجیئی موتڵەق ئەمەیان تەنها بۆ هاتنی خودا بەکار دێت، هەروەك لەم فەرمایشتەدا هاتووە : ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِى ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ﴾ [البقرة:٢١٠] ، واتە: ئاخۆ پەیڕەوانی شەیتان بێ لەمە لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە لەسەرووی پەڵە هەورێکی سپیدا بێتە لایان و داوەرییان بکات، وفەرمایشتی: ﴿وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾ [الفجر:٢٢] واتە:وە لەو ڕۆژەدا پەروەردگارت هات بە هاتنێک شیاوی خۆی بێت وە فریشتەکانیش لە گەڵی ڕیز ڕیز، وە هاتنی خوا بۆ بڕیاردان و داوەرییە لە نێوان بەندەکاندا، وە ئەمەش دوای ئەوەی کە خەڵکی داوا دەکەن لە پێغەمبەر تکایان بۆ بکات لە لای خوا.

---

(١) مختصر الصواعق المرسلة (٤٢٧).

# [١٠] ئیسپاتکردنی ڕوخسار بۆ خودا (جل جلاله) :

وفەرمایشتی : ﴿ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ ﴾ [الرحمن: ٢٧] ،واتە: تەنها ڕووی پەروەردگاری خاوەن شکۆو کەرەمکارت دەمێنێتەوە ،﴿ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ ﴿٨٨﴾ ﴾ [القصص : ٨٨] ، واتە: هەموو شتێک تیا دەچێت جگە لە ڕووخساری پیرۆزی ئەو نەبێ.

---

## شەرح

﴿ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ﴾[1] ئەم ئایەتە دوای ئەم ئایەتەی تر هاتووە : ﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴾ خوای پەروەردگار لەم ئایەتە پیرۆزەدا باس لەوە دەکات هەموو خەڵکی سەر زەوی

---

(١) مەزهەبی ئەهلی سونەو جەماعە لەسەر ئەو ڕایەن، کە بەڵێ خـودا (وجه + ڕوخسـار)ی هەیە، ڕوخسارێک کە شایستە بێت بە گەورەیی و شکۆمەندی خودا، بەڵگەش لەسـەر ئەوە قورئـان و سونەتە، بەڵگەی قورئان وەک ئایەتی ﴿ويبقى وجه ربـك ذو الجـلال والإكـرام﴾، وە بەڵـگەی سوونەتیش، فەرموودەی پێغەمبەری خودایە-صلى الله عليه وسلم- کە لە نزایەکیـدا دەفەرمـوێ: «وَأَسْأَلُكَ لَذَّةَ النَّظَرِ إِلَى وَجْهِكَ وَأَسْأَلُكَ الشَّوْقَ إِلَى لِقَائِكَ»،(صحيح ابن حبان، كتاب الصلاة، باب صفة الصلاة، ذكر جواز دعاء المرء في الصلاة بما لـيس في كتـاب الله، حـديث: ١٩٩٥، قال شعيب الأرنأووط: إسناده قوي) واتە: خودایە داوای چێـژی بینینـی ڕوخسـارت دەکەم، وە ئارەزووی گەیشتن بە دیدارت دەکەم. کەوابوو ڕوخساری خـودا لە سـیفاتی زاتـیە بـۆ خـودا بە شێوەیەک کە شایستەی زاتی خۆی بێت، وە درووست نیە لە مانا ئاشکراو ڕوونەکەی خـۆی لا بدرێ، لەبەر ئەم چەند هۆیە:

**یەکەم:** پێچەوانەی ئاشکرای دەقەکانی قورئان و سونەیە، وە هەر شتێکیش پـێچەوانەی ئاشـکرای دەق بێت، ئەوە پێویستی بە بەڵگە هەیەو، بێگومانیش کە بەڵگە نیە.

**دووەم:** ئەو ڕوخسـارەی (وجه) کە لە دەقەکانـدا هـاتووەو پاڵـدراوەتە لای خـودا، کەوابـوو هەر سـیفاتێک کە پاڵـدەدرێتە لای خـودا: یـان ئەوەتە ئەو سـیفاتە پەیوەسـت و جێگیـرە بە خـودی
=

دەڕۆن و دەمرن، هیچ کەسێك جگە لە دەم و چاوی زاتی پیرۆزی الله نەبێت، خوای پەروەردگار نامرێت، بەڵکو زیندوویەکە کە هەرگیز مردنی بەسەردا نایەت. ﴿ذُو ٱلْجَلَٰلِ﴾واتە : خاوەنی ڕێز و عەزەمەت، ﴿وَٱلْإِكْرَامِ﴾واتە: ڕێزگر لەپێغەمبەران و

= ـــــــــــــــــــــــــــــ

خۆیەوە، یان پەیوەست و جێگیر نیە بە خودی خۆیەوە، ئەگەر لەو سیفاتانە بێت کە پەیوەست بێت بە خودی خۆیەوە، ئەوە درووستکراوەو، سیفاتی زاتی الله نیە، وەک: ماڵی خوا، وشتری خودا، جا ئەم جۆرە پاڵدانە لای خودا، یان بۆ ڕێزە، یان لەو بارەوەیە کە دەسەڵاتدارو درووستکراوەکان پاڵیدەدەنە لای خاوەن دەسەڵات و درووستکار، وە ئەگەر ئەو سیفاتە پەیوەست نەبوو بە خودی خۆیەوە، ئەوە لە سیفاتی رب العالمینەو درووستکراو نیە، وەک: زانستی خودا، توانایی خودا، شکۆی خودا، وتەی خودا، دەستی خودا، چاوی خودا..هتد. بێگومان ڕوخساریش یەکێکە لەو سیفاتانە، وە پاڵدانە سیفەتی ڕوخسار بۆلای خودا لە پاڵدانی سیفەتە بۆلای خاوەن سیفەت.

**سێیەم:** پاداشت وەسفێکی درووست کراوەو جیابووەوەیە لەخودا، بەڵام ڕوخسار سیفەتێکی لکاوی هەمیشەیی خودایە، چۆن دەکرێ بەو شێوەیە ماناو واتا بکرێ.؟

**چوارەم:** سیفەتی ڕوخسار وەسفێکە لە دەقەکاندا هاتووە بۆ خودای خاوەن تواناو بە شکۆ، وە ڕوخساری خودا نوورێکی هەیە پەنای پێدەگیردرێ، پرشنگ و درەوشاوەیی ڕوخساری خودا دەسووتێنێ ئەوەندەی چاوو بینینی خودای پێ بگات، کەوابوو ئەم سیفاتانە دەبنە هۆکاری ئەوەی کە نەگونجاو بێت واتای (وجه) بە (ثواب) بکرێت. خواش زاناترە. وەرگیراوە لە کتێبی (تلخیص الحموية: ل: ٦٧)ی شێخ عوسەیمین. بەڕەحمەت بێت. بۆیە ئێمەیش (وجه)مان بە ڕووخسار مانا دایەوەو نەمانتوانی بێگوڕین بە (زات، وجود)ی خودا، وەک هەندێ وای لێ دەکەن، ئیمامی بەیهەقی لە کتێبی (الأسماء والصفات)دا دەڵێت: (باب ما جاء في اثبات الوجه صفة لا من حيث الصورة، لورود خبر الصادق به..) واتە: بەشی ئەوەی هاتووە لە بارەی جێگیربوونی سیفەتی ڕوخسار لەسەر ئەوەی کە سیفەتی خودایە، بە بەڵگەی ڕاست و درووست لەسەری. ئەم ئایەتانەیشی هێناوەتەوە: ٥٥/٢٧، ٢٨/٨٨، ٣٠/٣٩، ٦٧/٩، ١٣/٢٢، ٩٢/٢٠، ٦/٥٢. لەگەڵ هێنانی فەرموودە گەلێکدا کە پێشەوا (بوخاریی و موسلیم) هێناویانە بۆ چەسپاندنی سیفەتی (وجه) بۆ خوای گەورە -جل جلاله- ئومێدەوارم بە وردی بیری لێ بکرێتەوە، وەک ئیمامی بەیهەقیش دەڵێت: دەبێت وەک سیفەتێک سەیر بکرێت، واتە: کاتێ باسی (وجه) دەکرێت نابێ جۆرە ڕووخسارو دەم و چاوێک بێنیتە پێش چاو خۆت، چونکە [ ليس كمثله شيء ] (تەفسیری ڕامان).

بەندە چاکەکانی، ووتراوە: شیاوی ئەوەیە بەدوور بگیردرێت لەهەر شتێك کە شایستە نەبێت بەزاتی پیرۆزی.

هەروەها فەرمایشتی : ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ﴾ ، واتە : هەموو ئەوانەی لەئاسمانەکان و زەویدان دەڕۆن و نامێنن و دەمرن ﴿إِلَّا وَجْهَهُۥ﴾[1] ،وشەی(وجهَه) مەنصوبە بەهۆی

---

(١) تێبینی: (وَجْه) یەکێکە لەو سیفەتانەی زانایانی (سەلەف) دەیدەنە پاڵ زاتی خوای پاک و بێخەوش و کارجوان، هەر وەک ئەویش خۆی لە چەندین ئایەتدا دەیکاتە سیفەت بۆخۆی، بەڵام بەبێ هیچ لێچوواندن و دەستکاریی و، لێکدانەوەیەک کە لەگەڵ زاتی بڵندی ئەودا نەگونجێت، ئێمەش هەر وەک (سەلەف) دەڵێین: (فَنُثْبِتُ لَهُ وَجْهاً كَمَا أَثْبَتَهُ لِنَفْسِه، وأَثْبَتَهُ لَهُ نَبِيُّهُ مِنْ غَيْرِ تَعْطِيْلٍ وَلاَ تَمْثِيْلٍ، وكذاَ فِي سَائِرِ صِفَاتِه نُثْبِتُهَا لَهُ وَلاَنُمَثِّلُهاَ بِصَفاَتِ خَلْقِه، فَهُوَ -جَلَّ وَعَلاَ- لَيْسَ كَمِثْلِه شَيْءٌ لاَ فِي ذَاتِه وَلاَ فِي صِفَاتِه، وَنُمِرُّ جَمِيعَ آيات وَأَحادِيثِ الصِّفَاتِ على ظَاهِرِهَا ولاَ نحَرِّفُهاَ أَوْ نَظُنُّ أَنَّ لهَا مَعنَى يُخَالِفُ مَا دَلَّتْ عَلَيهِ ظَاهِرُهَا، فَظَاهِرُهَا مُرَادٌ)، واتە: بوونی ڕوخسار بۆ خودا دەچەسپێنین، هەروەک خودا بۆ خۆی بوونی چەسپاندووە، وە پێغەمبەرەکەی بۆی چەسپاندووە بەبێ ڕاگرتن یان هاوشێوەییەک بۆ خودا، وە هەروەها سەرجەم سیفاتەکانی دی بۆ خودا دەچەسپێنین بەبێ هاوشێوەیی لەگەڵ سیفاتی درووستکراوەکانی خودادا، چونکە خودا (پاک و بێگەردی بۆ ئەو)، هیچ شتێک وەک ئەو نییە، نە لە زات و نە لە سیفاتدا، وە هەرچی ئایات و فەرموودە هەیە کەباس لە سیفاتی خودا دەکەن، لەسەر ڕووە ئاشکراکەی بۆ خودا دەیچەسپێنین، بەبێ هیچ گۆڕانکارییەک، یان گومان ببەین کە مانایەکی دی هەیە پێچەوانەی ئەوەبێت کە ڕووە ئاشکراکەی مانا دەدات. فەرمووودەیش زۆر زۆرە بۆ سەلماندنی سیفەتی (وەجە) بۆ خوای گەورە، وەک: «..وَأَسْأَلُكَ لَذَّةَ النَّظَرِ إِلَى وَجْهِكَ وَأَسْأَلُكَ الشَّوْقَ إِلَى لِقَائِكَ.. »، واتە: خودایە داوای چێژی بینینی ڕوخسارت دەکەم، وە داوای ئارەزووی دیدارت دەکەم. (صحيح ابن حبان، كتاب الصلاة، باب صفة الصلاة، ذكر جواز دعاء المرء في الصلاة بما ليس في كتاب الله، حديث: ١٩٩٥، وقال شعيب الأرنأووط: إسناده قوي، وصححه الألباني في صحيح الجامع، برقم: ١٣٠١). «لاَ يُسْأَلُ بِوَجْهِ اللهِ، إِلاَّ الْجَنَّةُ». واتە: بە ڕوخساری خودا تەنها بەهەشت داوا دەکرێ. (سنن أبي داود، كتاب الزكاة، باب كراهية المسألة بوجه الله تعالى، حديث: ١٤٣٦، قال الأرنأووط: إسناده ضعيف، لضعف سليمان، وهو ابن قرم بن معاذ التميمي الضبي. وضعفه الألباني في سنن أبي داوود برقم: ١٦٧١). عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قال: «لَمَّا نَزَلَتْ هذِهِ الآيَةُ: قُلْ هو القَادِرُ علَى أَنْ يَبْعَثَ علَيْكُم =

= عَذَابًا من فَوْقِكُمْ، قالَ رَسولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-: أَعُوذُ بِوَجْهِكَ، قالَ: أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ، قالَ -صلى الله عليه وسلم-: أَعُوذُ بِوَجْهِكَ..، أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا ويُذِيقَ بَعْضَكُمْ بَأْسَ بَعْضٍ، قالَ رَسولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-: هذا أهْوَنُ - أوْ هذا أيْسَرُ -.». واتە: جابیر دەڵێ: کاتێک ئەو ئایەتە هاتە خوارێ: ﴿قُلْ هو القَادِرُ علَى أنْ يَبْعَثَ علَيْكُم عَذَابًا مِن فَوْقِكُمْ﴾، پێغەمبەر فەرمووی: پەنا دەگرم بە ڕوخسارت، وە کاتێک ئایەی ﴿أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ﴾هاتە خوارێ، فەرمووی: پەنا دەگرم بە ڕوخسارت، پاشان ئایەی ﴿أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُمْ بَأْسَ بَعْضٍ﴾ هاتە خوارێ، فەرمووی: ئەمەیان ئەهوەنترو ئاسانترە. (صحيح البخاري، كتاب تفسير القرآن، سورة البقرة، باب قوله: قل هو القادر على أن يبعث عليكم، حديث: ٤٣٦١). وە فەرموودەی: «جَنَّتانِ مِن فِضَّةٍ، آنِيَتُهُما وما فِيهِما، وجَنَّتانِ مِن ذَهَبٍ، آنِيَتُهُما وما فِيهِما، وما بيْنَ القَوْمِ وبيْنَ أنْ يَنْظُرُوا إلى رَبِّهِمْ إلَّا رِداءُ الكِبْرِ، علَى وجْهِهِ في جَنَّةِ عَدْنٍ». واتە: دوو بەهەشت لە زیو، کە دەفرو ئەوەی تیایەتی هەر لە زیوە، وە دوو بەهەشت لە ئاڵتوون، کە دەفرو ئەوەی تیایەتی هەر لە ئاڵتوونە، نێوان خەڵک و نێوان بینینی خودا تەنها بەرگی کیبریائە لەسەر ڕوخساری پیرۆزی خوای پەروەردگار لە بەهەشتی بەردەوام. (صحيح البخاري، كتاب تفسير القرآن، سورة البقرة، باب قوله: ومن دونهما جنتان، حديث: ٤٥٩٩، صحيح مسلم، كتاب الإيمان، باب إثبات رؤية المؤمنين في الآخرة ربهم سبحانه وتعالى، حديث: ٢٩١). باختلاف يسير. وە «إنَّ اللَّهَ عزَّوجلَّ لا يَنامُ، ولا يَنْبَغِي له أنْ يَنامَ، يَخْفِضُ القِسْطَ ويَرْفَعُهُ، يُرْفَعُ إلَيْهِ عَمَلُ اللَّيْلِ قَبْلَ عَمَلِ النَّهارِ ، وعَمَلُ النَّهارِ قَبْلَ عَمَلِ اللَّيْلِ، حِجابُهُ النُّورُ، وفي رِوايَةِ أبِي بَكْرٍ: النَّارُ، لو كَشَفَهُ لأَحْرَقَتْ سُبُحاتُ وجْهِهِ ما انْتَهَى إلَيْهِ بَصَرُهُ مِن خَلْقِهِ». واتە: خوای گەورە ناخەوێ، ناگونجێ کە بخەوێ، تەرازو بەرزدەکاتەوەو نزمی دەکاتەوە بە کردەوەی بەندەکان خۆیان، کرداری شەو پێش کرداری ڕۆژ بەرز دەبێتەوە بۆ لای، کرداری ڕۆژیش پێش کرداری شەو، پەردەکەی نوورە ـ لەڕیوایەتێکیشا ـ ئاگرە، ئەگەر ئەو پەردە لابات نووری ڕووخساری هەموو ئەو دروستکراوانە دەسوتێنێ کە بینایی پێی دەگات (واتە: هەموو بوونەوەر). صحيح مسلم، كتاب الإيمان، باب في قوله عليه السلام: إن الله لا ينام، حديث: ٢٨٩. وَمَعْنَى سُبُحَاتُ وَجْهِهِ: (أَيْ: نُورُهُ وَجَلَالُهُ وَبَهَاؤُهُ) واتە: پرشنگ و شەوکەوت و حورمەتی ڕوخساری خودا. جا بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە دەتوانی سەیری: (الأسماء والصفات)ی ئیمامی (البيهقي) و (كتابُ صفَات الله عَزَّوَجَلّ - صالح علي المسند)یش بکەیت. دکتۆر (ئەحمەد الغامیدی) مامۆستای وانەی عەقیدە لە زانکۆی (أمّ القُرَى) لە پەراوێزی (شَرْحُ أُصُول إعْتِقَادِ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ)ی (لالەكائی) بەرگی (٢) ڕووپەڕی (٤٥٧)دا بەسەر ئەو دەستەواژەیەدا، دەڵێ: (سياق ما دل من كتاب الله عزوجل وسنة رسوله -صلى الله عليه وسلم- على أن من صفات الله عزوجل الوجه =

=

والعينين واليدين)، وە هەروەها دەڵێ: (هذا المبحث من الصفات يسميه أهل الكلام -الصفات السمعية- أي أنها تثبت بالسمع فقط، بخلاف الصفات السابقة، فإنها تثبت بالسمع والعقل، وفي هذه الصفات -كباقي الصفات المتقدمة ثلاثة مذاهب: الأول: مذهب أهل السنة والجماعة وهو إثباتها لله عزوجل من غير تمثيل ولا تشبيه، الثاني: مذهب الجهمية والمعتزلة والأشاعرة: أولوها، فقالوا المراد بالوجه، الذات، وبالعين: العلم، وباليد: النعمة..الخ). الثالث: مذهب المشبهة الذين شبهوا صفاته -عزوجل- بصفات خلقه، وكلا المذهبين الأخيرين خاطىء، فقد أتى أصحابهما من قبل ظنهما للمشابهة بين صفات الله وصفات خلقه، فأما المؤولون فأدى بهم ذلك الظن إلى التأويل لئلا يقع التشابه بين الله وخلقه. وأما المشبهة فقد ظنوا أن إتفاق الصفات في الأسماء يستلزم إتفاقهما في المسميات وهذا ظن ضال. والمؤولون فقد أثبت كل منهم لله عزوجل صفة أو إسما يشترك في بعضها المخلوقون مع الله عزوجل، فالمعتزلة أثبتت لله أسماء منها: العالم، والقادر ونحوها. والأشاعرة أثبتوا لله عزوجل سبع صفات هي: العلم، والحياة، والقدرة..الخ. والجميع -بما فيهم الجهمية- يثبتون لله عزوجل (ذاتا) وهذه جميعها توجد في المخلوقين، فكيف يوهم بعض الوارد في الخبر التشبيه، ولا يوهم البعض الآخر ذلك؟. ولو أنهم قالوا: كما أن لله ذاتا لا تشبه الذوات فكذلك لله صفات لا تشبه الصفات لانتهت المشكلة وسلموا من الشذوذ والإختلاف مع سلف الأمة). واتاکەی بەکورتی: ئەوەی لە قورئان و فەرموودەوە وەردەگیردرێ ئەوەیە: کە لە سیفاتەکانی خوای گەورەیە (ڕوخسارو هەردوو چاوو هەردوو دەست)، وە ئەم بابەتە زانایانی ئەهلی کەلام بە «سیفاتی بیستن» ناویان هێناوە، بەپێچەوانەی سیفاتەکانی دی خوای گەورە، کە بە بیستن و عەقڵ جێگیر دەبن. وە لەو سیفاتانەش وەک باقی سیفاتەکانی دی سێ بۆچوون و پەیڕەو هەیە:

**یەکەم:** مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەماعەیە کە ئەم سیفاتانە بۆ خودا جێگیر دەکەن، بەبێ هیچ جۆرە هاوشێوەکردن و لێکچواندنێک.

**دووەم:** مەزهەبی (جەهمیەو موعتەزیلەو ئەشاعیرە)یە، یەکەمیان دەڵێن: مەبەست بە (**وجه**) زاتە، وە مەبەست بە (**العين**) زانیاریە، وە بە(**اليد**) بەخشە.

**سێیەم:** مەزهەبی ئەوانەیە کە سیفاتەکانی خودا دەچوێنن بە سیفاتی درووستکراوەکانی خوداوە. وە هەردوو پەیڕەو مەزهەبەکانی کۆتایی هەڵەن، چونکە هەردوو مەزهەبەکە بە گومانی خۆیان هاتوون سیفاتی خوداو سیفاتی درووستکراوەکانی خودا بە یەک بچوێنن، وە ئەوانەش کە تەئویل و لە مانای ڕاستی سیفاتەکانی خودا لا دەدەن، گوایە مەبەستیان ئەوەیە کە بەرگری لەوە دەکەن هیچ جۆرە لێکچواندنێک ڕوو نەدات لە نێوان سیفاتی خوداو درووستکراوەکانیدا. وە ئەوانەی کە لێکچواندن دەکەن گومانیان وایە کە ڕێکەوتنی سیفات لەگەڵ ناوەکاندا، وا داوا

=

ئەوەی حاڵەتی ئیعرابیەکەی ئیستیسنا(استثناء)ـە و جودا کراوەتەوە، ئەمەش هەواڵدانە لەبارەی ئەوەی خودا هەر دەمێنێتەوە و بەپێچەوانەی دروستکراوەکان کە هەمووی دەبێت بمرێت.

✍ **مەوزوعی شاهید لەم ئایەتەدا:**

لەم دوو ئایەتەدا ئیسپاتی ڕوخسار کراوە بۆ خودا و، ڕوخسار یەکێکە لەسیفەتە زاتییەکان، و ڕوخسار و دەم وچاوێکی هەقیقیە و بەو شێوەیەیی کە شایستە و گونجاوە بەزاتی الله ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ﴾، نەك بەو شێوەیەیی کە موعەتتیلەکان ئەوانەی سیفاتەکانی خودا تەعتیل دەکەن و دەڵێن مەبەست لە ڕوخسار **(الوجه)** ڕوخساری هەقیقی نییە، بەڵکو مەبەست لێی زاتە یاخود پاداشت وجگە لەمانەش، ئەم تەئویلانە هەڵە و باتڵن لەبەر چەند هۆیەك[1]:

لەوانە: لەفەرموودەیەکدا عەتفی ڕوخسار **(الوجه)** کراوەتە سەر زات، هەروەك دەفەرموێت : «**أعوذ بالله العظيم وبوجهه الكريم**»[2]،واتە: پەنا دەگرم بەخودای مەزن

---

دەکات کە ڕێککەوتن ببێت لە ناو براوەکاندا، ئەمەش گومڕاییەکی تەواوە. ئەوانەش کە تەئویل و لە مانای ڕاستی سیفاتەکان لا دەدەن سیفات و ناوانێک بۆ خودا جێگیر دەکەن کە هاوتاو بەشدارن لە سیفات و ناوانێکی درووستکراوەکانی خوای گەورەدا. موعتەزیلەش ناوانێکی بۆ خودا جێگیر کردووە، وەک: زانا، بەتوانا، ناوانی تریش. ئەشاعیرەکانیش (٧) حەوت سیفات بۆ خودا جێگیر دەکەن، ئەوانیش: زانیاری، ژیان، تواناو دەسەڵات.. تا کۆتایی. هەموو ئەم تاقمانە بە جەهمییەکانیشەوە بۆ خودا «زاتێک» جێگیر دەکەن کە سەرجەم ئەو سیفاتانە لەناو درووستکراوەکانی خوداشدا هەن.. بەڵام ئەگەر لە ڕاستیدا ئەوانە بیان گوتایە: خودا زاتێکی هەیە کە لە هیچ زاتێک ناچێت، یان خودا خاوەنی چەند سیفاتێکە کە لە هیچ سیفاتێکی درووستکراوەکانی ناچێت، ئەوا کێشەکە چارەسەر دەبوو، وە لەو هەموو لادان و ناکۆکییەکە ڕزگاریان دەبوو. (**تەفسیری ڕامان**).

(١) مختصر الصواعق المرسلة (٣٣٩- ٣٨٦).

(٢) أخرجه أبو داود (٤٦٦) من حديث عبدالله بن عمرو، وإسناده صحيح.

و ڕوخساری ڕێزداری. وعەتفیش بۆ موغایەرەو جودا کاری دێت، واتە: کاتێ عەتفی ڕوخسار کراوەتە سەر زات کەواتە زات و ڕوخسار یەك شت نین .

هەروەها : لەجێگەیەکی تردا ڕوخساری ئیزافە کردووەتە پاڵ زات و فەرموویەتی : ﴿ وَجْهُ رَبِّكَ ﴾ ڕوخساری پەروەردگارت ، ووەسفی ڕوخساری کردووە بە : ﴿ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴾ خۆ ئەگەر ڕوخسار(**الوجه**)زات بوایە ئەوا لەفزی(**الوجه**)لەئایەتەکەدا دەبووە(**صلة**)، ودەیفەرموو: (**ذي الجلال والإكرام**)، جا کاتێ فەرمووی: ﴿ذُو ٱلْجَلَٰلِ﴾ دەرکەوت کە وشەی ﴿ذُو ٱلْجَلَٰلِ﴾ وەسفی دەم وچاوە نەک زات ودەم وچاویش سیفەتی زاتە .

بەڵگەیەکی تریش : لەزمانی هیچ گەلێك لەگەلاندا نەزانراوە دەم وچاوی شتێك بەمانای زاتی شتەکە بێت یاخود بەمانای پاداشت بێت، و(**الوجه**) لەڕووی زمانەوانییەوە[١]: ڕووی پێشەوەی هەموو شتێکە؛ چونکە یەکەم شتێکە کە مواجەهەی کەسی بەرانبەری پێ دەکرێت، و ڕوخسار لەهەر شتێکدا بەگوێرەی ئەوەیە کە ئیزافە دەکرێتە لای.

⁂

(١) مختصر الصواعق المرسلة (٣٨٨).

## [١١] ئیسپاتکردنی دوو دەست بۆ خوای پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا:

**وفەرمایشتی: ﴿مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ ﴿٧٥﴾﴾ [ص: ٧٥] ،واتە:چی ڕێی لە تۆ گرت کڕنووش بەری بۆ ئەوەی کە بە دوو دەستەی خۆم دروستم کردووە؟ ، وفەرمایشتی:﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا۟ بِمَا قَالُوا۟ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ ﴿٦٤﴾﴾ [المائدة : ٦٤] ، واتە: یەهودیی نەفام و نەزان گوتی: خوا دەستی زنجیرکراوەو بەستراوە، بۆیە وا ڕژدو چروکەو، ڕزق و ڕۆزیی بە بەندەکانی خۆی نادا! دەک دەستی ئەوان کەلەبچەو ئیفلیج بێ و، شەلەل لێی بداو، هەر ئەوانیشن ڕژدو چرووکن، وە لەبەر ئەو قسەشیان نەفرینی خوایان لێکرا، بۆیە بەردەوام چرووك و بەخیلن، نەخێر دەستی خوا نەبەستراوە، وەکو ئەوان دەڵێن، بەڵکو هەردوو دەستی خوا هەمیشەو بەردەوام والاو گوشادن، هەرچۆنێک خۆی بیەوێ، دەیبەخشێ.**

---

### شەرح

﴿مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ﴾ واتە: چی وای لێکردی سەژدە نەبەیت، ئەم قسەیە ڕوو لەشەیتانە (نەفرەتی خوای لێ بێت) ئەوەش کاتێ کە بەهەرهەڵستی فرمانی خوای کرد و سەژدەی بۆ ئادەم (علیه السلام)نەبرد، واتە: چ شتێك وای لێکردی سەژدە نەبەیت، ﴿لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾،واتە: بۆ ئەوکەسەی کە ڕاستەوخۆ بەدوو دەستی خۆم دروستم کرد بەبێ هیچ واستەیەك، ئەمەش وەك ڕێز و حورمەتێك بۆ ئادەم.

فەرمایشتی : ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ﴾واتە: جولەکەکان گوتیان، جا ئەسڵی وشەی(**اليهود**) لەوقسەیەیانەوە هاتووە : ﴿هُدْنَآ إِلَيْكَ﴾وئەم ناوە مەدح و وەسف بوو پاشان دوای نەسخ بوونەوەی شەریعەتەکەیان بوو بەناویان، هەرچەند مانای

مەدحشی تێدا نەبێت، ووتراوە: ئەو ناوەیان لێنراوە وەك نیسبەتێك بۆلای یەهودی کوڕی یەعقوب (علیه السلام) .

﴿يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌۚ﴾واتە: دەستی خودا نوقاوە، لێرەدا خوای پەروەردگار باسی جولەکەکان دەکات بەوەی وەسفی خودایان دەکرد بەڕەزیل و چروك، هەروەک وەسفیان دەکرد بەهەژار ودەیانگوت خودا هەژارە و ئێمە دەوڵەمەندین، نەک مەبەستیان ئەوە بێت دەستی خودا بەستراوەتەوە، بەڵکو مەبەستیان ئەوەبوو بڵێن خودا دەست نوقاو و ڕەزیلە.

﴿غُلَّتۡ أَيۡدِيهِمۡ﴾واتە: دەستی خۆیان نوقاوە، ئەمە وڵامی خودایە بۆیان لەبەرانبەر ئەو درۆ و قسە پوچەی کە بەرانبەر خودا کردیان، فیعلەن واش بوون، جولەکە زۆر ڕەیل و چروکن و هیچ جولەکەیەک نابینی ئیللا زۆر بەخیل و ڕەزیل و دەست نوقاوە ، ﴿وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْ﴾ ئەم برگەیە مەعتوفە لەسەر پێش خۆی و بائەکە بۆ سەبەبییە، واتە: دوور خرانەوە لەڕەحمەتی خودا بەهۆی ئەو قسەیانەوە .

پاشان خوای پەروەردگار وڵامێکی تریان دەداتەوە و دەفەرمووێت: ﴿بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ﴾،واتە: نا بەڵکو دەستی خودا کراوەیە و زۆر سەخی و دەستبڵاوە، ودەستەکانی کراوەیە، ﴿يُنفِقُ كَيۡفَ يَشَآءُۚ﴾دەبەخشێت هەرچۆنێك بیەوێت، ئەمە جوملەیەکی تازەیە و تەئکید لەسەخیەتی و دەست بڵاوی خودا دەکات لەبەخشیندا. بەخشینی خودا بەو شێوەیەیە کە ویستی لەسەرە، گەر ویستی لێبێت زۆری دەکات و، گەر ویستی لەسەر بێت کەمی دەکاتەوە، خوای پەروەردگار بەخشەر و گرەوەیە (**الباسط والقابض**) بەو شێوەیەیی کە حیکمەت ودانایی دەیخوازێت .

**✍ شایەتحاڵ لەم دوو ئایەتە پیرۆزەدا:**

ئەم دوو ئایەتە ئیسپاتی دوو دەستی تێدایە بۆ خودا جل جلالە، ئەو دوو دەستە دوو دەستی هەقیقین بەو شێوەیەیی کە شایستەی گەورەیی و عەزەمەتی زاتی خودان و هاوشێوەی دەستی مەخلوقات نین، (لیس كَمِثْلِه شيَ)، لەمەشدا ڕەدی ئەو کەسانە هەیە کە نەفی دوو دەستی هەقیقی دەکەن لەخودا و، دەڵێن: مەبەست لەدەست قودرەتە یاخود نیعمەتە، ئەمە تەئویلێکی باتڵە و تەحریف کردنی قورئانە . مەبەست لێی دەستی زاتە نەك دەستی قودرەت و نیعمەت[1]، خۆ ئەگەر مەبەست بەدەست قودرەت بوایە - وەك ئەوەی ئەوان دەیڵێن - ئەوا تایبەتمەندی ئادەم بەوەی خودا بەدوو دەستی خۆی دروستی کردووە بەتاڵ دەبووەوە و هیچ بەهایەکی نەدەما، هەرچی دروستکراوەکان هەیە بەشەیتانیشەوە بەقودرەتی خودا دروست بوون، دەی ئەگەر وا بوایە چ تایبەتمەندیەك دەما بۆ ئادەم بەسەر شەیتانەوە کاتێ خودا دەفەرموێت : ﴿لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾،بۆ ئەوەی کە بەدوو دەستی خۆم دروستم کرد، لەو حاڵەتەدا دەکرا شەیتانیش بڵێت: منتیش بەدەستت دروست کردووە گەر مەبەست بەدەست قودرەت بوایە، هەروەها گەر مەبەست لە دەست قودرەت بێت ئەوا وا دەخوازێت خودا دوو قودرەتی هەبێت و موسوڵمانان کۆ دەنگن لەسەر باتڵی ئەوە، هەروەها گەر مەبەست لەدەست نیعمەت بوایە ئەوا ماناکەی وای لێدەهات بەوەی خودا ئادەمی بەدوو نیعمەت دروست کردووە ، ئەمەش باتڵ و نەگونجاوە؛ چونکە نیعمەتی خودا زۆر زۆرە و لەئەژمار نایەت و تەنها دوو نیعمەت نییە.

❧❧❧

(١) مختصر صواعق المرسلة (٣٧٠).

## [١٢] ئیسپاتکردنی دوو چاو بۆ خودا(جل جلاله):

وفەرمایشتی : ﴿ وَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ﴿٤٨﴾ ﴾ [الطور : ٤٨] ، واتە: خۆگربە لە بەرامبەر بە جێهێنانی بڕیارەکانی پەروەردگارتەوە ئەی موحەممەد! -صلی الله علیه وسلم- بە وێڵکردنیان، چونکە بەڕاستی تۆ لەبەر چاودێری ئێمە دایت، فێڵیان زیانت لیٚ نادات،﴿ وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ ﴿١٣﴾ تَجْرِى بِأَعْيُنِنَا جَزَآءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ ﴿١٤﴾ ﴾ [القمر: ١٣، ١٤] ،واتە: نوحیشمان لەسەر چەند تەختەو بزمارێک -کەشتییەکی سادە- هەڵگرت، بە چاودێری ئێمە دەچوو و نەمانهێشت نقوم بیٚ، ﴿ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّى وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِىٓ ﴿٣٩﴾ ﴾ [طه : ٣٩]، واتە: خۆشەویستی خۆمم بەتۆدا، بە شێوەیەک کە هەرکەسیٚ تۆی دیتبا خۆشتی ئەویست، وە تا لە پێش چاو خۆشمدا گەورە بیت و پەروەردە بکرێیت .

شەرح

﴿ وَٱصْبِرْ ﴾ وشەی (الصبر) لەڕووی زمانەوانیەوە بەمانای بەندکردن و ڕێگری کردن (الحبس والمنع)دێت و، بریتیە لەڕێگری کردن لەدەروون لەوەی توشی شۆك بێت و ناڕازی بێت، هەروەها ڕێگری کردنە لەزمان لەوەی ناڕەزایی دەربڕێت و شکایەت بکات و، ڕێگری کردنە لە ئەندامەکانی جەستە لەکاری ناشەرعی هاوشێوەی لە ڕوومەتدان وسنگ دادڕین(١)، ﴿لِحُكْمِ رَبِّكَ﴾،واتە : بۆ قەزای کەونی و شەرعی خودا ﴿فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا﴾واتە : لەبەرچاوی ئێمە و ژێر چاودێری ئێمەدایت،

(١) عدة الصابرين لابن القيم (٣٣).

بۆیە گوێ بەئازار و ئەزیەتی بێباوەڕان مەدە، ئەوان دەستیان ناگاتە تۆ و ناتوانن زیانت پێ بگەیەنن .

هەروەها فەرمایشتی: ﴿وَحَمَلْنَٰهُ﴾واتە : نوحمان هەڵگرد(علیه السلام) ﴿عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ ﴾واتە : لەسەر کەشتیەک کە دارەکانی پان و بەرین بوو و، بەبزمار توند ئەملا و ئەولاکەی بەسترابوو، وموفرەدی (دسر) : دسار . ﴿تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا﴾واتە : لەژێر چاودرێری ئێمەدا ڕێدەکات و ئێمە پارێزگاری لێ دەکەین ﴿جَزَآءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ﴾واتە : لە ناو ئاودا نقومکران لەبەر کوفرو بێباوەڕییان بە نوح (علیه السلام).

هەروەها فەرمایشتی: ﴿وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي﴾قسەکە ڕووی لەموسایە (علیه السلام)، واتە: خۆشەویستی خۆم پێداوی و خۆشەویستم کردووی لای دروستکراوەکانم.

﴿وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِيٓ﴾،واتە : و بۆ ئەوەی گەورە و پەروەردە بیت لەژێر چاوێری و پاراستنی مندا؛ دەتبینم و دەتپارێزم .

**ئەوەی تێبینی دەکرێت لەم ئایەتانەدا:**

ئەم ئایەتانە ئیسپاتکردنی دوو چاوی هەقیقی لەخۆ گرتووە بۆ زاتی الله بەو شێوەیەی کە شایستە و گونجاوە لەگەڵ زاتی بەرز و پیرۆزیدا .

جا قورئان لەفزی چاو(**العین**)ـی هێناوە بەئیزافە کراوی وهەندێ جار بەتاك و هەندێ جاریش بەکۆ و، لەسونەتدا بەئێزافەکراوی و بەجووت هاتووە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «**إن ربكم ليس بأعور**» [1]،واتە: پەروەردگاری ئێوە چاوێکی کوێر نییە. ئەمەش بەڵگەیەکی ڕاشکاوە بەوەی مەبەست لێی ئیسپاتکردنی یەک چاو نییە؛

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٧١٢٧) ومسلم (١٦٩).

چونكە ئیسپاتكردنی یەك چاو دانانە بەوەی خودا(یەك چاوی)، هەیە (تعالى الله عنه).

وزمانی عەرەب هەندێ جار موزافی بەتاك هێناوە و هەندێ جاریش بەجووت و هەندێ جار بە كۆ بەگوێرەی حاڵەتەكانی (مضاف إليه)، جا كاتێ وشەیەكی تاكیان ئیزافە كردبێت بۆلای تاكێكی تر ئەوا بەتاک دەیهێنن، وئەگەر ئیزافەی بكەنە لای كۆ یاخود نادیارێك ئەوا باشتر وایە بەكۆ بهێندرێت لەبەر لەفزەكە، هاوشێوەی ئەم فەرمایشتەی خودا: ﴿تَجۡرِي بِأَعۡيُنِنَا﴾،واتە: لەژێر چاودێری چاوەكانی ئێمەدا ڕێدەكات ، وفەرمایشتی : ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا خَلَقۡنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتۡ أَيۡدِينَآ أَنۡعَٰمٗا﴾ [يس:٧١] ، واتە: ئایا نەیازانیوە كە ئێمە وشترو مەڕو بزن و گامان بۆ بەدەستەكانمان دروستكردوون، وكاتێ ئیزافەیان كردبێت بۆلای وشەیەكی جووت ئەوا تەواتر لەزمانی ئەواندا وایە كە بەكۆ بیهێنن، وەك ئەم فەرمایشتە : ﴿فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَا﴾ [التحريم:٤] ، وەك دیارە لێرەدا وشەی (**كُما**) جووتە بەڵام وشەی (**قلوب**)بەكۆ هاتووە ، لەكاتێكدا دوو دڵە نەک كۆمەڵە دڵێك، بۆیە با كەسی گوێگر ئەوەی لێ تێک نەچێت كاتێ كەسێك دەڵێت بەچاوەكانمان دەتبینین و بەدەستەكانمان دەتگرین، هەرچەند هیچ كەسێك لەسەر ڕووی زەویدا گومانی بۆ چەند چاوێكی زۆر ناچێت . والله أعلم .



بیستن بینین

## [١٣] ئیسپاتکردنی گوێ و چاو بۆ خودا (جل جلاله) [(١)]:

وفەرمایشتی : ﴿ قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَـٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ۝١ ﴾ [المجادلة: ١] ، واتە:بێگومان خوا قسەی ئەو ژنەیە بیست گفتوگۆی لەگەڵ تۆ کرد (ئەی موحەممەد! - ﷺ-) لە بارەی مێردەکەیەوە، و سکاڵای بۆلای خوا دەبرد بۆ چارەسەر لە کاتێکدا خواش گوێی لە گفتوگۆکەی هەردووکتانەوە بوو، بەڕاستیی خوا خوایەکی بیسەری ئەو پاڕانەوەو وتوو وێژەی ئەوانە، بە کردو کرداریشیان بینایە، وفەرمایشتی : ﴿ لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۝١٨١ ﴾ [آل عمران : ١٨١] ،واتە:بێگومان خوا وتەی ئەوکەسانەی بیست کە وتیان: خوا هەژارەو، ئێمە داراو دەوڵەمەندین ، ﴿ أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُم ۚ بَلَىٰ وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ ۝٨٠ ﴾ [الزخرف: ٨٠] ، واتە: بەڵکو پێیان وایە کە ئێمە نهێنیی و سرتەو چپەیان نا بیستین؟! بەڵێ چاک ئەبیستین و فریشتە نێراوەکانیشمان وان لەلایان و کاروکردەشیان دەنووسن ، وفەرمایشتی : ﴿ إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ۝٤٦ ﴾ [طه: ٤٦] ، واتە: بەڕاستیی من لەگەڵ ئێوەم، هەموو شتێک دەبیستم و هەموو شتێکیش دەبینم، وفەرمایشتی : ﴿ أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ۝١٤ ﴾ [العلق : ١٤] ، واتە: ئایا (ئەبوجەهل) نەیزانیوە کە بەراستی خوا دەیبینێ و ئاگای لێیەتی؟ جا ئەگەر ئەو بۆخۆی ئەو هەستەی بووبا ئەوەندە لاسار نە دەبوو .

﴿ ٱلَّذِي يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ۝٢١٨ وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّـٰجِدِينَ ۝٢١٩ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ۝٢٢٠ ﴾

بیستن بینین

---

(١) تێبینی: ئەم ناونیشانە، واتە: ناونیشانی ئیسپاتکردنی گوێ وچاو بۆ خودا (جل جلاله) لەلاپەڕە حەفتاو چوار(٧٤)یشدا هاتووە..بۆیە من دوو بارە لێرەشدا هێنام چونکە لەئەسڵی کتێبەکەشدا کە وەرم گێڕاوە هەمان شتە و لەوێش دووبارە بۆتەوە.

[الشعراء: ٢١٨ - ٢٢٠]، **واتە:ئەو خوایەی کە تۆ دەبینێ کاتێ بە ئێوارە ئەوەستی بۆ نوێژ بە کۆمەڵ، وەیان بەتەنها لە شەوگاردا. هەڵس وکەوتت لەناو ڕیزی سوژدە بەراندا دەبینێ، واتە: ئەگەر هەر خۆت بیت، یان لەگەڵ کۆمەڵێکدا بیت، ئەو هەر ئەتبینێ و، چاوی لێتەوەیە. بەڕاستیی هەر ئەویشە زۆر ژنەوا، هەموو چپەیەک دەبیستێ، زۆریش بە ئاگاو زانایە، بە هەموو جموجوڵێکیان.** ﴿ وَقُلِ ٱعْمَلُوا۟ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾ [التوبة : ١٠٥] **واتە: ئەی پێغەمبەر! بەهەموو ئەوخەڵکە بڵێ: کاری خۆتان بکەن، بێگومانبن کە خوای گەورەو، پێغەمبەرەکەیی و، موسڵمانان بەرهەمی کردەوەکانتان دەبینن، واتە: هەر شتێ بکەن خوا پێغەمبەرو ئیماندارانی لێ بەئاگا دەکات، هەر چەند بەدزیی و بەنهێنیش بیکەن.**

---

## شەرح

﴿ قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى ﴾واتە: بەتەئکید خودا قسەی ئەو کەسەی بیست - کە ئەویش خەولەی کچی سەعلەبە بوو ، ﴿ تُجَٰدِلُكَ ﴾واتە: ئەی پێغەمبەر خودا گوێبیستی ئەو ئافرەتە بوو کە هاتبووە لات لەبارەی مێردەکەیەوە قسەی بۆ دەکردی، ﴿فِى زَوْجِهَا ﴾ کەئەویش ئەوسی کوڕی صامت بوو، ئەوەش کاتێ هات مێردەکەی زیهاری کرد[1] ﴿وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾ ئەم بڕگەیە مەعطوفە لەسەر بڕگەی﴿ تُجَٰدِلُكَ ﴾ ، ئەوەش کاتێ بوو کە هەرکات پێغەمبەر ﷺ پێی بفەرمووایە : «**قد حرمت عليه**»واتە: حەرام بوویتە لەسەری. ئافرەتەکەش دەیگوت: سوێند بەخوا ناوی تەڵاقی نەهێناوە،

---

(١) **زیهار** : بریتیە لەوەی پیاو بەخێزانەکەی بڵێت پشتی تۆ وەك پشتی دایکمە، واتە: وەکـو دایکـم لێم حەرام بیت.

پاشان دەیگوت: نزای خۆم و ئازارەکەم و تەنهاییەکەم دەبەمە لای خودا، منداڵی بچووکم هەیە گەر بیدەمە ئەو لەنێو دەچن و، ئەگەر بیانهێنمە لای خۆم برسی دەبن و، سەری بڵند دەکرد بۆ ئاسمان و دەیگوت : «**اللهم إني أشكو إليك**»[1] ، واتە: خودایە شکایەتی حاڵم دێنمە لای تۆ .

﴿وَٱللَّهُ يَسۡمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ﴾واتە : خودا گوێبیستی گفتوگۆکەتان بوو، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ﴾،خودا بیسەرو بینایە، گوێی لەهەموو جۆرە دەنگێکە و هەموو دروستکراوەکان دەبینێت، لەوانە ئەوەی ئەو ئافرەتە گفتوگۆی لەبارەوە لەگەڵ کردی.

هەروەها فەرمایشتی : ﴿لَّقَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٞ وَنَحۡنُ أَغۡنِيَآءُ﴾،واتە: خودا گوێبیستی ئەوانە بوو کە گوتیان خودا هەژارە و ئێمە دەوڵەمەندین. ئەوانەی ئەم قسەیەیان کرد کۆمەڵێک لەجولەکەکان بوون ئەوەش کاتێ بوو کە خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا﴾ الآية [البقرة: ٢٤٥]،واتە: کێ ماڵی خۆی بە قەرز دەدا بەخوا، لەپێناوی سەرخستنی دینی خوادا، بەخشینێکی چاک و پاک و، بەدڵ و دەروونێکی پڕ لەسۆزەوە..؟.

ئەو قسەیەیان کرد وەك فریودانی کەسە لاواز و نەزانەکانیان، نەك باوەڕیان بەو شێوەیە بێت ؛ چونکە ئەوان ئەهلی کیتاب بوون، ئەو قسەیەیان کرد بۆ ئەوەی گومان دروست بکەن لەسەر ئاینی ئیسلام، وە فەرمایشتی: ﴿ أَمۡ يَحۡسَبُونَ أَنَّا لَا نَسۡمَعُ سِرَّهُمۡ﴾،واتە: وا گومان دەبەن ئێمە گوێمان لەوە نییە کە لەدڵی خۆیاندا شاردوویانەتەوە یاخود بەنهێنی و لەجێگایەکی چۆڵدا دەیڵێن ﴿وَنَجۡوَىٰهُم﴾، واتە : ئەوەی لەنێوان خۆیاندا بەنهێنی قسەی لەبارەوە دەکەن، و(**النجوى**): ئەوەیە کە مرۆڤ

---

(١) رواه البخاري في كتاب التوحيد، باب قول الله تعالى( وكان الله سميعا بصيرا)، والنسائي (٣٤٦٠)، وابن ماجة (١٨٨).

لەگەڵ هاوڕێکەیدا گفتوگۆ دەکات و لەکەسانی تری دەشارێتەوە، ﴿ بَلَىٰ﴾ بەڵێ گوێمان لێوەیە و ئاگاداریتاین، ﴿وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ﴾ واتە : فریشتەکانمان ئەوانەی کردەوەکان تۆمار دەکەن هەرچیەك بڵێن تۆماری دەکەن جا قسە بێت یاخود کردار .

هەروەها فەرمایشتی: ﴿ إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ﴾ خوای پەروەردگار بەموسا و براکەی هارون (علیهما السلام) ـ کاتێ ناردنی بۆ لای فیرعەون ـ فەرموو : ﴿ إِنَّنِي مَعَكُمَآ﴾ واتە : بەپاراستن و چاودێری و سەرخستن لەگەڵتانم، ﴿أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ﴾واتە : گوێم لەقسەکانتان دەبێت هەروەها قسەی دوژمنەکانتانیش، وجێگاکەتان دەبینم و، ئەوەی لەنێوان ئێوە و ئەواندا ڕوو دەدات . ئا ئەمە هۆکاری ئەم فەرمایشتەیەتی (لَا تَخَافَا)مەترسن.

هەروەها فەرمایشتی : ﴿أَلَمْ يَعْلَم﴾ ئایە نازانێ؟! ئەبو جەهل کاتێ کە ڕێگری کرد لەپێغەمبەر ﷺ لەوەی نوێژ بکات﴿ بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ﴾واتە : ئایا نازانێ خودا دەیبینێت و گوێی لەقسەکانیەتی و، توندتریت سزای دەدات لەسەر ئەو کارەی، جا پرسیارەکە لێرەدا بۆ ترساندن و نکۆڵی کردن و سەرزەنشت کردنە .

هەروەها فەرمایشتی : ﴿ٱلَّذِى يَرَىٰكَ ﴾ واتە : دەتبینێت ﴿ حِينَ تَقُومُ ﴾ کاتێ هەڵدەستی بەتەنها بۆ نوێژ ﴿ وَتَقَلُّبَكَ فِى ٱلسَّـٰجِدِينَ﴾ واتە : دەتبینێت کاتێ کە بەجەماعەت نوێژ دەکەیت و ڕکوع دەبەیت و سەژدە دەبەیت و بەپێوە ڕادەوەستیت ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ﴾ خودا بیسەری ئەوەیە کە دەیڵێیت ﴿ٱلْعَلِيمُ ﴾ زانا و ئاگاداریەتی .

هەروەها فەرمایشتی: ﴿ وَقُلِ ٱعْمَلُواْ ﴾ واتە : ئەی موحەممەد بەو مونافیقانە بڵێ : بەدڵی خۆتان ئەوەی دەتانەوێت بیکەن و بەردەوام بن لەسەر ئەو ناهەقیەیی کە

لەسەرین و، وا گومان نەبەن ئەوە شاراوەیە ﴿فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ ، واتە : کردەوەکانتان بۆ خەڵک ئاشکرا دەبێت و لەدونیادا دەبینرێت، ﴿وَسَتُرَدُّونَ﴾ ودوای مردن ﴿إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ دەگەڕێنەوە بۆلای زانای غەیب و شتە نادیارەکان و پاداشتان دەداتەوە لەسەر ئەوە .

**✍ شایەتحاڵ لەم ئایەتە پیرۆزەدا:**

لەم ئایەتانەدا وەسفی خودا کراوە بە سیفەتی گوێ و چاو(**السمع والبصر**)، وخودا بەهەقیقی گوێ بیست دەبێت و شت دەبینێت بەو شێوەیەی کە شایستەی زاتی ئەوە، پاک و بێگەردە و دوور لە لێکچوون بە سیفاتی دروستکراوەکان، ئایەتەکان ئاشکراو سەریحن لەئیسپاتکرنی چاو وگوێ بەشێویەك تێیدا ئیسپاتکردنی گوێ(**السمع**) هاتووە بۆ خودا بەلەفزی (**الماضي والمضارع واسم الفاعل**) بەشێوەی (**سمع ويسمع وسميع**). ولەزمانی عەرەبیدا ناتوانرێت بەشتێک بوترێت : ئەو بیسەر و بینایە (**هو سميع بصير**) ئیللا ئەو شتە گوێی لەشت دەبێت و دەبینێت، ئا ئەمە ئەسڵە، بۆیە ناوترێت : (**جبل سميع بصير**) واتە: کێوێکی بیسەر و بینەر ؛ چونکە ئەوە ئەستەمە مەگەر بۆ کەسێك نەبێت ببیستێ و ببینێ .



## [١٤] ئیسپاتکردنی پیلان و تەڵەکە بۆ خودا بەو شێوەیەی کە شایستە و گونجاوە لەگەڵ زاتی (الله) دا :

وفەرمایشتی:﴿ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلْمِحَالِ ﴿١٣﴾ ﴾ [الرعد : ١٣] ، واتە: و ئەو زاتە بۆخۆی توندگیرە ، وفەرمایشتی:﴿ وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ ٱللَّهُ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾ [آل عمران : ٥٤] ،واتە:لەولایشەوە دوژمنانی دینی خوا پیلانیاندانا بۆکوشتنی عیسا! بەڵام خوا پیلان و فڕوفێڵەکەیانی پوچەڵ کردەوەو، بەربوونە گیانی ئەوکەسە ناردبوویان بۆ کوشتنی عیساو ئەویان کوشت، بێگومانبن خوا باشتر چارەکارە بۆ هەڵوەشانەوەی فێڵ و پیلانەکانیان ، وفەرمایشتی:﴿ وَمَكَرُواْ مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾ [النمل: ٥٠] ، واتە: ئەو تاوانبارانە فرت و فێڵێکیان ئەنجامدا بۆ کوشتنی صالح، ئێمەش پلانێکمان سازاند، واتە: ئێمەش نەخشەیەکی گرنگمان دارِشت بۆ لەناو بردنیان، کە ئەوان ئاگایان لێ نەبوو، وفەرمایشتی:﴿ إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴿١٥﴾ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴿١٦﴾ ﴾ [الطارق : ١٥:١٦] واتە: بێگومان ئەو بێ باوەڕانە فرت و فێڵ دەکەن بۆ کوژانەوەی نوری قورئان..!!. وە منیش بە فێڵ تۆڵەیان لێدەسێنم، واتە: لە بەرامبەر ئەو فێڵەی ئەوانەوە، منیش وردە وردە پلان و نەخشەی خۆم دەخەمە کارو ئەیانگرم و لە دەستم دەرناچن.

---

### شەرح

فەرمایشتی : ﴿وَهُوَ﴾ واتە : خوا جل جلاله ﴿شَدِيدُ ٱلْمِحَالِ﴾ وشەی (المَحل) : لەڕووی زمانەوانییەوە بەمانای : توندی و زۆری دێت، واتە: فێڵ و پلانێکی زۆر، وە (ابن الأعرابيّ) دەڵێت : (المحال: المكر) واتە: میحال بریتی یە لەفێڵ وتەڵەکەو

پیلان. خوای پەروەردگار پیلان و فێڵ و تەڵەکەیەکی ئێجگار بەهێزی هەیە، وپیلان وفێڵ وتەڵەکەی خوداش بریتیە لە: گەیاندنی زیان بەوکەسەی کەشیاوی ئەوەیە زیانی پێ بگەیەندرێت بەشێوازێك کە هەستی پێ نەکات و بیری لێ نەکردبێتەوە .

وفەرمایشتی: ﴿ وَمَكَرُواْ ﴾ واتە : ئەوانەی کە عیسا گومانی کافربوونی لێ کردبوون، ئەوان کافرەکانی بەنی ئیسرائیل بوون ئەوانەی ویستیان عیسا بکوژن و لەخاچی بدەن، و(**المكر**) کردنی شتێکە کە مەبەست لێی دژەکەیەتی .

﴿وَمَكَرَ ٱللَّهُ ﴾ واتە: وردە وردە گرتنی و سزایدان لەسەر فێڵەکەیان و، شێوەی عیسای بردە سەر کەسێکی تر و، عیسای بەرز کردەوە بۆلای خۆی . ﴿وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴾واتە : بەهێزترین و بەتواناترینە لەسەر گەیاندنی زیان بەوکەسەی شیاویەتی بەشێوەیەك هەستی پێ نەکات و بیری لێ نەکردبێتەوە .

هەروەها فەرمایشتی : ﴿ وَمَكَرُواْ مَكْرًا ﴾ واتە: کافرەکان ئەوانەی کە یەکیان گرتبوو بۆ کوشتنی پێغەمبەر ساڵەح ( علیه السلام) و کەس و کارەکەی بەنهێنی لەترسی لایەنگرانی، ﴿ وَمَكَرْنَا مَكْرًا ﴾، واتە: سزاماندان لەسەر ئەو کارەیان و لەنێومان بردن و پێغەمبەرەکەی خۆمان ڕزگار کرد ﴿وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾بەشێوەیەک کە ئەوان هەستیان بەپلان و فێڵ و تەڵەکەی ئێمە نەکرد .

هەروەها فەرمایشتی : ﴿إِنَّهُمْ﴾واتە : کافرەکانی قورەیش ﴿يَكِيدُونَ كَيْدًا﴾ واتە : پلان دادەنێن بۆ ڕێگری کردن لەو ئاینە هەقەی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ هێناویەتی. ﴿وَأَكِيدُ كَيْدًا﴾ واتە : وردە وردە لەناویان دەبەم و سزایان دەدەم لەسەر ئەو فێڵ و تەڵەکەی دایاندەنا بەشێوەیەکی لەناکاو کە هەستی پێ نەکەن و بیریان لێ نەکردبێتەوە .

✍ **مەوزوعی شاهید لەم ئایەتانەدا:**

لەم ئایەتانەدا وەسفی خودا کراوە بەوەی (**المكر والكيد**)واتە: پیلان و فێڵ و تەڵەکەی هەیە و، دانەپاڵی ئەمە بۆلای خودا هەقیقەتی هەیە و بەو شێوەیەیە کە خودا مەبەستیەتی، هەرچی پیلان وتەڵەکە (**المكر**) یە بریتیە لە : گەیاندنی شتێك بەکەسانی تر بەڕێگایەکی شاراوە، وبەهەمان شێوە فێڵ و هەڵخەڵتاندن (**الكيد والمخادعة**) ؛ و فێڵ(**الكيد**) : دوو جۆرە[١] : خراپ و ناپەسەند : کە ئەویش گەیاندنی زیانە بەکەسێك کە شیاوی نیە، وچاك و پەسەند: ئەمەیان گەیاندنی زیانە بەکەسێک کە شیاوی زیان پێگەیاندنە وەك سزاو عوقوبە بۆی، جا یەکەمیان مەزموم و خراپە و، دووەمیان چاک و پەسەندە، خوای پەروەردگار ئەوەیان دەکات کە چاك و پەسەندە بەو شێوەیەیی کە حیکمەت و دانایی دەیخوازێت، خوای پەروەردگار کەسی ستەمکار و فاجر و خراپەکار سزا دەدات بەشێوەیەك کە بیری لێنەکردبێتەوە، نەک بەو شێوەیەیی کە ستەمکاران بەرانبەر بەندەکانی خودا دەیکەن، والله أعلم .

لەگەڵ هەموو ئەوەی باسمان کرد پێویستە ئاگاداری ئەو خاڵە بین کە خوای پەروەردگار وەسفی خۆی نەکردووە بە فێڵ و تەڵەکە و هەڵخەڵەتاندن (**الكيد والمكر والخداع**) ئیللا لەبەرانبەر فێڵ و تەڵەکە و هەڵخەڵەتاندنی بیباوەڕان و دوژمنانی ئیسلام دا ئەوەی کە بەناهەق دەیکات.

شتێکی زانراوە کە بابەتی پاداشت و سزا لەبەرانبەردا شتێکی باشە بۆ مەخلوق و دروستکراو ئەی دەبێ بۆ خالق و بەدیهێنەر چۆن بێت؟!

**تێبینی** : دانەپاڵی(**الكيد والمكر**) وهاوشێوەکانی سیفاتی فیعلی و کردارین کە دراونەتە پاڵ خودا، وە سیفەتی فیلعی و کرداری فروانترە لە ناو (**الاسم**)؛ هەربۆیە خودا چەند فیعل و کردارێکی داوەتە پاڵ خۆی بەڵام ناوی خۆی لێ نەناوە، وەك (**أراد وشاء**) وناوی خۆی نەناوە بە(**المريد والشائي**) . وبەهەمان شێوە (**مَكر ويمَكر**)،

(١) الصواعق المرسلة (٢٩١).

و(**أكيد كيداً**)، بۆیە ناوترێت : فێڵباز و تەڵەکەباز(**الماكر والكائد**) ؛ چونکە ناولێنراوەکانیان دابەش دەبن بۆ باش و پەسەند لەگەڵ خراپ و ناپەسەند[1] .

---

(١) واتە: لەبەر ئەوەی هەموو جار بۆ باش و پەسەند بەکار نایەت بۆیە نابێت ناوی خودای پێ بنرێت و بوترێت فێڵبار و تەڵەکەباز چونکە هەموو جارێك باش و پەسەند نیە.(**وەرگێڕ**).

## [١٥] وەسف کردنی خوای پەروەردگار بەلێبوردەیی و لێخۆشبوون و ڕەحم و خاوەن عزەت و قودرەت:

وفەرمایشتی: ﴿ إِن تُبۡدُواْ خَيۡرًا أَوۡ تُخۡفُوهُ أَوۡ تَعۡفُواْ عَن سُوٓءٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوّٗا قَدِيرًا ١٤٩ ﴾ [النساء : ١٤٩] ، واتە: خۆ ئەگەر ئێوە چاکە بکەن، بەئاشکرابێ، یان بەنهێنی، یان لەکردارو ڕەفتارێکی نالەبار چاوبپۆشن، لەگەڵ تواناو دەسەڵاتدا، بێ سۆ خوا هەمیشە دەسەڵاتدارە بۆ عافووکردن و لێبوردن، ﴿وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ٢٢ ﴾ [النور:٢٢]، واتە:دەبا ئەو جۆرە مەردانە عەفویان بکەن و چاویان لێ بپۆشن لەوەی بەسەریاندا دێت ببوورن و پشتگوێی بخەن و بڕۆنەوە سەر پیاوەتییەکەی جارانی خۆیان ﴿أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡ﴾ مەگەر ئێوە - خاوەن بەخششان - پێتان خۆش نیە کە خوا لێتان ببوورێت!! ، وفەرمایشتی: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ ٨ ﴾ [المنافقون: ٨] ، واتە: ڕێزو عیزەت و گەورەیی هەر بۆ خواو بۆ پەیامبەرەکەیی و بۆ باوەڕ دارانە ، وفەرمایشتی لەبارەی شەیتانەوە: ﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ٨٢ ﴾ [ص:٨٢] ، واتە: شەیتان وتی: دەسا بە عیزەت و دەسەڵاتی تۆ، ئەوانە هەموو فریو دەدەم و لە خشتەیان دەبەم .

---

### شەرح

﴿إِن تُبۡدُواْ خَيۡرًا﴾ ،واتە : ئەگەر خێر بەئاشکرا بکەن، ﴿أَوْ تُخْفُوهُ﴾ یاخود بەنهێنی ئەنجامی بدەن. ﴿أَوۡ تَعۡفُواْ عَن سُوٓءٖ﴾،واتە : یاخود لەوانە ببوورن کە هەڵەیان بەرانبەر کردوون ، ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوّٗا﴾ واتە: ئەوا خودا لێبوردەیە

لەبەندەکانی خۆش دەبێت لەکاتێکدا ﴿قَدِيرًا﴾ واتە: توانای تۆڵەکردنەوەشی هەیە لەوەی کەئەوان ئەنجامیان داوە، دەی کەوایە ئێوەش ئەی باوەڕداران چاو لەپەروەردگارتان بکەن وکاتێ توانای تۆڵەکردنەوەتان هەبوو لێبوردە و بەبەزەیی بن .

وفەرمایشتی: ﴿وَلْيَعْفُوا﴾واتە: با داپۆشەر و لێبوردە بن خاوەن فەزڵ و ڕێزەکان ئەوانەی کە لەسەرەتای ئایەتەکەوە باسکراون و ئاماژەیان پێدراوە، ﴿وَلْيَصْفَحُوا﴾، واتە: وبا چاوپۆشی بکەن لەواتەی خراپەیان بەرانبەر کردوون و هەڵوێستیان نەرێنی بووە ، ﴿أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ﴾ واتە: ئایە پێتان خۆش نییە خودا - بەهۆی لێبوردەیی و میهرەبنیتانەوە بەرانبەر ئەوەی خراپەی بەرانبەر کردوون - لێتان خۆش بێت، ﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾واتە: خودا زۆر لێبوردە و بەبەزەییە وڕەحمەتێکی بێ شوماری هەیە .

هەروەها فەرمایشتی: ﴿وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ﴾ واتە: عیززەتی هەقیقی و ڕەها بۆ خودا و پێغەمبەرەکەیەتی، ئەمەش وەڵامی ئەو دووڕوانە بوو کە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد ئەوان لەباوەڕداران بەعیززەت ترن، و(**العزة**) بریتیە لە : هێز و زاڵبوون بەسەر بەرانبەردا، ئەوەش بۆ خودایە و بۆ ئەوانەشە کەناویان لەگەڵ خودان و فەرمانبەرداری دەکەن لەپێغەمبەرانی و بەندەچاکەکانی نەك کەسانی دیکە .

هەروەها فەرمایشتی خودا لەبارەی شەیتانەوە: ﴿قَالَ فَبِعِزَّتِكَ﴾واتە: شەیتانی گەورە (ئیبلیس) گوتی: سوێند بەعیززەتی تۆ ئەی خودا : ﴿لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ ئەبێ نەوەی ئادەم لەخشتەبەرم و هەڵیان خەڵەتێنم بەڕازاندنەوی هەواو و ئارەزوو بۆیان و گومان لەدڵیاندا دروست بکەم تاوەکو هەموویان گومڕا و سەرلێشێواو دەبن، بەڵام دواتر شەیتان کە زانی پلان و فێڵ و تەڵەکەکانی تەنها کار لەبێباوەڕان و کەسە فاجر و تاوانبارەکان دەکان هات و هەندێکی جودا کردەوە و گوتی : ﴿إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ

ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾ ،واتە: بەندە دڵسۆز و ڕاستگۆکانت نەبێ کە من توانام بەسەریاندا نیە و ناتوانم لەخشەیان بەرم .

✍ **مەوزوعی شاهید لەم ئایەتانەدا :**

وەسفی خودای تێدایە بە (**العفو والقدرة والمغفرة والرحمة والعزة**) واتە: لێبوردەیی و هێز وتوانا ولێخۆشبوون و بەزەیی و عیززەت، هەموو ئەمانەش سیفەتی کامڵن و شایستە و شیاوی زاتی پەروەردگارن .



# [١٦] ئیسپاتکردنی ناو(الاسم) بۆ زاتی الله (جل جلاله) ونەفی هەبوونی هاوشێوەیی:

وە فەرمایشتی:﴿ تَبَٰرَكَ ٱسۡمُ رَبِّكَ ذِي ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ﴿٧٨﴾ ﴾ [الرحمن : ٧٨] ، واتە: پڕ بەرەکەتە ناوی پەروەردگاری خاوەن گەورەیی و ئیحسانت، وفەرمایشتی: ﴿ فَٱعۡبُدۡهُ وَٱصۡطَبِرۡ لِعِبَٰدَتِهِۦۚ هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيّٗا ﴿٦٥﴾ ﴾[مریم : ٦٥] ، واتە: کەواتە تۆش بەردەوام هەر ئەو بپەرستە، وە بەرامبەر بە ئەرکەکانی پەرستنی ئەو زۆر خۆراگربە. ئاخۆ ئاگات لێیە هاو ناوێکی هەبێ؟ دیارە چاک دەزانی، کەبێ وێنەو بێ هاوبەشە،﴿ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ﴿٤﴾ ﴾[الإخلاص: ٤]، واتە: و هەرگیز هیچ کەسێک هاوشێوەو هاوتای نیەو، کەسێ ناتوانێ بەر هەڵستی بکات،﴿ فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ [البقرة : ٢٢] ، واتە: کەوابوو ئێوەش چاک بپەرستن و، هیچ جۆرە هاوبەشێکی بۆ دامەنێن و، تەنها یاساو بەرنامەکەی ئەو وەرگرن، دەخۆ خۆیشتان چاک دەزانن کە ئەوجۆرە بتانە هیچیان بەدەست نیەو، تەنها خوای گەورەیە رۆزیی و دارایی و سامانتان دەداتێ، ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادٗا يُحِبُّونَهُمۡ كَحُبِّ ٱللَّهِۖ ﴿١٦٥﴾ ﴾[البقرة : ١٦٥] واتە: هەندێ لەم خەڵکە هەیە لەگەڵ ئەوەشدا تێنافکرێ تاخوا بەتەنها بپەرستێ، هێشتا چەند هاوتاو چەند هاوبەشێکی بۆ دادەنێ، خۆشیان دەوێن وەک خۆشەویستی خودا، واتە: ئەوانیش هەر ئەوەندە بت و بەرنامەکانیان خۆش دەوێ.

## شەرح

﴿ تَبَرَكَ ٱسْمُ رَبِّكَ﴾ وشەی(**البركة**) لەڕووی زمانەوانیەوە واتە: زۆر بوون و زیاد کردن، و(**التبريك**) : دوعا و پاڕانەوەیە بە بەرەکەت، وماناى﴿ تَبَرَكَ ٱسْمُ رَبِّكَ ﴾ واتە: بەرز و بڵندی و شکۆمەندی بۆ زاتی الله، وئەم لەفزە بۆ جگە لەخودا بۆ هیچ کەسێکی تر بەکار ناهێندرێت و، پێشتر لەو ئایەتانەی کە ئیسپاتی ڕوخسار و دەم و چاو (**الوجه**) دەکرد تەفسیری ﴿ذِى ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴾ مان کرد .

فەرمایشتی : ﴿فَٱعْبُدْهُ ﴾ ، واتە : بەتەنها بیپەرستە و هیچ کەسێکی دیکەی لەگەڵ مەپەرستە، و بەندایەتی(**العبادة**) لەڕووی زمانەوانیەوە واتە : خۆ زەلیل و ملکەچ کردن ، ولەزاراوەی شەرع دا : (**اسم جامع لما يحبه الله ويرضاه من الأعمال والأقوال الظاهرة والباطنة**) واتە: ناوێکی گشتگیرە بۆ هەموو ئەو شتانەی کە خودا خۆشی دەوێت و لێی ڕازییە لەکار و گوفتاری دیار و شاراوە.

﴿وَٱصْطَبِرْ لِعِبَٰدَتِهِۦ﴾ ، واتە : جێگیر و بەردەوام بە لەعیبادەت و بەندایەتی کردن بۆی و ئارام بگرە لەسەر ناڕەحەتیەکانی، ﴿هَلْ تَعْلَمُ لَهُۥ سَمِيًّا ﴾ ، ئەمە پرسیارێکی نکۆڵی ئامێزە و، ماناکەی: خودا هیچ هاوشان هاوشێوە و هاوەڵێکی نییە تا لەگەڵیدا عیبادەت و بەندایەتی بۆ ئەویش بکرێت لەگەڵ خودادا جل جلالە.

هەروەها فەرمایشتی : ﴿ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ﴾ وشەی (الكفء) لەزمانی عەربیدا بەمانای: هاوشێوەو هاوشان دێت، واتە: هیچ کەسێك لەبەدیهێنراوەکان هاوشان و هاوشێوە و هاوەڵی خودا نییە. وفەرمایشتی : ﴿ فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا﴾ وشەی (الند) لەڕووی زمانەوانییەوە واتە: هاوشێوە و هاشان،

واتە: کەسانێك مەهێننە ئاستی خوداوە و بیکەنە هاوەڵی و بەندایەتی بۆ بکەن و، وەك خودا خۆشتان بوێت و بەگەورەی بزانن، ﴿ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾، واتە: لەکاتێکدا خۆشتان باش دەزانن هاوشان و هاوەڵی نییە لە موڵك و خاوەنداریەتیدا و، پەروەردگارتان بەدیهێنەری هەموو شتێکە و، هیچ هاوەڵێکی نییە و کەس لەدروستکراوەکان هاوبەشی و شەریکی نییە .

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا ﴾ دوای ئەوەی لەئایەتەکەی پێشوودا لێ بووەوە لەهێنانەوەی بەڵگە لەسەر تاك و تەنهایی و وەحدانیەتی خودا، هەواڵی پێداین بەوەی لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە دیار و ئاشکرایانەدا لەسەر بێ هاوتایی خودا کەسانێك هەن لەگەڵ خودادا کەسان و بت و شت گەلێکی تری بێدەسەڵات دەپەرستن و بەندایەتی بۆ دەکەن، ﴿يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ﴾ ، واتە : ئا ئەو بێباوەڕانە بەبەندایەتی کردن بۆ ئەو بت و پەرستراوانەوە نەوەستاون، بەڵکو خۆشیان دەوێن و بەگەورەشیان دەزانن!، وزێدەڕۆیش دەکەن لەخۆشویستنیاندا بۆیان هەروەک چۆن خودایان خۆش دەوێت، ئەو بت و پەرستراوانەیان هێناوە ئاستی خوداوە لەخۆشتویستی دا نەك لەبەدیهێنان و ڕۆزی دان و بەڕێوەبردندا .

**✍ شایەتحاڵ لەم ئایەتانەدا:**

ئیسپاتی ناوی تێدایە بۆ زاتی (الله) وبەگەورە دانانیشی تێدایە بۆی، هەروەها نەفی هاوشان و هاوشێوە و هاوەڵی تێدایە بۆ زاتی خودا (جل جلاله)، ئەوەش نەفییەکی موجمەل و کورت و پوختە و، ئەمە ڕێباز و شێوازی نەفی کردنە لەقورئان و سوننەتدا، کەئەویش ئەوەیە نەفی هەرشتێك بکرێت لەزاتی (الله) کە دژی کامڵی و تەواوی بێت جا هەر جۆرە نەقس و کەموکورتی و ناتەواویەک بێت .

## [١٧] نەفی شەریک و هاوەڵدانان بۆ خودا:

وفەرمایشتی: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ وَلِىٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًۢا ﴿١١١﴾ ﴾ [الإسراء : ١١١ ] ،واتە: بڵێ: سوپاس و ستایش هەر بۆ ئەو خوایە کە کەسی نەکردووە بەکوڕی خۆیی و منداڵ و کوڕیشی هەر نییە، وە لە دەسەڵات و موڵکییدا هیچ هاوبەش و هاوتایەکیشی نەبووەو نییە، یارو یاوەریشی بۆ خۆی نەگرتووەو، لەبەر بێ دەسەڵات و بێ تواناییشی، داوای هاوکاریشی لەکەس نەکردووە، تۆیش هەمیشە (الله أکبر) بڵێ و، خوا زۆر بەگەورەو گران بزانە، وە هەموو ناوو سیفەتێکی بەرزو بڵەندو بەشکۆی بۆ بڵێ، ﴿ يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ لَهُ ٱلْمُلْكُ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ ﴾ [التغابن : ١] ،واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدایە، پاک و خاوێنیی و بێخەوشی خوا دەڵێن، خۆ گومانیش نیە کە هەموو بوونەوەر بەڵگەو نیشانەیە لەسەر بوونی خوا، دەسەڵات و موڵکایەتی هەر بۆ ئەوە، سوپاس و ستاییش تەنها بۆ ئەوە، هەر ئەویشە بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایەو، ویستی لە هەر شتێک بێ ئەیکات، ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴿١﴾ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾ ﴾ [الفرقان: ١، ٢] ، واتە: بڵندو گەورەیە، پیرۆزو بە پیتە، ئەو خوایەی کە فورقان و جیاکەرەوەی ڕاست لە ناڕاستی ناردە سەر بەندەی خۆی موحەممەد ﷺ واتە: قورئان، تاببێتە هۆی بێدارکەرەوەو ترسێنەر بۆ جیهانەکانی پەریی و ئادەمیزاد، لەسزای خوا.ئینجا خوا -جل جلاله- چوار سیفەتی تایبەتمەندیی خۆی باس دەکات بۆیان و دەفەرموێ:یەکەم: ئەو زاتەی موڵکایەتیی و دەسەڵاتی گشت ئاسمانەکان و زەویی هەر هی ئەوە، دووەم: هیچ منداڵێکی بۆ خۆی ڕانەگرتووە، وەک جوولەکەو گاورەکان پێیان وایە کە: خوا

تۆرم و منداڵی هەیە! سێیەم: لە مەودای دەسەڵاتیدا، هیچ شەریک و هاوبەشێکی نیە، وەک بت پەرستەکان پێیان وایە کە: شەریک و هاوبەشی هەیە! چوارەم: هەموو شتێکی لە نەبوون و (عەدەم)ـەوە دروسکردوو بەدی هێناو، ئەندازەگیری تەواویشی بۆ کرد، بە میزانێکی ورد. ﴿ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾ [مؤمنون: ٩١، ٩٢] ، واتە:خوا هەرگیز منداڵی بۆخۆی هەڵنەبژاردووە، جا ئەو کەی پێویستی بە منداڵ هەیە، تا منداڵ بۆخۆی بگرێت؟، و هیچ پەرستراوێکیشی نەکردووە بە شەریک بۆخۆی، هەر خۆیەو تاک و تەنیایە، خۆ ئەگەر هاوبەشی بووبان - وەک ئەوان پێیان وایە - ئەو دەمە هەریەک لەو خوایانە دەچوو بەلای دروستکراوی خۆیەوە، بۆ خۆی سەرپەرشتی دەکردو ئەوسا یاسای بوونەوەر تێک دەچوو، وەکو ئێستا نەدەما، و هەندێکی زاڵ دەبوو بەسەر هەندێکدا، وەک پاشاکانی دونیا، جا کە ئێستا هیچ شتێکی وا نابینرێ، مانای وایە هەر خوایەکی تاک و تەنیا هەیە، خوا تاک و تەنیایە، بێخەوشە بێگەردە، لە ئەو شتانەی ئەوان وەسفی خوای پێدەکەن و، دەڵێن هاوەڵ و منداڵی هەیە. بە گشت نهێنیی و نادیار، ئاشکراو دیار، زاناو بەئاگایە، جا کەوابوو خوا بەرزە و، لە سەرووی ئەو شتانەوەیە کە موشریکان دەیانکەنە شەریک و هاوبەش و هاوتای ،﴿ فَلَا تَضْرِبُوا۟ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧٤﴾ ﴾[النحل : ٧٤] ، واتە: جا ئیتر ئێوە نموونەو شەریک بۆخوا مەهێننە ئاراوە، چونکە ئەو بێ شەریک و بێ وێنەیە، بەڕاستیی خوا پووچەڵی ئەوەی دەیکەن دەیزانێ، وە ئێوە بێ ئاگان و نازانن،﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّىَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْىَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ [الأعراف : ٣٣] ، واتە: بڵێ: ئەی پێغەمبەرﷺ! پەروەردگارم هەر کاری خراپ و دزێوو ناشیرینی حەرامکردووە،

**ئاشکراو نهێنی، و هەم تاوان و گوناح و لەسنوور دەرچوون و، دەستدرێژیی کردن بۆ سەر خەڵک بەناهەق، و بێ هیچ بەڵگەیەکی خوایی، شەریک وهاوبەش دانێن بۆخوا، و لە ئاخاوتن و قسەکردن، دەربارەی خوا بە بێ زانین و بەبێ بەڵگە درۆ هەڵبەسن.**

## شەرح

﴿ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ ، وشەی (**الحمد**)واتە : سوپاس و ستایش ، و (ألـ)ـە کە بەوشەی (حمد)ـەوەیە بە واتای ئیستغراق و گشتگیری دێت، واتە: هەموو جۆرە حەمد و ستایشێك بۆ زاتی (الله) یە، ﴿ٱلَّذِى لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا ﴾ ، واتە : منداڵی نییە، وەك ئەوەی جولەکە و گاورەکان و هەندێ لەهاوبەشدانەرانی قورەیش بانگەشەی بۆ دەکەن.

﴿ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ﴾ ، واتە : هیچ هاوەڵ و یاریدەدەرێکی نییە لەخاوەنداریەتی و پەروەردگاریەتیدا، وەك ئەوەی سەنەوییەکان و هاوبیرەکانیان بانگەشەی بۆ دەکەن[1]ئەوانەی کە دەڵێن: چەند پەروەردگار و پەرستراوێك هەیە، ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ وَلِىٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّ ﴾ ، واتە : زەلیل و بێدەسەڵات و دەسەوەسان نییە تاوەکو پێویستی بەهاوەڵ و وەزیر و یاریدەدەر و ڕاوێژکار ..هتد بێت، خودا هاوپەیمانی لەگەڵ هیچ کەسێکدا نابەستێ و، داوای سەرخستن و پشتیوانی لەهیچ کەسێك ناکات،﴿وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًۢا ﴾ ، واتە: خودا بەگەورە و مەزن بزانە و بەپاک ڕابیگرە لەو قسەو قسەلۆکانەی کە کەسانی ستەمکار و بێدین دەیکەن بەرانبەر بەخودا .

(١) **سەنەوییەکان:** جۆرە ئاینێکی مەجوسیە و دەڵێن: دنیا لەدوو بەش و بنەمای کۆن پێکهاتووە: دانەیەکیان نوورە و ئەویتریانیش تاریکییە، وئەو دووە هەتا هەتایی وئەزەلین..(الملل والنحل: ٢/ ٧٢).

هەروەها فەرمایشتی : ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾ ، واتە: هەرچی لەئاسمان و زەویدایە ستایش و یادی خودا دەکەن و خودا بەپاك و دوور دەزانن لەهەر جۆرە کەم و کورتی و ناتەواوییەك. ﴿لَهُ ٱلْمُلْكُ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ﴾ ، واتە: هەرچی سوپاس و ستایش و خاوەنداریەتی ڕەها و هەقیقییە هی خودا و موڵکی خودایە وتایبەتن بەخودا و هیچ یەکێک لەبەندەکانی بەشی نییە تێیدا، ئەوەش کە لەڕواڵەتدا بەهی بەندەکانی بزانرێت ئەوا بەخششی خودا و موڵکی خودایە پێی بەخشیون وخودا خاوەنە ڕاستی و هەقیقیەکەیەتی،﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ ، واتە: خودا بەسەرهەموو شتێکدا زاڵ و باڵادەستە و هیچ شتێك نییە خودا دەسەوەسان و بێتاقەت بکات.

﴿تَبَارَكَ﴾ (تبارك) فیعلی (ماض)یە و لە (البركة)ـەوە[1]وەرگیراوە، کەبریتیە لە : زیاد و گەشەکردنێکی بەردەوام، ئەم لەفزە تەنها بۆ خودا بەکار دێت بۆ هیچ کەسێکی دیکە بەکار نایەت[2]تەنها بەلەفزی(ماض)یش بەکاردەهێندرێت.

﴿ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ﴾ ، واتە : ئەوەی کە قورئانی دابەزاندووە، ناوی نراوە:(فرقان)واتە: جیاکەرەوە؛ لەبەرئەوەی هەق و باتڵ لێك جودا دەکاتەوە، وبەخەڵکی ئاشنا دەکات[3]،﴿عَلَىٰ عَبْدِهِۦ﴾ ، واتە : بۆ سەربەندەکەی کە مەبەست لێی پێغەمبەر موحەممەدە ﷺ ، ئەمە سیفەتێکی مەدح و سەنایە؛ چونکە خودا پێغەمبەری داوەتە پاڵ و خۆی و ئیزافەی کردووە بۆلای خۆی وەك ڕێز و شکۆیەك بۆ پێغەمبەرەکەی و، لەمەقامی دابەزاندنی قورئانی پیرۆز بۆی؛﴿لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ﴾

---

(١) التنبيهات السنية (١٠٧).

(٢) بدائع الفوائد لابن القيم (٢/ ١٨٥).

(٣) تفسير ابن كثير (٤/ ٥٨١)، وبصائر ذوي التميز للفيروزأبادي (١/ ٨٣).

،واتە: بەڵکو بۆ هەموو جیهانیان کە مەبەست لێی مرۆڤ و جنە، وئەمەش یەکێکە لەتایبەتمەندییەکانی، ﴿نَذِيرًا﴾،واتە: بیبێتەئاگادارکەرەوە،و(منذر)، لەئاگادارکردنەوە (الإنذار)ـەوە هاتووە کە بریتییە لەئاگادارکردنەوە و بێدارکردنەوە بەچەندان ڕێگای جودا و جیاواز .

وە فەرمایشتی : ﴿ لِيَكُونَ ﴾ ، واتە: بۆ ئەوەی، ئەمەش ڕوونکردنەوەی هۆکاری دابەزانی قورئان (الفرقان)ـە بۆ پێغەمبەر ﷺ ، واتە: تایبەتی دەکات بە پەیامێکی گشتگیر و عام .

✍پاشان خوای پەروەردگار بەچوار سیفەت وەسفی خۆی دەکات:

**یەکەم:** فەرمایشتی : ﴿ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾،واتە: ئەوزاتەی کە هەرچی موڵك و ماڵ هەیە لەئاسمانەکان و زەویدا هی خودایە، خۆی خاوەنیەتی هی کەسی تر نییە، هەرئەوە بەتەنها خۆی دەتوانێت دەستی تێوەردات و تەسەڕوفی تێدا بکات.

**سیفەتی دووەم:** ﴿وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا﴾ ، واتە: منداڵی نەبووە، وەك ئەوەی جولەکەکان بانگەشەی بۆ دەکەن؛ ئەوەش بەهۆی بێ پێویستی و کامڵی زاتی الله یە لەهەموو کەسێك و، هەژاری و پێویستی هەموو بەدیهێنراوێك بەخودا .

**سیفەتی سێیەم** : ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ﴾ ، واتە: لەموڵك و خاوەنداریەتیدا هیچ جۆرە هاوبەش و هاوەڵ و شەریکێکی نییە، ئەمەش وەڵامە بۆ تاقمە بت پەرست و سەنەوییەکان وجگە لەوانیش .

**سیفەتی چوارەم** : ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ﴾ ، واتە: هەموو شتێکی دروستکردووەو بەدیهێناوە .

ئەمە، واتە: (بەدیهێنراو و دروستکراو) کار و کردەوەی بەندەکانیش دەگرێتەوە، واتە: ئەوکارانەی کە بەندەکانیش دەیکەن خودا دروستی کردوون و بەدیهێناون، ڕوونتر بڵێین: کار و کردوەی مرۆڤ دروستکراوی خودایە و فیعلی عەبدە، ﴿فَقَدَّرَهُۥ تَقۡدِيرٗا﴾، واتە: ئەو تەقدیر و ئەندازەگیری بۆ هەموو شتێك کردووە لەئەجەل و ڕزق و خۆشبەختی و بەدبەختی و هەموو شتێکی ئامادەساز کردووە بۆ ئەوەی کە لەگەڵیدا دەگونجێ .

پێشەوا ئیبن کەسیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: خودا خۆی بەری کرد لەوەی منداڵ و هاوەڵ و شەریکی هەبێت، پاشان هەواڵی دا بەوەی هەموو شتێکی بەدیهێناوە و ئەندازەگیری بۆ کردووە و، ئەو خالق وبەدیهێنەری هەموو شتێکە، هەروەها پەروەردگار و پادشا و پەرستراوی هەموو شتێکە و، هەموو شتێك لەژێر دەسەڵات و بەڕێوەبردن و ئەندازەگیری ئەودایە [١].

هەروەها فەرمایشتی : ﴿مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٖ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنۡ إِلَٰهٍۚ﴾ لەم ئایەتەدا خوای پەروەردگار نەفی ئەوە دەکات منداڵ یاخود هاوەڵی هەبێت لەموڵك و تەسەڕوف و عیبادەتدا، و(مِن) لەهەردوو جێگاکەدا بۆ زیاتر تەئکید کردن ودڵنیایی دانە. ﴿إِذٗا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهِۭ بِمَا خَلَقَ﴾ ئەمەش بەڵگە هێنانەوەیە بۆ هەمان بابەتی سەرەتای ئایەتەکە لەنەفی منداڵ و بوونی هاوەڵ و شەریك لەپەرستش بۆ ئەنجامداندا، دەیەوێ بڵێت: گەر چەند خودایەك هەبوایە ئەوا هەریەکەیان ئەو بەشەی دەبرد کە خۆی دروستی کردووە، ئەوکات گەردون و بوونەوەر تێک دەچوو و دابەش دەبوو.

(١) تفسير ابن كثير (٤/ ٥٨٢).

ئەوەی لەواقع دا دەبینرێت گەردون و بوونەوەر زۆر ڕێک و مونەزەمە و هیچ جۆرە دابەش بوون و چەندایەتیەک تێیدا ڕووی نەداوە. ﴿وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ ، واتە : گەر لەگەڵ خودادا خودایەکی تر بوونی هەبوایە ئەوا هەندێکیان زاڵ دەبوون بەسەر ئەویتریاندا و هەوڵی دەست شکاندنەوە و پاشقول لێدانی ئەوی تری دەدا، هاوشێوەی حاڵی دەسەڵاتدار و مەلیکەکانی دونیا، ئەوکات ئەوەی بدۆڕێت و خودایەکی تر زاڵ بێت بەسەریدا ئەوا شیاوی خودایەتی نابێت .

کەواتە دەرکەوت هەبوونی هاوەڵ و شەریك بۆ خودا شتێکی مەحاڵ و ئەستەمە و ئەوەی هەیە تەنها یەك خودایە؛ هەربۆیە فەرمووی : ﴿سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ ،واتە: دەی پاك و بێگەردی لەوەی کەهاوبەشدانەران دەیدەنە پاڵ خودا لەمنداڵ و هاوەڵ ..هتد، ﴿عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾ ، واتە : خودا تایبەت مەندە بەزانینی ئەو زانستەی کەشاراوەو نادیارە لای بەندەکان و ئەوەش کەبەبەرچاویانەوەیە، بەڵام غەیری خودا خۆ گەر زانستی هەبێت بەهەندێ لەوشتانەی لەبەرچاون ئەوا زانستی نییە بەغەیب و شتە نادیارەکان،﴿فَتَعَٰلَىٰ﴾ واتە : پاك و بێگەردی و بەرزی و بڵندی بۆ خودا ﴿عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾لەوەی هاوبەشدانەران دەیدەنە پاڵی لەهاوەڵ و منداڵ.

هەروەها فەرمایشتی: ﴿فَلَا تَضْرِبُوا۟ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَ﴾، واتە: قیاسی خودا مەکەنە سەر کەسانی تر لەدروستکراوەکان(مخلوقات)، لێرەدا خوای پەروەردگار ڕێگری دەکات لەوەی قیاسی زاتی ئەو بکرێتە سەر کەسانی تر. جا **(ضرب المثل)** چواندنی حاڵ و بارێکە بە حاڵ و بارێکی تر، هاوبەشدانەرەکان دەیانگووت: خودا زۆر لەوە گەورەتر و بەڕێزترە لەوەی بەندەیەکی لاوازی وەك ئێمە ڕاستەوخۆ بیپەرستێت و داوای لێ بکات، دەبێت واستەیەك لەنێوان خۆمان و ئەودا دانێین، بۆیە بت و پەرستراوە دەستکردەکانی خۆیان دەکردە وەسیلە و واستەو نێوەندگیر بۆ گەیشتن بەخودا، ئەوەش وەك چواندنی بەمەلیك و دەسەڵاتدارەکانی دونیا بەوەی ئەوان بەسکرتێر و

واستە نەبێت ناگەیتە لایان، خوای پەروەردگاریش ڕێگری لێکردن لەوکارە؛ چونکە خودا هیچ هاوشێوەیەکی نییە تا بچوێندرێت بەمەلیك و دەسەلاتدار، بۆیە نابێ ئەو قیاس و چواندنە دەرهەق بەخودا بکرێت،﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ﴾ ، واتە: خودا دەزانێت خۆی هیچ هاوبەش و هاوشێوەو هاوەڵێکی نییە، ﴿وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ ، بەڵام ئەوە ئێوەن نازانن، جا ئەو کارەتان سەرچاوەکەی بیرکردنەوە و گومانێکی ناڕەوا و فاسدە، هەروەها نازانن عیبادەت کردن بۆ بت سەرەنجامەکەی چەندە مەترسیدار و خراپە .

هەروەها فەرمایشتی : ﴿قُلْ﴾ واتە: بڵێ، ئەم قسەیە ڕووی لەپێغەمبەرە ﷺ، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قورئان کەلامی خودایە و، پێغەمبەریش ﷺ پەیامهێنەر و نێردراوی خودایە[1] ،﴿إِنَّمَا﴾ ئاداتی حەسرە، ﴿حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَٰحِشَ﴾،واتە : خراپەکاری قەدەغە کردووە و(**الفواحش**) : جەمعی (**فاحشة**)یە و، بریتیە لەو تاوانانەی کە زۆر ناشیرینن ﴿مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ﴾، واتە : ئەوەی بەئاشکرا ئەنجام دەدرێن و ئەوەش کە بەنهێنی ئەنجام دەدرێن، و﴿وَٱلْإِثْمَ﴾ هەموو سەرپێچیەکە کە دەبێتە هۆکاری تاوان و خراپەی تر، قسەیەک هەیە دەڵێت: مەبەست لە (**الإثم**): عەرەق و مادەی هۆشبەرە، ﴿وَٱلْبَغْىَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ﴾،واتە : ستەم و دەستدرێژییەك بۆ سەر خەڵکی کە سنووری بەزاندبێ، ﴿وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ﴾ ،واتە : هاوبەشی بۆدانێن لەعیبادەت بۆ کردندا . ﴿مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا﴾،واتە : بەبێ هیچ حوججە و بەڵگە و بیانوویەکی درووست، ئائەمە مانا و مەبەستی سەرەکی ئایەتەکەیە.

﴿وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾،واتە: درۆ و دەلەسەو بوهتان بدەنە پاڵ خودا بەوەی گوایە منداڵی هەیە، لەکاتێکدا ئێوە هیچ عیلم و زانیاریتان لەو بارەیەوە نییە،

---

(١) التنبيهات السنية (١٢٠).

هەروەها هاوشێوەی ئەو لێکدانەوە و شت حەڵاڵ و حەرام کردنەی کە بەلێکدانەوەی خۆیان دەیان کرد بەبێ مۆڵەت پێدانی خودا .

✍ **ئەوەی تێبنی دەکرێت لەم ئایەتە پیرۆزانەدا:**

لەم ئایەتانەدا نەفی هاوبەش و هاوەڵ و منداڵ کراوە لەخودا و، ئیسپاتی تاك و تەنهایشی کراوە، هەروەها ئاماژەش بەوە دراوە هەموو دروستکراوەکانی ستایشی دەکەن و بەپاك ڕایدەگرن لەو قسە و قسەڵۆکانەی بێباوەڕان، هەروەك ئیقامەی حوججەشی تێدایە بۆ هاوبەش بڕیاردەران بەوەی ئەو کارەی دەیکەن پوچ و بەتاڵە و هیچ بیانوویەکی درووستی نییە، تەنها دەرەنجامی نەزانی و خەیاڵ گەلێکی پوچی ناڕەوایە، هەروەها خودا هیچ لێچوو و هاوشێوەیەکی نییە . واللە أعلم .



# [١٨] ئیسپاتکردنی بەرز و بڵند بوونەوەی خودا لەسەر عەرشەکەی (استواء الله على عرشه)

**فەرمایشتی : ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ﴾[١]، واتە: ئەو خوا بەخشندەیە بڵندبوویەوە بۆ سەر عەرشی فەرمانڕەوایی خۆی، بەڵێ.. مەبەست بەم چوون و**

---

(١) دیارە ئەو خۆی چۆنی مەبەست بێت لەو چوونە سەر عەرشە، ئێمەش هەر بەو جۆرە باوەڕمان پێی هەیە، هەروەک (سەلەف)یش دەڵێن: (**أي: استواءً يليق بجلاله من غير تشبيه ولاتمثيل ولاتعطيل ولاتحريف كما هو مذهب السلف وكما قال الإمام مالك «رحمه الله»: إمرار الصفات تمر كما جاءت بلا تشبيه ولاتعطيل فلا يقال: كيف؟ ولم؟ ونحن نؤمن بأن الله على العرش كيف شاء، وكما شاء بلاحد، ولاصفة يبلغها، أو وصف يحدها حاد، نمر الآية والخبر ونؤمن بما فيها، ونكل الكيفية في الصفات إلى علم الله عزوجل**). صفوة التفاسير، م١/ص/٤٥٠ ئەویش لە (محاسن التأويل ٢٧٠٨/٧). واتە: بڵندبوویەوەیەک کە شایستەی پلەو مەقامی خودا بێت، بەبێ هیچ جۆرە لێکچواندنێک و هاوشێوەییەک بۆ خودا، یان ڕەتکردنەوەی سیفاتگەلێک بۆ خودا، یان گۆڕانکاریی لە ناوو سیفاتی خودادا بکرێ، ئەمەش مەزهەب و ڕێرەوی سەلەفی ساڵحە. وەک ئیمامی مالیک دەفەرموێ: وەرگرتن و قەبوڵکردنی سیفات بۆ خودا بەو شێوەی لە قورئان و سوننەتدا هاتووە، بەبێ هیچ جۆرە لێکچواندنێک، یان ڕەتکردنەوەی سیفاتێک بۆ خودا، نابێ بوترێ: چۆن؟ وە بۆچی؟ ئێمە باوەڕمان بەوە هەیە کە خودا لەسەر عەرشە هەرچۆنێک بیەوێ، وە یان بە چ شێوازێک بیەوێ، وە هیچ جۆرە پێناسەو وەسفێک پەی پێ نابات، یان هیچ جۆرە پیا هەڵدانێک ناتوانێ وەسفی بکات، ئایەت و فەرموودەکان چۆن هاتوون بەو شێوە لێکیان دەدەینەوەو باوەڕمان پێیەتی، وە شێوازو چۆنیەتی ئەم سیفاتانەش دەدەینەوە دەست خودا. (**ئیبن کەسیر**)یش دەڵێ: سەبارەت بەم ئایەتی: [ **ثم استوى على العرش..** ]ە، قسەو بۆچوونی زۆر هەیە، بەڵام ئەم جێگایە شوێنی ئەو درێژە پێدانە نییە، بەڵکو هەر ئەوەندە بەسە کە ئێمەیش بە ڕێی پێشینانماندا وەکو: ئیمامی (**مالیک، ئەوزاعیی، سەوریی، لەیس، شافیعیی، ئەحمەد، ئیسحاق**) کە بەبێ چۆنیەتیی و، شوبهاندن و، لە کارخستنی صیفەتەکان بەسەریاندا بچین. (نوعەیمی کوڕی حماد)ی «مامۆستای بوخاریی» دەڵێ: (**من شبه الله بخلقه فقد كفر، ومن جحد ما وصف الله به نفسه فقد كفر، وليس فيما وصف به نفسه ولا رسوله تشبيه**) واتە: هەرکەسێک خودا بچوێنێت بە یەکێک لە درووستکراوەکانیەوە، ئەوە کافر بووە، وە هەرکەس ئینکاری یەکێک لەو سیفاتانە بکات کە

=

---

خودا وەسفی خۆی پێدەکات، ئەوە پێی کافر دەبێت، وە ئەوەی خۆی وەسف و سەنای خۆی پێدەکات، یان نێردراوەکەی-صلی الله علیه وسلم- وەسفی پێدەکات، لێکچواندن نیە. لە(ئیبن قەییم) دەپرسن: ئەگەر دووکەس لە پەیرەوانی شافیعیی بکەونە چەلەحانێ لەگەڵ یەکتر، ئەوجا یەکێکیان بڵێ: هەرکەسێ پێی وانەبێ خوا لە ئاسمانە، سەر لێشێواوو سەر لێ تێکچووە، ئەوی دیکەش بڵێ: نەخێر! خوا بێ جێ و مەکانە، ئایا ئەم دووبۆچوونە کامیان لەسەر عەقیدەی ئیمامی شافیعیە؟ لەوەڵامدا وتی: عەقیدەی شافیعیی و، عەقیدەی پێشینەکانی ئیسلام، وەک ئیمامی (**مالیک، سەوریی، ئەوزاعیی، ئیبنولموبارەک، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیسحاق**) هەر وەکو عەقیدەی زانا بەڕێزەکانی ترە، وەک: (**فوزەیلیی کوڕی عیاض، ئەبو سولەیمانی دارانی، سەهلی کوڕی عەبدوڵڵای تەستەری**) چونکە لە نێوان هیچ لایەک لەو بەڕێزانەو وێنەیاندا، هیچ ناکۆکیی و جیاوازیی لە بەرامبەر بنەماکانی ئاییندا نەبووە. ئەوەتە پێشەوا شافیعی لە سەرەتای کتێبی (**الرسالة**)دا دەڵێ: (**الحمد لله الذي.. هو كما وصف به نفسه وفوق ما يصفه به خلقه**) واتە: سوپاس بۆ ئەو خودایە، سوپاسێک کە وەسف و ستایشی خۆی پێکردووە، وەسفێک کە لەسەروو هەموو ئەو وەسفانەوە بێت کە درووستکراوەکانی وەسفی دەکەن. (**ئیبن کەسیر**)لە کتێبی (**البداية والنهاية**)دا دەڵێ: (ڕەبیعی مامۆستای شافیعی و پیاوە هەڵکەوتووەکانی مەزهەبی شافیعی، بەبێ باسکردنی هیچ چۆنایەتیەک صیفەتەکانی خوا دەسەلمێنن، یان بە کورتترو پوختتر ڕای ئیمامی شافیعی لەمەڕ صیفاتی خواوە لەم سێ خاڵەدا ڕادەگەیەنین:

١- **نثبت لله جميع الأسماء والصفات التى نطق بها القرآن ودلت عليها السنة الصحيحة إثباتا بلا تشبيه وتنزيها بلا تعطيل على حد قوله تعالى: (ليس كمثله شئ وهو السميع البصير)**. واتە: تەواوی ناووسیفاتی خوای گەورە دەچەسپێنین کە لە قورئان و سوننەتدا هاتوون، بەبێ هیچ جۆرە لێکچواندنێک، یان ڕاگرتنی سیفاتێک، لەسەر پایەو ئەساسی ئەم ئایەتە کە دەفەرمووێ: هیچ شتێک هاو شێوەو هاو وێنەی نیە، وە خودا بیسەرو بینایە.

٢- **ينزه الله سبحانه وتعالى عن مشابهة خلقه مع إثبات حقيقة هذه الصفات**. واتە: خودا پاک و بێگەردە لەوەی لە درووستکراوەکانی بچێت، لەگەڵ ئەوەی هەموو سیفاتەکانی دەچەسپێنین.

٣- **التوقف عن الخوض فيما لا مجال للعقل فيه مع اليأس وقطع الطمع عن إدراك كيفية هذه الصفات كما روى ابن أبى حاتم بسنده عن أبى إسحاق بن محمد قال: سمعت الشافعى يقول: (إن للعقل حدا ينتهى إليه كما أن للبصر حدا ينتهى إليه)**. سەیری کتێبی (**آداب الشافعي ومناقبه**) بکە. واتە: ڕۆنەچوون لەو شتانەی کە مەجالی بیرکردنەوەی عەقڵی تێدا نیە، وە واز هێنان لە زانینی چۆنیەتی ئەو سیفاتانە، وەک ئیبن ئەبی حاتەم لە ئەبی ئیسحاقی کوڕی محمد =

سەرکەوتنەیە بۆسەر عەرش، سەرکەوتنێکە شیاوی زاتی بڵندی ئەو بێ و، بەو شێوەیە کە (سەلەف)و پێشینانمان تەفسیریان کردووەو بێ هیچ شوبهاندن و لێکدانەوە و قوڵبوونەوە تێیدا، وە ئەم باسە لەحەوت جێگادا لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە: لە (سورة الأعراف)ـدا:﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴿٥٤﴾ ﴾ [الأعراف: ٥٤] ، واتە: بەڕاستیی هەرخوای پەروەردگاری ئێوەبوو توانی ئاسمانەکان و زەویی لەماوەی شەش ڕۆژدا درووست بکات، خۆ ئەگەر ویستبای بەچاو تروکاندنێک درووستی دەکردن، ئەوسایش بەو شێوەیە کە شایستەو شیاوی زاتی خۆی بێت «جل جلاله» بڵندبوویەوە بۆ سەر عەرشی فەرمانڕەوایی خۆی، ولە (سورة یونس)ـدا :﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ

---

= دەگێڕێتەوەو دەڵێ: بیستم کە شافیعی دەیفەرموو: بەڕاستی عەقڵ سنوورێکی هەیە کە کۆتایی دێت، وەک چۆن چاو سنووری بینینی هەیە. (ئیمامی زەهەبی) دەڵێ: شەیخولئیسلام - ئەبولحەسەنی هەکاری - ئەبوو موحەممەدی مەقدیسی» حافیظ لە ئەبو سەورەوە، ئەبو شوعەیبەوە، ئەوانیش لە موحەممەدی کوڕی ئیدریسی شافیعی یەوە (ناصر الحدیث) دەڵێن: **(القولُ في السُّنّة التي أنا عليها ورَأَيْتُ عليها الذين رأيتهم مثل سفيان ومالك وغيرهما: الإِقْرارُ بِشَهَادَةِ أن لا إلهَ إلا الله وأن محمدا رسول الله، وأن الله على عرشه في سمائه يقرب من خلقه كَيف شاء وينزل إلى سماء الدنيا كيف شاء. وذكر سائر الإعتقاد)**. واتە: ڕاوبۆچوون لەسەر ئەو سوننەتەی من لەسەریم و ئەوانەی من بینیومن لەسەر سوننەت بوون وەک: سوفیان و مالیک و غەیری ئەوانە ئەمەیە کە: دانپێنان بە شایەتومانی **(لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله)**، و پاشان خودا لەسەر عەرشە لەئاسماناو، نزیک دەبێتەوە لە بەندەکانیەوە چۆن بیەوێ، وە دێتە ئاسمانی دونیا هەرچۆنێک بیەوێ. وە هەروەها بابەتە بیروباوەڕییەکانی دی باسکرد. وللسلف (رحمهم الله) **في تفسير الإستواء أربع عبارات:١- العلو ٢- الإرتفاع ٣- الصعود ٤- الإستقرار**. واتە: پێشینانمان (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) لە مانای **(الاستواء)**دا چوار ڕایان هەیە: بەرزی، بڵندبوونەوە، سەرکەوتن، جێگیربوون. بۆ زیاتر ئاگاداریی لە بۆ چوون و عەقیدەی زانای پایەبەرز پێشەوا شافیعی، سەبارەت بە (ئەسما)و (صیفات)ی خوا «جل وعلا» سەیری کتێبی (**منهج الإمام الشافعي**»رحمه الله» في إثبات العقيدة) بەرگی/٢، ئامادەکردنی (محمد بن عبدالرحمن بن العقل) بکە. (**تەفسیری ڕامان**).

فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ﴿٣﴾ ﴾ [یونس: ٣] [١]،واتە:بەڕاستیی پەروەردگارتان هەرئەو خوایەیە کە: ئاسمانەکان و زەویی لە ماوەی شەش ڕۆژدا درووستکرد، هەندێ دەڵێن: مەبەست بەو ڕۆژانە، هەر ئەم ڕۆژانەی دونیایە، هەندێکیش دەڵێن: هەر ڕۆژەی بەقەد هەزار ڕۆژی ئێستامانە، پاشان بەو شێوەیە کە شایستەو شیاوی زاتی ئەوبێ و ئەو خۆی مەبەستیبێ بڵندبوویەوە بۆ سەر عەرشی فەرمانڕەوایی خۆی ، ولە (سورة الرعد)ـدا:﴿ اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ﴿٢﴾ ﴾ [الرعد: ٢] ، واتە: هەر ئەو خوایە ئەو کتێبەی بۆ تۆ ناردووە کە ناوی (الله)یەو خاوەن توانایەکی وایە ئاسمانەکانی بەرز ڕاگرتووە، بێ ئەوە هیچ کۆڵەکەو پایەیەکی بۆ دانابێت، ئێوە ببینن، پاشان بەو شێوەیە کە شایستەو شیاوی زاتی ئەوبێ و ئەو خۆی مەبەستیبێ بڵندبوویەوە بۆ سەر عەرشی فەرمانڕەوایی خۆی، ولە (سورة طه)ـدا:﴿ الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ ﴿٥﴾ ﴾ [طه:٥] ،واتە: ئەو خوا بەخشندەیە بڵندبوویەوە بۆ سەر عەرشی فەرمانڕەوایی خۆی، ولە(سورة الفرقان)دا : ﴿ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ﴿٥٩﴾ ﴾ [الفرقان: ٥٩] ، واتە: ئەوسایش بەو شێوەیە کە شایستەو شیاوی زاتی خۆی بێت «جل جلاله» بڵندبوویەوە بۆ سەر عەرشی

---

(١) بۆ زانیاری: وشەی (إستوى) لە قورئانی پیرۆزدا بە (٣) جۆر لێکدانەوە هاتووە:

**یەکەم:** هەرکات وشەی (إستوى) هیچ جۆرە پیتێکی لەگەڵ نەبوو، ئەوکات بەمانای تەواوییەتـی و بەخۆدا گەیشتن دێت، وەك دەفەرموێ سـەبارەت بە پێغەمـبەر موسـا (درووودی خـوای لەسـەر بێت):﴿**ولما بلغ أشده واستوى**﴾اتە: کاتێ موسا پێگەیشت و بەتەواوی بەخۆدا هات.

**دووەم:** هەرکات پیتی (على)ی لەگەڵدا هات، ئەوکات بەواتای بەرزبوونەوەو بڵـندی دێـت، وەك دەفەرموێ: ﴿ **ثُمَّ اسْتَوى عَلَى الْعَرْشِ**﴾ واتە: بڵندبوویەوە بۆ سەرعەرش.

**سێیەم:** هەرکات پیتی (إلى)ی لەگەڵدا بوو، ئەوکـات بەواتـای (مەبەسـت و ویسـت) دێـت، وەك دەفەموێ: ﴿ **ثم استوى الى السـماء**﴾واتە: پاشـان ویسـتی بەرەو درووسـتکردنی ئاسـمانەکان بچێت (ئەم زانیاریە لە ئامادەکردنی لێکۆڵەری تەفسیرەکەیە). **(تەفسیری ڕامان).**

فەرمانڕەوایی خۆی ، وله (سورة السجدة)ـدا :﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴿٤﴾ ﴾ [السجدة : ٤]،واتە: ئەو خوایە ئاسمانەکان و زەویی و هەرچیش لە نێوانیاندایە لە ماوەی شەش ڕۆژ (دەوەران)دا، بەدی هێنا [ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ] لە پاشان بڵندبوویەوە بۆ سەر عەرش.. ئیمانمان بە (ئیستیوا)هەیە، بەڵام ئیستیوایەک شایستەی شکۆمەندی خۆی بێت، واتە: بێ هیچ جۆرە بیرکردنەوەو شوبهاندن و دەستکارییەک لە شێوازی ئەو بڵندبوونەوەیە بۆ سەر عەرشی، وله(سورة الحديد)ـدا:﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴿٤﴾ ﴾ [الحديد: ٤] ،واتە:هەر ئەو خوایە ئاسمانەکان و زەویی لە ماوەی شەش ڕۆژدا درووستکرد، لە پاشان بڵندبوویەوە بۆ سەر عەرش. بە بڵندبوونەوەیەک شایستەی زاتی خۆیبێت .

---

## شەرح

واتە:ئیسپاتکردنی لەسەر عەرش بوونی خودا لەحەوت ئایەتدا هاتووە و لەهەمووویاندا لەفزی (**الاستواء**) بەیەك شێواز و یەك لەفز هاتووە کە ئەویش : ﴿ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾ ، ئەمە دەقە لەمانا هەقیقیەکەیدا و هیچ تەئویلێک هەڵناگرێ بەوەی بەمانای تر لێک بدرێتەوە، و(**الاستواء**): سیفەتێکی فیعلی سابت جێگیرە بۆ خودا بەوشێوەیەیی کە شایستەی و شیاوە لەگەڵ زاتی (الله) دا هاوشێوەی گشت سیفاتەکانی تری و، ئەم لەفزە لەزمانی عەرەبیدا بەچوار مانا دێت[1]: کە ئەویش :

---

(١) «شرح أصول اعتقاد أهل السنة» للالكائي (٣٩٩- ٤٠٠) ، و «إثبات علو الله على خلقه والـرد على المخالفين» لأسامة القصاص (١ / ١٣٧) .

(**علا، وارتفع، وصعد، واستقر**) واتە: بەرز بووەوە، وبڵند بووەوە، وسەرکەوت، وجێگیربوو، ئەم مانایانە هەموو ئەو تەفسیرانەن کە لەسەلەفەوە هاتووە لەبارەی مانای(**الاستواء**)ـەوە لەو ئایەتانەی کە ئاماژەمان پێدا .

فەرمایشتەکەی ئایەتی یەکەم و دووەم: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ﴾، واتە: ئەو بەدیهێنەر و بەخێوکەرتانە بەنیعمەتەکانی و، ئەوکەسەیە کە پێویستە لەسەرتان بەتەنها بیپەرستن ،﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ ، واتە : ئەو دروستکار و بەدیهێنەری هەموو جیهانیانە؛ بەئاسمان و زەوی و ئەوەی لەنێوانیاندایە، ﴿فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾، کە ئەویش : یەك شەممە و دوو شەممە و سێ شەممە و چوار شەممە و پێنج شەممە و هەینی یە ، لەڕۆژی هەینی دا هەموو خەڵکەکە کۆبوونەوە و تێیدا ئادەم (علیه السلام) دروستکرا[1] ،﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾ ، واتە : بەرز و بڵند بووەوە بەسەر عەرشدا بەو شێوەیەیی کە شیاو و گونجاوە لەگەڵ زاتی ئەودا، هەر ئەمەش مەوزوعی شاهیدی ئایەتەکەیە، و(**العرش**) : لەڕووی زمانەوانییەوە بریتییە لە : کورسی و جێگای دانیشتنی مەلیك[2]، ولێرەدا مەبەست لێی ـ هەروەك کۆی دەقەکان دەبنە بەڵگە لەسەری - :کورسیەکە کە ئەملاو ئەولای هەیە و فریشتەکان هەڵی دەگرن، ووەکو قوبەیەك وایە بەسەر جیهانەوە و ئەو سەقفی دروستکراوەکانە .

فەرمایشتەکەی ئایەتی سێیەم : ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ ، واتە : بەسەر زەویدا بەرزی کردووەتەوە بەرزکردنەوەیەك کە دوورە و بەدەست ناهێندرێت و کەس ناگات بەوپەری و ئەندازەکەی نازانرێت. ﴿بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا﴾ وشەی(**العمد**) بریتیە لە: پایە

---

(١) حسن : أخرجه أحمد (٢٤١٨٧) ، وحسنه الشيخ الألباني في «صحيح الترغيب والترهيب» (٦٩٢) .

(٢) بڕوانە : «التنبيهات السنية» (١٢٧) .

ودنگە و جەمعی (**عماد**)ـە، واتە : ڕاوەستاوە بێ ئەوەی هیچ جۆرە پایە و دنگەیەکی هەبێت و لەسەری ڕاوەستابێت، بەڵکو تەنها بەهێز و قودرەتی خودا ڕاوەستاوە .

دواتر فەرمایشتی﴿تَرَوْنَهَا﴾ بۆ جەختکردنەوەی نەبوونی پایە و دنگەیە و، بۆچوونێك هەیە دەڵێت: پایەیی هەیە بەڵام ئێمە نایبینین، بەڵام بۆچوونی یەکەم تەواوتر.

﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾ پاشان بەرز بووەوە بەسەر عەرشدا، ئائەمە مەوزوعی شاهیدی ئایەتەکەیە بۆ ئیسپاتکردنی بەرز و بڵند بوونەوە (**الاستواء**). قسەکردن لەسەر گشت ئایەتەکانی تر هەمان قسەو باسی ئەم ئایەتانەیە کە ڕوونکرانەوە .

**ئەوەی لەهەموو ئەم ئایەتانە بەگشتی وەردەگیردرێت:**

ئیسپاتکردنی بەرز بوونەوەی خودایە بەسەر عەرشەوە بەو شێوەیەیی کەشیاوی زاتی (الله) یە و، وەڵامێکیشە بۆ ئەوانەی کە (**الاستواء**) تەئویل دەکەن بەوەی بەمانای: دەست بەسەرا گرتن و زاڵ بوون(**الاستيلاء ،والقهر**)دێت و، تەفسیری(**العرش**) دەکەن بەوەی بەمانای موڵك و دەسەڵات دێت و، دەڵێن: (**استوى على العرش**) واتە: دەستیگرت بەسەر موڵك ودەسەڵاتدا و زاڵ بوو بەسەر غەیری خۆیدا، ئەمەش باتڵە لەچەند ڕوویەکەوە لەوانە[1]:

**یەکەم :** ئەوە تەفسیرێکی داهێنراوە و پێچەوانەی تەفسیری سەلەفی ئەم ئومەتەیە، کە ئەوانیش بریتین لەهاوەڵان و تابیعین و تابیعی وشوێنکەوتوانیان و، یەکەم کەسێك کە ئەم قسەیەیی کرد جەهمی و موعتەزیلەکان بوون و، ئەمە بۆچوونێکی باتڵ و ڕەتکراوە وقەبوڵ نەکراوە .

---

(١) «مجموع الفتاوى» (٥ / ١١٦) ، و «التنبيهات السنية» (١٢٦) .

**دووەم** : خۆ ئەگەر مەبەست لە بەرزبوونەوە بەسەر عەرشدا(**الاستواء على العرش**) : دەست بەسەراگرتنی موڵك و دەسەڵات (**الاستيلاء**)بوایە ئەوا هیچ جیاوازیەک نەدەما لەنێوان عەرش وحەوت تەبەقە(چینی)ی زەوی خوارو وئاژەڵ و هەموو دروستکراوەکانی تردا ؛ چونکە خودا دەستی بەسەر هەموویاندا گرتووە و خاوەنی هەموویەتی ، ئەوکات هیچ فائیدە و سوودێك بۆ باسکردنی عەرش نامێنێتەوە .

**سێیەم** : ئەم لەفزە ﴿ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾لەزۆر جێگای قورئان و سونتەتدا هاتووە و تەنانەت لەیەک لەفزیشدا نەهاتووە کە بڵێت (**استولى على العرش**) تاوەکو باقی دەقەکانی تری پێ تەفسیر بکرێت .

**چوارەم** : وشەی (**ثم** )ـەی هێناوە کە بۆ تەرتیب و ڕیزبەندی و پاش ماوەیەك بەدوای یەکدا هاتن دێت، جا ئەگەر مانای(**الاستواء**) بەرز و بڵند بوونەوە: (**الاستيلاء**) دەست بەسەراگرتن، بوایە بەسەر عەرش و زاڵ بوون بوایە بەسەریدا ئەوا دوانەدەکەوت بۆ دوای درووستکردنی ئاسمانەکان و زەوی لەکاتێکدا عەرش هەبووە پێش درووستکردنی ئاسمانەکان و زەوی بەپەنجا هەزار ساڵ، هەروەك لەسەحیح موسلیم دا هاتووە[1]دەی چۆن دەکرێت خودا دەسەڵاتی بەسەردا نەبووبێت و زاڵ نەبووبێت بەسەریدا تاوەکو ئاسمانەکان و زەوی دروست کرد؟! بۆیە ئەمە باتڵترین باتڵە و بۆچوونێکی زۆر نا پەسەند و نا لۆژیکییە. والله أعلم .

(١) أخرجه مسلم (٢٦٥٣) ، والترمذي (٢١٥٦) وغيرهم.

## [١٩] ئیسپاتکردنی بەرز وبڵند(علو)ی خودا بەسەر دروستکراوەکانیەوە :

وفەرمایشتی:﴿ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ ﴿٥٥﴾ ﴾ [آل عمران : ٥٥]، واتە: ئەی عیسا! بەراستیی من دەتبەمەوە بۆلای خۆم و، هەتا رۆژێ ئەتگەیەنمە کاتی دیاریکراوی ئاسایی بۆ ژیانت دەمێنی و، ئەوسا ئەتمرێنم، واتە: ئێستا بەر لەهاتنی کۆتایی ژیانت ناهێڵم ئەوانە بتکوژن و بمریت، و لەلای خۆیشم جێی بەرزت دەبێ و، سەرت دەخەم بۆ ئاسمان بۆلای خۆم. ﴿ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِۚ ﴿١٥٨﴾ ﴾ [النساء: ١٥٨] ، واتە:بەڵکو خوای گەورە بەرەو خۆی بەرزی کردەوە،﴿ إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥۚ ﴿١٠﴾ ﴾ [فاطر: ١٠] ، واتە: هەموو وشەیەکی پیرۆزو و پاک - وەک یادکردنی خواو دوعاو پاڕانەوەو قورئان خوێندن - بۆلای خوا سەر دەکەوێ، وە هەموو قسەو ئاکارێکی چاک و پاکیش بەرەو لای خۆی بەرزی دەکاتەوەو وەری دەگرێ و قبوڵی دەکات، ﴿ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبۡنِ لِي صَرۡحٗا لَّعَلِّيٓ أَبۡلُغُ ٱلۡأَسۡبَٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسۡبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبٗاۚ ﴿٣٧﴾ ﴾[غافر : ٣٦ ، ٣٧] ،واتە:فیرعەون دوای وتەکانی پیاوە موسڵمانەکە ترسی لێ نیشت کە ئەو قسانەی ئەوە تینیان تێ بکات، بۆیە دەڵێ: با موسا تاقیبکەینەوە بزانین راستدەکات، جا لەبەر ئەوە وتی: ئەی هامان! کۆشکێکی بەرزم بۆ درووست بکە، بەڵکو بگەمە چەند رێبازەکان، رێبازەکانی سەرکەوتن بۆ ئاسمانەکان!!.. تا لە خوای موسا ئاگادار ببم و ببینم، دیارە بە گاڵتەوە دەڵێ (خوای موسا)، بۆیە وتی: هەرچەند من پێم وایە درۆ دەکات کە دەڵێ: خوایەکی تر هەیە! ، ﴿ ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ﴿١٦﴾ أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗاۖ فَسَتَعۡلَمُونَ كَيۡفَ نَذِيرِ ﴿١٧﴾ ﴾ [الملك:١٦، ١٧] ،واتە: ئایا دڵنیان لەو (خوایە)ی کە لە سەرەوەیە ئەی بتپەرستان! بە

**ناخی زەویدا بتانباتە خوارەوەو قووتتان بدات، وەک (قاروون)ی قووتکرد؟ ئینجا ئەو دەمە هەمیشە زەویی بێت و بچێ و بجوڵێت، کەوابوو هەرگیز لە دەسەڵاتی خوای بە بەزەیی دڵنیا مەبن، چونکە هەرکاتێ قاری لێگرتن دەیگرێ یان لەو زاتەی لە سەرەوەیە دڵنیان، کە وردە زیختان بە سەردا ببارێنێ..؟ئەوجا دەزانن تۆڵەی من چۆنە .**

## شەرح

﴿يَٰعِيسَىٰٓ﴾ ،واتە: ئەی عیسا، ئەم وتەو خیتابە ڕووی لەپێغەمبەر عیسای کوڕی مەریەمە (عليه الصلاة والسلام) . ﴿إِنِّي مُتَوَفِّيكَ﴾ ،واتە: من دەتخەوێنم یاخود دەتمرێنم، ئەوەی زۆربەی زانایان لەسەرین ئەوەیە مەبەست لە(**الوفاة**) [(١)]لێرەدا: خەواندنە، هەروەك خوای پەروەردگار لەئایەتێکی تردا فەرموویەتی : ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيْلِ﴾ [الأنعام: ٦٠] ،واتە: هەر ئەو خوایە کە بەشەودا دەتانخەوێنێ و، هەستان لێدەسێنێ و، وەک مردووتان لێدێت. وفەرموویەتی: ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا﴾ [الزمر : ٤٢] ،واتە: هەر خوایە کە گیانەکانی خەڵکی دەکێشێ لە کاتی مردنی خاوەنەکانیاندا و ئەو گیانانەش کە خاوەنەکانیان نەمردوون و لە خەودان، هەر بۆ خۆی گیانیان دەکێشێ. ﴿وَرَافِعُكَ إِلَىَّ﴾ ، واتە : بەرزت دەکەمەوە بۆلای خۆم، خودای پەروەردگار پێغەمبەر عیسای بەزیندوویی بەرزکردەوە بۆلای خۆی، هەرئەمەش مەوزوعی شاهیدە لەئایەتەکەدا، کە

(١) تفسير ابن كثير (٢/ ٤٢).

ئەویش ئیسپاتکردنی (علو)ی خودایە ؛ چونکە بەرزکردنەوە (**الرفع**) بۆ جێگای بەرز و بڵند دەبێت .

هەروەها فەرمایشتی : ﴿ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِۚ ﴾،واتە: بەڵکو بەرزی کردەوە بۆلای خۆی، ئەمەش وەڵامی جولەکانە ئەوانەی کە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد گوایە عیسای کوڕی مەریەمیان کوشتووە، خوای پەروەردگار فەرمووی: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمۡۚ ﴾، واتە: نەیان کوشت و، نەتوانیشیان لە قەنارەی بدەن، وەکو خۆیان کردیانە هەرا، بەڵکو سەریان لێ تێکچوو بوو، پیاوێکیان دیت لە بیچم و شکڵدا وایان زانی (عیسا)یەو لەقەنارەیان دا . تاوەکو فەرمایشتی: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينَۢا﴾ [النساء :١٥٧] ،واتە: بەدڵنیاییەوە و بێگومان نەیانکوشتووە، ﴿ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِۚ ﴾،واتە : بەڵکو خودا بەزیندوویی بەرزی کردەوە بۆلای خۆی .

ئەمە مەوزوعی شاهیدە؛ چونکە ئیسپاتکردنی بەرزی و بڵندی خودای تێدایە بەسەر دروستکراوەکانیەوە ؛ چونکە بەرزکردنەوە عادەتەن بەرەو جێگای بەرز و بڵند دەبێت، گەرنا پێی ناوترێت بەرزکردنەوە .

هەروەها فەرمایشتی : ﴿إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ﴾ ، واتە: بۆلای ئەوبەرز دەبێتەوە، واتە بۆلای خودا نەك کەسانی تر ﴿ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ﴾، واتە : زیکر و قورئان خوێندن و پاڕانەوە ﴿وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥ﴾ ، واتە : کردەوەی چاکە (**الكلم الطيب**)بەرزدەکاتەوە، چونکە (**الكلم الطيب**) وەرناگیردرێت مەگەر لەگەڵ کردەوەی چاکەدا نەبێت، جا هەرکەسێك زیکر و یادی خودا بکات بەڵام فەرزەکانی جێبەجێ نەکات ئەوا زیکرەکەی ڕەتدەکرێتەوە، ئیاسی کوڕی موعاویە دەڵێت : «**لولا العملُ الصالح لم**

**يرفع الكلام**»[١]،واتە: گەر کردەوەی چاکە نەبوایە ئەوا کەلام و قسەی چاك و زیکر بەرز نەدەبووەوە.

حەسەن و قەتادە دەڵێن : «**لا يُقْبَلُ قولٌ إلا بِعمل**»واتە: قسە وەرناگیردرێت مەگەر بەهۆی کردەوەوە نەبێت.

**شایەتحاڵ لەئایەتەکەدا :**

ئیسپاتکردنی بەرزی و بڵندی خودای تێدایە بەسەر درووستکراوەکانیەوە ؛ چونکە وشەی(**الصعود والرفع**) بۆ بەرز بوونەوە بەرەو سەرەوە بەکار دێن .

وە فەرمایشتی: ﴿يَٰهَٰمَٰنُ ٱبۡنِ لِي صَرۡحٗا﴾، واتە:ئەی هامان! کۆشکێکی بەرزم بۆ درووست بکە، ئەمە وتەی فیرعەون بوو بۆ وەزیرەکەی بەناوی هامان کە فرمانی پێکرد بەوەی بینایەکی بەرزی بۆ دروست بکات ﴿لَّعَلِّيٓ أَبۡلُغُ ٱلۡأَسۡبَٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسۡبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ ، واتە : بەڵکو لێیەوە بگەمە ڕێگاکانی ئاسمانەکان یاخود دەرگاکانی ئاسمانەکان ﴿فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ﴾ بەنصبی (**فَأَطَّلِعَ**) بە(**أن**)ێکی (**مضمرة**)نادیار وشاراوە، لەدوای (**فاء السببية**)، ماناو مەبەستی لە قسەکەی ئەوەبوو : موسا ڕاست ناکات لەو قسەیەیدا گوایە خودا ناردوویەتی یاخود لەوەی خودایەکی هەبێت لەئاسمان ؛ هەربۆیەش گوتی : ﴿وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبٗا﴾ ، واتە : ومن پێم وایە درۆ دەکات، لەوەی کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکان یاخود لەو بانگەشەیەیدا کە گوایە خودایەکی هەیە لەئاسمان، **جا مەوزوعی شاهید لەم ئایەتەدا :**

ئیسپاتکردنی بەرزی و بڵندی خودایە بەسەر دروستکراوەکانیەوە، هەروەك موسا هەواڵیدا لەو بارەیەوەو فیرعەون هەوڵی بەدرۆخستنەوەی دەدا .

(١) تفسير ابن كثير (٥/ ٢٧٧).

هەروەها فەرمایشتی : ﴿ءَأَمِنتُم﴾ وشەی (الأمن) : دژی ترس و بیمە(خەوف) ﴿مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ ، [1]واتە : سزای ئەوەی لەئاسمانە کە ئەویش زاتی (الله)یە، ومانای (في السَّمَاءِ)لەئاسمان، واتە : (على السماء)لەسەر ئاسمان،واتە: لێرەدا (في) بەمانای (على)هاتووە، هاوشێوەی ئەم فەرمایشتەی خودا: ﴿ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِي جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ﴾[طه:٧١] [2] واتە: وە بەدار خورماکاندا هەڵتاندەواسم، تا خەڵکی تر پەند وەرگرن.

ئەمە گەر مەبەست لە ئاسمان (السماء) ئەو ئاسمانە بێت کە دەیبینین و، ئەگەر مەبەست لە ئاسمان (السماء) بەرزیەتی بێت ئەوا (في) بۆ (الظرفية)یەیە، واتە:

---

(١) ئیمامی موفەسیرین (ئیبن جەریری طەبەری) لە مانای [ ..من في السماء.. ]دا دەڵێت: مەبەست بەو (زاتە) لە ئاسمانە، هەر زاتی خوا خۆیەتی، وەک ئەهلی سوونەت و جەماعەت بە تێکڕا ئەو بڕیارەیان داوە! بۆ ئەو ڕاستیەش ئەو فەرمودەیە دەکەنە بەڵگە کە پێغەمبەر ﷺ لە کەنیزەیەکی پرسی: «أَيْنَ اللهُ»؟ واتە: خوا لە کوێیە؟. «قَالَتْ فِي السَّمَاءِ»، ئەویش گوتی: لە سەروووەیە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: «أَعْتِقْهَا فَإِنَّهَا مُؤْمِنَةٌ». دەسا ئازادی بکەن، چونکە خاوەن ئیمان و باوەڕە. صحيح مسلم، كتاب المساجد ومواضع الصلاة، باب تحريم الكلام في الصلاة، حديث: ٨٦٨. وە هەروەها تەفسیری (تيسير الكريم الرحمن)ی شێخ سەعدی لە تەفسیری: ﴿أم أمنتم من في السماء..﴾دا دەڵێت: (وهو الله تعالى، العَالِي عَلى خَلْقِه)، واتە: ئەوەی لەسەروەوەیە خودایەو بەرزو بڵندە بەسەر درووستکراوەکانیدا. وە زانایانی (سەلەف)یش دەڵێن: پیتی (في) لە [ في السماء ]دا بە مانای (على السماء)یە، هەروەک لە﴿ولأصلبنكم في جذوع النخل﴾- أي على جذوع النخل) بە مانای (على)یە، ئەمە ڕای زانایانە بۆ تەفسیری ﴿من في السماء﴾، ئیتر ئەوانەی کە دەڵێن: مەبەست بە [ من في السماء ] (جبریل)ـە، یان دەڵێن لەسەر ڕاوبۆچوونی عەرەبەکان هاتووە کە پێیان وابوو: خوا لە ئاسماندایە! ئینجا خواش لەسەر بیروبۆچوونی خۆیان قسەیان لەگەڵ دەکات.. دیارە ئەم هەموو بۆچوونەی دوایە لەگەڵ ڕۆحی قورئانەکەدا دورن و دەست نادەن، چونکە ئەوەی بتوانێ خەڵک نقوم بکات و لە ئاسمان بێت، یان زیخ ببارێنێ هەر خوایە. وەک لە ئایەتەکاندا هاتووە. (تەفسیری ڕامان).

(٢) إثبات علو الله على خلقه لأسامة القصاص (١/ ١١٩).

لەبەرزییەتی ﴿أَن يَخْسِفَ بِكُمُ الْأَرْضَ﴾،واتە : بتانباتە ناخی ئەرزدا هەروەك وای لەقارون کرد﴿فَإِذَا هِيَ تَمُورُ﴾ ، واتە : دەجولێ و دەلەرزێت .

﴿أَمْ أَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا﴾ ،واتە : بەردتان لەئاسمانەوە بەسەردا دادەبارێنێت، هەروەك دایباراند بەسەر گەلەکەی لوط و ئەسحابولفیلدا ، وگوتراوە : هەورێك کە بەردی تێدا بێت ، وگوتراوە : بایەك کە بەردی لەگەڵ بێت، ﴿فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ﴾، واتە: ئەوجا دەزانن تۆڵەی من چۆنە و ئەوکات زانین و دڵنیاییتان سودتان پێ ناگەیەنێت.

✍ **مەوزوعی شاهید لەم دوو ئایەتەدا:**

ئیسپاتکردنی بەرزی و بڵندی خودایە بەسەر دروستکراوەکانیەوە، هەروەك بەسەریحی ئەوەیان ڕاگەیاندووە کە خودا لەئاسمانە و، ئەو ئایەتانەی کە نووسەر هێناونی بەڵگەن لەسەر ئەوەی خودا لەجێگەیەکی بەرز و بڵندە، هەروەک ئایەتەکانی پێشووتریش بەڵگە بوون لەسەر ئەوەی خودا لەسەر عەرشە.

✍ **جیاوازی نێوان (الاستواء) و(العلو):**

١- بەرزیەتی (**العلو**) یەکێکە لەسیفەتە زاتیەکان، بەڵام بڵند بوونەوە (**الاستواء**) یەکێکە لەسیفاتە فیعلیەکان، جا (علو)ـی خودا وەسفێکی لازم و بەردەوامی زاتی خودایە، بەڵام ئیستیوا کارێکە لە کارەکانی خودا و، پەیوەستە بەویست و مەشیئەتی خوداوە و هەرکات ویستی لەسەر بێت ئەنجامی دەدات ؛ هەربۆیەش فەرموویەتی : ﴿ثُمَّ اسْتَوَىٰ﴾پاشان ئیستوائی کرد و جێگیر بوو، ئەوەش دوای درووستکردنی ئاسمانەکان و زەوی بوو .

٢- هەروەها (**العلو**)ـی خودا یەکێکە لەو سیفاتانەی کە بە ئەقڵ و نەقڵ سابت وجێگیر بووە، بەڵام (**الاستواء**) بەنەقڵ سابت وجێگیر بووە نەك ئەقڵ .

## [٢٠] ئیسپاتکردنی لەگەڵ بوونی خودا بۆ درووستکراوەکانی :

فەرمایشتی :﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۚ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۖ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤﴾ ﴾ [الحديد: ٤] ،واتە:هەر ئەو خوایە ئاسمانەکان و زەویی لە ماوەی شەش ڕۆژدا درووستکرد، لە پاشان بڵندبوویەوە بۆ سەر عەرش. بە بڵندبوونەوەیەک شایستەی زاتی خۆیبێت، دەزانێ چی دەچێت بەناو زەوییدا لە باران و جانەوەرو.. هتد، چییشی لێدەر دەچێ، لە ڕووەک و گژو گیاو میوەو..هتد، وە لە هەر جێگایەکیشدا بن ئەو (خوا)یەتان لەگەڵدایە، وە خوا بە هەموو کارەکانتان بینایە، هەر شتێک ئێوە ئەنجامی بدەن ئەو دەیبینێ . ﴿ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟ ۖ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٧﴾ ﴾ [المجادلة : ٧] ، واتە: ئایا نەتزانیوە کە خوا دەزانێ چی لە ئاسمانەکان و زەویدایە؟ هەر سێ کەسێک لەگەڵ یەکتردا چپە بکەن خوا چوارەمینیانە، وە هەر پێنج کەسێک چپە بکەن، خوا شەشەمیانە، وە لەو ژمارانەش کەمتر، یا زۆرتر، لە هەر کوێدابن هەر خوایان لە گەڵە، واتە: ئەوانە هەرچەند ببن، هەرچی بکەن، هەرچی بڵێن، لە هەر شوێنێکدا ببن، خوا لە گەڵیاندایەو ئاگای لە هەموو شتێکیانە. جا بۆ ماناو مەبەست لە ڕستەی (لە گەڵدابوون) سەیرێکی ئایەتی چوارەمی سورەتی (حەدید) بکە. پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا زۆر بە وردی هەواڵی هەموو ئەو کاروکردەوانەیان پێدەدا، بەڕاستی خوا بە هەموو شتێک زاناو ئاگایە، وفەرمایشتی :﴿ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ﴿٤٠﴾ ﴾ [التوبة : ١٤٠ ] ، واتە:ترست نەبێ، چونکە خوا لەگەڵمانە ، ﴿ إِنَّنِى مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ﴿٤٦﴾ ﴾ ، [طه : ٤٦] واتە: خوا دڵنیای کردن و فەرموی: مەترسن، بەڕاستیی

من لەگەڵ ئێوەم، هەموو شتێک دەبیستم و هەموو شتێکیش دەبینم ،﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ [النحل : ١٢٨] ، واتە: بەراستیی خواش لەگەڵ ئەوانەدایە کە خۆ پارێزو بەتەقوان، و ئەوانەش چاکەکارو، چاکەخوازن، ئەم لەگەڵ بوونەش تەنها خوا خۆی باش دەزانێت چۆن دەبێت ، ﴿ وَٱصْبِرُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾ [الأنفال : ٤٦] ، واتە:ئارامتان بێت- کاتێ بەدوژمن گەیشتن - چونکە دڵنیابن خوا لەگەڵ ئارامگراندایە ،﴿ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةًۢ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿٢٤٩﴾ ﴾ [البقرة : ٢٤٩] ، واتە: گەلێ جار بەفەرمانی خوا کۆمەڵێکی کەم بەسەر کۆمەڵێکی زۆردا سەرکەوتوون، واتە: زاڵبوون وسەرکەوتن بەژمارەی زۆرو کەم نیە، بەڵکو هەر بەویست و ئیرادەو فەرمانی خوایە، خوا هەمیشە لەگەڵ دەستەی بەئارام و خۆڕاگرانە و، هەردەم پشتگیریانە.

## شەرح

فەرمایشتی: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ﴾ تاوەکو: ﴿وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا﴾پێشتر ئاماژەمان بە تەفسیر ولێکدانەوەکەیدا ، وفەرمایشتی: ﴿ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ﴾ (١) ،

(١) لە قورئان و فەرموودەدا گەلێ جار باسی «**مەعیەت**»ی خوای گەورە هاتووە، بەتایبەت ئیمامی (بوخاریی و موسلیم) زۆرێکیان لەو بابەتانە هێناوە بە پێویستی نازانم ئەگینا هەندێکیانم دەنووسی. سەلەف -خوا لێیان ڕازی بێت- دەڵێن: خوا تێیگەیاندووین کە ئەو خۆی لەسەر عەرشی خۆیەتیی و ئاگایشی- لە هەموو شتێکەو، ئێمە لە هەر جێگایەکدا بین ئەومان لە گەڵدایە، واتە: زانیاریی و ئاگاداریی تەواوی بە هەموان هەیە. بەڵێ (**سەلەف**) بەو جۆرەیە تەفسیری مانای (مەعیەت) دەکەنەوە، بێ ئەوەی کە تێکەڵی دروستکراوەکانی بێ و بچێتە ناویانەوە!! بێگومان بیرکردنەوە لە مانای (**مەعیەت**) بەو شێوەیە کە گوایا تێکەڵ بە
=

واتە : خودا لەگەڵتان بەزانستی خۆی، وئاگادار و چاودێرە بەسەر کار و کردەوەکانتانەوە لەهەر جێگایەك بن، جا وشکانی بێت یاخود ڕووبار و دەریاکان، لەشەودا بێت یاخود ڕۆژ و لەماڵدا بن یاخود دەشت و چۆڵاییی وهەموو ئەمانە بەنیسبەت خوداوە یەکسانە، هەروەها گوێی لێتانە و دەتانبینێ و ئاگادارە بەجێگاکەتان و، ئەمە مەوزوعی شاهیدی ئایەتەکەیە، کە تێیدا ئیسپاتی لەگەڵ بوونی گشتی خودایی بۆ بەندەکانی کراوە ،﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ ، واتە: خودا زانا و ئاگادارە بەکردەوەکانتان وهیچیانی لێ شاراوە و نادیار نییە .

وفەرمایشتی : ﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ ﴾، واتە: نهێنی و شاراوە، وماناکەی: هیچ گفتوگۆیەکی نهێنی نییە لەنێوان سێ کەسدا ﴿إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ﴾ ، واتە : ئیللا خودا چوارەمینیانە، وهیچ پێنج کەسێك بەنهێنی گفتوگۆ ناکەن ئیلا خودا شەشەمیانە لەو ڕووەی کە ئاگاداری ئەو نهێنییە کە ئەوان لەنێوان خۆیاندا باسی دەکەن ولەخەڵکی دەشارنەوە و، تایبەت کردنی ئەو دوو ژمارەیە بە باسکردن ؛ لەبەر ئەوەیە زۆر جار ئەوانەی گفتوگۆی نهێنی دەکەن سێ دانەن یاخود پێنج کەسن، یاخود هۆکاری دابەزینی ئایەتەکە گفتوگۆی سێ کەس بوو لەڕوداوێکیاندا و پێنج کەسی دیکە لەڕوداوێکی تردا، گەرنا خودا لەگەڵ هەموو ژمارەیەکدا ئاگاداریانە جا زۆر بن یاخود کەم؛ هەربۆیە فەرموویەتی : ﴿وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ ﴾، واتە : ونەکەمتر لەو ژمارەیەیی کەباسکراوە وەك یەک و دوو، ونەزیاتر وەك شەش و حەوت ﴿إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ ﴾ ئیللا خودا لەگەڵیانە بەعیلم

---

= دروستکراوەکانی خۆی بێ، لە خواوە زۆر زۆر دوورە، بۆیە ئێمەیش خۆی چی پێ مەبەستە بڕوامان پێیەتی. (تەفسیری ڕامان).

وزانستی خۆی ئاگاداری ئەو گفتوگۆ نهێنیەیە، کە لەنێوان خۆیاندا دەیکەن و هیچ شتێك لەوانەی لا شاراوە نییە .

زانایانی تەفسیر دەڵێت[1]: مونافیق و جولەکەکان لەنێوان حۆیاندا بەنهێنی گفتوگۆیان دەکرد و وا باوەڕدارانیان تێ دەگەیان کە ئەوان لەنێوان خۆیاندا باسی شتانێك دەکەن دژی باوەڕدارانە بۆیە باوەڕدارەکانیش بێتاقەت بوون بەوکارە، کاتێ ئەم قسەو باسە درێژەی کێشا شکایەتی حاڵیان بردە لای پێغەمبەری خودا ﷺ، ئەویش فرمانی پێ کردن فسکە فسك وگفتوگۆی نهێنی نەکەن لەلای موسوڵماناندا، بەڵام ئەوان وازیان نەهێنا و بەردەوام بوون ؛ خوای پەروەردگاریش ئەم ئایەتانەی دابەزاند.

هەروەها فەرمایشتی : ﴿أَيْنَ مَا كَانُوا۟﴾ ماناکەی : دەورەدانی زانستی خودا بۆ هەموو فسکە فسك و گفتوگۆیەکی نهێنی جا لەهەر جێگایەك بێت. ﴿ثُمَّ يُنَبِّئُهُم﴾ واتە : پاشان هەواڵیان پێ دەدا﴿بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾ ،واتە: بەوەی دەیانکرد لەڕۆژی دواییدا و سزایان دەدات لەسەر ئەو کارە، ئەمەش جۆرێکە لەهەڕەش و چاوترساندن بۆیان،﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ ، واتە: بێگومان خودا زانا و ئاگادارە بەهەموو شتێك و هیچ شتێك لای ئەو نهێنی و شاراوە نییە.

**✍ شایەتحاڵ لەئایەتەکەدا:**

ئیسپاتکردنی لەگەڵ بوونی خودای تێدایە بۆ دروستکراوەکانی، ئەوەش لەگەڵ بوونێکی گشتیە وبەمانای دەورەدان و پەیپێبردن و عیلم و زانست بوونە بەهەموو کردەوەکانیان؛ هەربۆیە پێشەوا ئەحمەد دەفەرمووێت: «**افتتح الآية بالعلم واختتمها بالعلم**». واتە: سەرەتای ئایەتەکەی بەزانست(عیلم) دەست پێکرد و هەر بەزانست(عیلم)یش کۆتایی پێهێنا.

---

(۱) تفسير ابن كثير (٦/ ١٤٨)، وتفسير الشوكاني (٥/ ١٨٤).

هەروەها فەرمایشتی : ﴿لَا تَحْـزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَـا﴾ ، واتە: دڵگران مەبە خودامان لەگەڵدایە، ئەمە قسەی پێغەمبەر ﷺ بوو بۆ هاوەڵەکەی کە ئەبوبەکری سیدیق بوو کاتێ کە لەئەشکەوتی حەڕادا بوون لەکاتی کۆچکردنیان لەمەککەوە بۆ مەدینە و هاوبەشدانەران شوێنیان کەوتبوون، ئەبوبەکر ترسی لێ نیشتبوو لەوەی کافرەکان بیانبینن و ئازاری پێغەمبەر ﷺ بدەن، بۆیە ئەویش پێی فەرموو : ﴿لَا تَحْـزَنْ﴾ ، واتە : مەترسە ودڵگرانە مەبە ئێمە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَـا﴾ ، خودامان لەگەڵە بەهاریکاری و پشتیوانی خۆی، هەرکەسێکیش خودای لەگەڵ بێت هەرگیز کەس زاڵ نابێت بەسەریدا، ئەوەش توشی شکست نەبێت بۆی نییە ترسی هەبێت و دڵتەنگ بێت .

✍ **شایەتحاڵی ئایەتەکە:**

ئیسپاتی لەگەڵ بوونێکی تایبەتی تێدایە بەوەی خودا لەگەڵ باوەڕدارانە بەمانای سەرخستن و پشتیوانی کردن.

وە فەرمایشتی خودا بۆ موسا و هارون (علیهما السلام) : ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ﴾ ، واتە : ترستان لەفیرعەون نەبێت من لەگەڵتانم دەتانبینم و گوێشم لێتانە، بڕگەی ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَآ﴾ ڕوونکردنەوەی هۆکاری ڕێگری کردنە لەترس، واتە: مەترسن؛ چونکە من بەسەرخستنی خۆم لەگەڵتانم و لەپشتانم و پشتیوانیتان لێ دەکەم دژ بەفیرعەون ﴿أَسْمَعُ﴾گوێم لەقسەی ئێوە و فیرعەونیشە و جێگای ئێوە و ئەویش دەبینم و هیچ شتێکی ئێوە بەلای منەوە شاراوە نییە.

✍ **شایەتحاڵ لەئایەتەکەدا:**

لەگەڵ بوونێکی تایبەتی تێدایە لەلایەن خوداوە بۆ خۆشەویستەکانی کە ئەویش لەگەڵ بوونی سەرخستن و پشتیوانی لێ کردنە، هەروەك ئیسپاتی چاو و گوێشی تێدایە بۆ زاتی الله، وفەرمایشتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ ﴾،واتە : خودا لەگەڵ

تەقوادارانە، ئەوانەی کە وازیان لەحەرامکراوەکان بەهەموو جۆرەکانیەوە هێناوە ﴿وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ﴾،واتە: ئەوانەی کە چاکەکارن بەئەنجامدانی هەموو تاعەت و عیبادەتەکان و هەستان بەوەی فرمانیان پێکراوە، خوای پەروەردگار لەگەڵ ئەو کەسانەیە بەیارمەتی دان و سەرخستن، ئەمە لەگەڵ بوونێکی تایبەتە، وە هەر ئەوەش مەوزوعی شاهیدە لەم ئایەتە پیرۆزەدا.

هەروەها فەرمایشتی: ﴿ وَٱصۡبِرُوٓاْ ﴾ ، واتە: ئارام گر بن، ئەمە فرمانە کردنە بەئارامگرتن، کە ئەویش بریتییە لە گرتنەوەی نەفس و، لێرەدا مەبەست لێی: ئارام گرتنە لەسەر ناخۆشیەکانی جەنگ ئەوەی کەلەنێوان موسوڵمانان و کافراندا ڕووی دەدا، پاشان هۆکاری ئەو فرمانەی ڕوونکردووەتەوە و فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ ،واتە: بەڕاستی خودا لەگەڵ ئارامگرانە، خوای پەروەردگار لەگەڵ ئارامگرانە لەهەرکارێکدا کە پێویست بێت ئارامی لەسەر بگیردرێت.

✍ **شایەتحاڵ لەئایەتەکەدا:**

ئیسپاتکردنی لەگەڵ بوونی خودا بۆ بەندە ئارامگرەکانی ئەوانەی ئارام دەگرن لەسەر تاعەت و عیبادەتی خودا و جیهاد دەکەن لەپێناو خودادا، پێشەوا شەوکانی دەڵێت : «**ويا حبذا هذه المعية التي لا يغلب من رزقها، غالب، ولا يؤتى صاحبها من جهة من الجهات وإن كانت كثيرة**»[1]، واتە: ئای ئەمە چ لەگەڵ بوونێکە کە ئەوەی پێی ببەخشرێت هەرگیز نادۆڕێت و ناشکێت و، خاوەنەکەی هیچ شتێك لەوە باشتری پێ نەبەخشراوە لەهەر لایەکەوە هەرچەند زۆریش بێت.

هەروەها فەرمایشتی : ﴿كَم مِّن فِئَةٖ قَلِيلَةٍ غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ﴾ وشەی (الفئة) واتە : کۆمەڵ کەسێك ﴿بِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾ ،واتە : بەویست و قەزاو

(١) فتح القدير (٣١٢).

قەدەر و مەشیئەتی خودا ﴿وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ ئەمە مەوزوعی شاهیدە لەئایەتەکەدا، کەبریتیە لەئیسپاتکردنی لەگەڵ بوونی خودا بۆ ئەوکەسانەی کە ئارام دەگرن لەجیهاد وتێکۆشان لەپێناوی خودادا، ئەمە لەگەڵ بوونێکی تایبەتە و مەبەست لێی سەرخستن و پشتیوانی لێ کردنە .

**ئەو سوودانەی کە لەهەموو ئەو ئایەتانەی پێشوو وەردەگیردرێت:**
لەگەڵ بوونی ئیسپات کردووە، ئەوەش دوو جۆرە[1] :

**جۆری یەکەم:** لەگەڵ بوونێکی عام وگشتگیر، هەروەك لەدوو ئایەتەکەی یەکەم دا هاتووە، مەبەست لەم لەگەڵ بوونە پەیبردنی خودایە بەهەموو درووستکراوەکانی و هەموونی زانیاری خودایە بەکار وکردەوەکانیان بەچاك و خراپەوە و پاداشت دانەوەیان و سزا دانیان لەسەری .

**جۆری دووەم** : لەگەڵ بوونێکی تایبەت و خاصە کە تایبەتە بەبەندە باوەڕدارەکان و، مەبەست لێی پاراستن و سەرخستن و پشتیوانی لێ کردنە، ئەم جۆرە پێنج ئایەتەکەی تر کە نووسەر هێناویەتی دەبنە بەڵگە بۆی .

شایەنی باسە لەگەڵ بوونی خودا پێچەوانەی علو و بەرزیەتی خودا نییە بەسەر دروستکراوەکانیەوە، هەروەها پێچەوانەی لەسەر عەرش بوونی خودا نییە، چونکە بەڕاستی لەگەڵ بوونی خودا و نزیکیەتی هاوشێوەی نزیکی و لەگەڵ بوونی دروستکراوەکان نییە، لەبەر ئەوەی پەروەردگار ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ [الشورى: ١١] ،واتە: هیچ شتێك هاوشێوەی ئەو نییە و بیسەر وبینایە.

---

(١) مجموع الفتاوى (٥/ ١٧٩)، ومختصر صواعق المرسلة (٤٥٦)، ومعارج القبـول (١/ ٢٦٧)، والتنبيهات السنية للرشيد (١٣٥- ١٣٦).

هەروەها لەگەڵ بوون تەنها ئەو لەگەڵ بوونە ناخوازێت کە ئێمە لێی تێدەگەن، کە ئەویش تێکەڵ بوون و بەریەککەوتنە، عەرەب دەڵێت: (**ما زلنا نمشي والقمر معنا**)واتە: بەردەوام بەڕێوەین و مانگ لەگەڵمانە. لەکاتێکدا مانگ لەئاسمانە ودووری نێوانیان زۆر زۆرە، جا بۆیە بەرزی و بڵندی خودا و لەگەڵ بوونی دروستکراوەکانی هیچ دژ یەکیەك لەنێوانیاندا نییە.



## [٢١] ئیسپاتکردنی کەلام بۆ خودا (جل جلاله) :

وفەرمایشتی:﴿ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثًا ﴿٨٧﴾ ﴾ [النساء: ٨٧] ، واتە: جاکێ لە خوا قسەو گوفتاری ڕاسترە؟!،﴿ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلًا ﴿١٢٢﴾ ﴾ [النساء : ١٢٢] ،واتە: جا چ کەسێک لەخوا ڕاست بێژترە لەبڕیارەکانیدا؟،﴿ وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَـٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ﴿١١٦﴾ ﴾ [المائدة : ١١٦] ، واتە:ئەوکاتەش وەبیر بێنە، کە خوای کارزان لە ڕۆژی قیامەتدا بە عیسای کوڕی مەریەم دەڵێ ،﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴿١١٥﴾ ﴾ [الأنعام: ١١٥] ، واتە: و گشت وتەکانی پەروەردگارت (قورئان) و سەرجەم بڕیارەکانی، لە ڕاستیی ودادگەرییدا، تەواو بەپایان گەیشتوون و بێ وێنەن ،﴿ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾ ﴾ [النساء:١٦٤] ، واتە:خوای میهرەبان بۆ خۆی ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵ مووسادا کردووە، بۆیە پێی دەگوترێ (کەلیم) ،﴿ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ ﴿٢٥٣﴾ ﴾ [البقرة : ٢٥٣] ، واتە: هەیانە یەکسەرە خوا خۆی قسەی لەگەڵ کردووە، وەک (مووسا) و(موحەممەد) سڵاویان لێبێت ﴿ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَـٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ ﴿١٤٣﴾ ﴾ [الأعراف : ١٤٣] واتە: دواتر زیاتر ئەم بابەتە ڕوون دەکەینەوە إن شاء الله .
واتە:ئەوسا کە موسا هات بۆشوێنی موناجاتەکە لە گەڵمان، و پەروەردگاری کەوتە قسەو گفتوگۆ لەگەڵیی و گوێی لەدەنگییەوەبوو، ﴿ وَنَـٰدَيْنَـٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَـٰهُ نَجِيًّا ﴿٥٢﴾ ﴾ [مريم:٥٢] ، واتە: لەلای ڕاستی کێوی (طور)ـەوە بانگمان کردو، بەبێ هۆو واسیتەش وتووێژمان لەگەڵ کرد، ئیمامی (تەبەریی) دەڵێ: ئەو دەمە کە مووسا لە (مەدیەن)ـەوە گەڕایەوە بۆ (میسر) کێوەکە دەکەوتە لای ڕاستییەوە. وە لەخۆشمان نزیکمان کردەوە تا بەنهێنی قسەو گفتوگۆی لەگەڵ بکەین،﴿ وَإِذْ نَادَىٰ

رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ ﴾ [الشعراء: ١٠] ، واتە: ئەو کاتە وە بیـربێنە کە پەروەردگارت لەلای کێوی طوردا موسای بانگکرد: کە بچۆ بۆلای ئەو گەلە ستەمکارە، ئەوانەی ستەمیان هەم لە خۆیان و، هەم لە گەلی بەنی ئیسرائیل کردووەو کردوویانن بە کۆیلە، ﴿ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ ﴿٢٢﴾ ﴾[الأعراف: ٢٢] ، واتە:ئەوسا پەروەردگاریان بانگیکردن: ئایا ڕێم لێ نەگرتن لەو درەختە بخۆن؟ ،﴿ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبْتُمُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٦٥﴾ ﴾ [القصص : ٦٥] ، واتە:و ئەو ڕۆژە بە یاد بکە خوا بانگیان دەکاو پێیان دەفەرمووێ: چیتان وەڵامی پەیامبەرەکان دایەوە؟ ،﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ﴿٦﴾ ﴾ [التوبة : ٦] ، واتە: ئەگەر یەکێک لەو موشریکانە پەنای پێهێنایت، پەنای بدە، داڵدەی بدە، هەتا بەباشی فەرمایشتی خوا دەبیستێ و لێی حاڵی دەبێ، واتە: قورئانی بۆ دەخوێنیت و لێی تێدەگات،﴿ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ ﴾ [البقرة : ٧٥] ، واتە:خۆ دەستەیەکیشیان فەرموودەو قسەی خوایان بیست و لەپاشان دوای تێگەیشتن لێی، هەڵسان واتاو ماناکەیان گۆڕی! دەشیانزانی لایان داوەو کارێکی هەڵەیان کردووە، بەڵام لەبەر عینادیی و سەرپێچییان، کۆیان نەکردەوەو دەسبەردار نەبوون، کەوابوو هەرگیز ئێوە بە تەمای ئیمانی ئەوانە مەبن، لەولایشەوە ، ﴿ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ۚ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ ﴿١٥﴾ ﴾ [الفتح : ١٥] واتە: دەیانەوێت کە فەرمایشتی خوا بگۆڕن، واتە: بە بەشدار بوونیان لە غەنیمەت و دەسکەوتەکانی خەیبەر، چونکە خوا- جل جلاله- بەڵێنی دابوو بە ئەهلی حودەیبییە کە دەسکەوتەکانی خەیبەر هەر بۆ ئەهلی حودەیبییە دەبێ نەک کەسانی تر. [ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا ] پێیان بڵێ: نابێ هەرگیز لە شوێنمان بێن، خوا پێش گەڕانەوە لە حودەیبییە

**وایفەرمووە کە نابێ هیچ کەستان بەشدار بێت لەو دەستکەوتانەی حودەیبییەدا ،﴿ وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ ﴿٢٧﴾ ﴾ [الكهف: ٢٧] ، واتە: ئەی پێغەمبەر! هەرچی لە قورئان و کتێبەکەی پەروەردگارتدا بەوەحی بۆت هاتووە، بیخوێنەوەو کاری پێبکەو، تەنها تۆزقاڵەیە لێی لانەدەیت، و نابێ کەسێک بڕیارو وشەکانی خوا بگۆڕێ، ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَكۡثَرَ ٱلَّذِي هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾ ﴾ [النمل: ٧٦] ، واتە:بێگومان ئەم قورئانە «کە بۆمان ناردوویت» زۆربەی ئەو شتانەی کە جوولەکە ناکۆکیی و کێشەیانە لەسەری، باسی دەکات بۆیان. «جا کەوایە هەقبوو ئەوانە دوای بکەوتنایە تا هەق و ناهەقیان بۆ دەرکەوتایە» .**

---

## شەرح

فەرمایشتی: ﴿وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ ﴾، واتە: هیچ کەسێك ڕاستگۆتر نییە لەخودا، ئەمە پرسیاری نکۆڵی کردنە ﴿حَدِيثٗا ﴾ واتە : لەقسە و هەواڵ و فرمان و پەیمان و هەڕەشەیدا، وە فەرمایشتی :

﴿وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلٗا ﴾ وشەی(القيل) : مەصدەری (قال)ـەیە وەك **(القول)** ، واتە : هیچ کەسێك نییە قسەی لەقسەی خودا ڕاستر بێت .

✍ **شایەتحاڵ لەم دوو ئایەتە پیرۆزەدا:**

لەم دوو ئایەتەدا ئیسپاتی **(الحديث والقيل)** کراوە بۆ زاتی (الله سبحانه وتعالى) و، تێیاندا ئیسپاتی کەلام کراوە بۆ خودا .

هەروەها فەرمایشتی: ﴿وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ﴾ ، واتە : بیریان بێنەوە و بۆیان باسبکە﴿وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ﴾ جمهوری زانایانی تەفسیر دەڵێن[١] ئەم قسەی خودا لەڕۆژی دواییدا دەبێت و، ئەوە سەرزەنشتی ئەوکەسانەیە کە پێغەمبەر عیساو دایکیان پەرست لەمەسحیەکان، هاوشێوەی دوو ئایەتەکەی پێشوو ئیسپاتی قەولی تێدایە بۆ خودا و خودا قسە دەکات گەر بیەوێ و ویستی لەسەربێت .

هەروەها فەرمایشتی : ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا﴾ مەبەست لە(**الكلمة**) کەلامی خودایە . وفەرمایشتی : ﴿صِدْقًا﴾ واتە : ڕاستگۆ لەهەواڵیدا و﴿وَعَدْلًا﴾ ، واتە : دادپەروەر لەئەحکامەکانیدا، و﴿صِدْقًا وَعَدْلًا﴾ مەنصوبن بەهۆی ئەوەی تەمییزن، لەئایەتەکەدا ئیسپاتی کەلام کراوە بۆ زاتی خودا (جل جلاله).

هەروەها فەرمایشتی: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا﴾ئەمە ڕێز و تەشریفە بۆ موسا(علیه السلام) بەوەی خودا قسەی لەگەڵ کرد، واتە: قسەکەی خۆی دا بەگوێیدا؛ هەر لەبەر ئەمەشە پێی دەوترێت : (**الكليم،وتكليمًا**) مەصدرە و جەخت لە وشەی ﴿كلّم﴾دەکات بۆ ئەوەی گومانی مەجاز نەهێڵێت لەقسەکردندا. ولەئایەتەکەدا ئیسپاتی کەلام کراوە بۆ خودا و، خودا قسەی لەگەڵ موسادا (علیه السلام) کردووە .

هەروەها فەرمایشتی : ﴿مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ﴾ ، واتە : هەندێ لەپێغەمبەران قسەیان لەگەڵ خودادا کردووە﴿مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ﴾ ، واتە : گفتوگۆیان لەگەڵ خودادا کردووە بەبێ واستە، لەوانە: موسا وموحەمەد (علیهما الصلاة والسلام)، هەروەها ئادەم هەروەك لە [صحيح ابن حبان]دا هاتووە[٢]، لەئایەتەکەدا : ئیسپاتی کەلام کراوە بۆ خودا و، خودا قسەی لەگەڵ هەندێ لە پێغەمبەراندا کردووە . وە فەرمایشتی : ﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ

---

(١) تفسير ابن كثير (٢/ ٦٥١)، وفتح القدير (٢/ ٩٥).

(٢) كتاب التأريخ، باب بدء الخلق، رقم (٦١٦٢)، والبخاري (٣٣٢٦)، ومسلم (٢٨٤١).

﴿لِمِيقَٰتِنَا﴾ ، واتە: هاتنەکەی ئەوکاتە بوو کە خودا وەعدی پێدا بوو تێیدا ﴿وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ﴾ ، واتە: قسەی لەگەڵ کرد بەبێ هیچ واستە و نێوەند گیرێك، لەم ئایەتانەدا ئیسپاتی کەلام کراوە بۆ خودا و، خودا قسەدەکات هەرکات بیەوێت و، گفتوگۆی لەگەڵ موسا کرد بەبێ واستە و نوەندگیر.

هەروەها فەرمایشتی: ﴿وَنَٰدَيْنَٰهُ﴾ ، واتە : خودا بانگی لەموسا (علیه السلام) کرد، و(**النداء**) : بریتییە لەبانگکردن بەدەنگێکی بەرز،﴿مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ﴾ و(**الطور**) : کێوێکە لەنێوان میسر و مەدیەندایە﴿ٱلْأَيْمَنِ﴾ ، واتە : لەلای ڕاستی موساوە کاتێ کە چوو بەشوێن ئەو ڕووناکیەیی کە لەدوورەوە بینی، مەبەست لێی لای ڕاستی خودی کێوەکە نییە، چونکە کێو ڕاست و چەپی نیە . ﴿وَقَرَّبْنَٰهُ﴾ ، واتە : نزیکمان خستەوە تاوەکو قسەمان لەگەڵ کرد ﴿نَجِيًّا﴾ ،واتە: (**مناجیاً**) بەدەنگی نزم موناجاتمان لەگەڵ کرد ، و(**المناجاة**) پێچەوانەی(**المناداة**) .

**✍ئەوەی تێبینی دەکرێت لەم ئایەتە پیرۆزەدا:**

ئیسپاتی کەلام کراوە بۆ خودا و، خودا بانگ دەکات و بەدەنگی نزیمیش موناجات و گفتوگۆ دەکات، ئەم دووە ، واتە: (**المناجاة**)و(**المناداة**) دوو جۆر کەلامن، و بانگکردن (**المناداة**) : بەدەنگی بەرز دەبێت، و گفتوگۆ (**المناجاة**) : بەدەنگی نزم دەبێت .

هەروەها فەرمایشتی: ﴿وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ﴾واتە: بخوێنە، یاخود ئەوە بیربهێنەرەوە،﴿وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ﴾ وشەی: (**النداء**) : بریتیە لەدوعا و پاڕانەوە ﴿أَنِ ٱئْتِ﴾: دروستە وشەی (**أن**)تەفسیری بێت و، دروستیشە مەسدەری بێت، واتە: برۆ﴿ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بۆلای گەلی ستەمکار، لێرەدا بەستەم وەسفی کردوون؛ چونکە ئەوان دوو شتیان پێکەوە کۆ کردبووەوە دانەیەکیان کوفر کە بەوەش ستەمیان لەخودی

خۆیان کرد و، تاوان وسەرپێچی بەمەش ستەمیان لەغەیری خۆیان کرد وەك کردنی بەنی ئیسرائیل بە کۆیلەی وسەربینی کۆرەکانیان.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئیسپاتی کەلام کراوە بۆ خودا، هەروەها ئیسپاتی ئەوەش کراوە کە خودا بانگی کەسانێك دەکات و ئەوانیش گوێبیستی وتەکانی دەبن .

فەرمایشتی: ﴿وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ﴾ ، واتە : خودا بانگی لەئادەم و حەوا کرد (علیهما السلام) و پێی فەرموون : ﴿أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ﴾ ،واتە : ئایا رێگریم لێ نەکردن لەخواردنی بەری ئەو دارە؟!، ئەمەش جۆرێك بوو لەسەرزەنشت کردن بەهۆی ئەوەی ئەوان فرمانی خودایان شکان و ئەو ئاگادارکردنەوەیەیی خودایان بەجدی وەرنەگرت.

✍ **ئەوەی تێبینی دەکرێت لەم ئایەتە پیرۆزەدا:**

ئیسپاتی کەلام کراوە بۆ خودا و ئیسپاتی بانگکردنی ئەو بۆ ئادەم و حەوای خێزانیشی کراوە.

فەرمایشتی: ﴿ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ﴾ ، واتە : وئەو رۆژەی بانگیان دەکات، خوای پەروەردگار لەرۆژی دوایدا بانگی ئەو هاوبەشدانەرانە دەکات﴿فَيَقُولُ﴾ پێیان دەڵێت: ﴿مَاذَآ أَجَبْتُمُ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ ، واتە : وەڵامتان چی بوو بۆ ئەو پێغەمبەرانەی کە بۆتان نێردرابوون کاتێ کە پەیمانی منیان پێگەیاندن.

✍ **شایەتحاڵی لەئایەتەکە:**

ئیسپاتی کەلامە بۆ خودا و، خودا لەرۆژی دوایدا بانگ دەکات .

فەرمایشتی: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾،واتە: گەر یەکێك لەهاوبەشدانەران ئەوانەی فرمانت پێکراوە بەجەنگان لەگەڵیان ﴿ٱسْتَجَارَكَ﴾، واتە: داوای پەنادان وپاراستنی لێ کردی ئەی موحەممەد ئەوا ﴿ فَأَجِرْهُ﴾، واتە : ئەوا پەنای بدەو

بپارێزە﴿حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ﴾، واتە: تاوەکو گوێبیستی کەلامی خودا دەبێت لەدەمی تۆوە و تێی دەفکرێت و لەهەقیقەتی بانگەوازەکەت دەگات .

**✍ شایەتحاڵ لەئایەتەکەدا:**

تێیدا ئیسپاتی کەلام کراوە بۆ خودا و، ئەوەی دەخوێندرێتەوە کەلامی خودایە و،

فەرمایشتی : ﴿وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ﴾، واتە : وکۆمەڵێك لەوانە کەمەبەس لێی جولەکەیە، و(**الفريق**) : ناوێکی کۆیە و لە لەفزەکەی خۆیدا وشەی تاکی نییە ﴿يَسْمَعُونَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ﴾، واتە : گوێبیستی کەلامی خودا (تەورات) دەبن ﴿ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ﴾، واتە : دواتر ماناکەی دەگۆڕن و مانا هەقیقیەکەی خۆی نادەنێ﴿مِنۢ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ﴾ ، واتە : دوای ئەوەی لێی تێدەگەن، لەگەڵ ئەوەشدا پێچەوانەی دەجولێنەوە ﴿وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾لەکاتێکدا دەزانن هەڵەن لەو تەحریف و مانا گۆڕینەدا.

**✍ ئەوەی تێبینی دەکرێت لەم ئایەتە پیرۆزەدا:**

لەم ئایەتەدا ئیسپاتی کەلامی تێدایە بۆ خودا و، تەورات کەلامی خودایە و، جولەکە تەحریفیان کرد و ماناکەیان گۆڕی.

فەرمایشتی : ﴿يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ۚ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ﴾، وشەی (**يُريدُون**) واتە: ئەو دەشتەکیانەی کە دواکەوتوون و مانەوەیان لەناو ماڵ و منداڵدا هەڵبژارد وماڵ و منداڵ سەرقاڵی کردن و لەگەڵ پێغەمبەردا دەرنەچوون لەساڵی حودەبیەدا، ﴿أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ۚ﴾ ، واتە : کەلامی خودا بگۆڕن بەتاییەت ئەوەی کە پەیمانی پێدا بوو بەئەهلی حودەیبیە بەدەستکەوت و غەنیمەتی خەیبەر ، ﴿قُل لَّن تَتَّبِعُونَا﴾ ئەمە نەفیە بەڵام بەمانای نەهی دێت، واتە: (**لا تتبعونا**)واتە: شوێنمان مەکەون، ﴿كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ﴾ ،واتە : خودا

پەیمانی بەئەهلی حودەیبیە دا بەوەی دەستکەوت و غەنیمەتی خەیبەر تەنها بۆ ئەوانە[١] .

**✍ شایەتحاڵی لەئایەتەکە:**

ئیسپاتی کەلام و قسەی تێدایە بۆ خودا و، خودا قسەدەکات و شت دەڵێت هەرکات بییەوێت و ویستی لەسەر بێت و، درووست نییە کەلامەکەی بگۆڕدرێت، بەڵکو پێویستە کاری پێبکرێت و جێبەجێ بکرێت .

فەرمایشتی : ﴿ وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ ﴾، خوای پەروەردگار فرمان بەپێغەمبەرەکەی دەکات پارێزگاری بکات لەخوێندنەوەی ئەو قورئانەی کە بەوەحی بۆی ناردوە،﴿مِن كِتَابِ رَبِّكَۖ ﴾ ڕوونکردنەوەی ئەوەیە کە بۆی نێردراوە، ﴿لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ ﴾، واتە : هیچ گۆڕەر و لادەر و تەحریف کارێکی نییە و کەس توانای گۆڕینی بڕیاری خودای نییە .

**✍ شایەتحاڵی لەئایەتەکە:**

ئیسپاتکردنی کەلام بۆ خودا .

فەرمایشتی : ﴿إِنَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴾ ، واتە:بێگومان ئەم قورئانە «کە بۆمان ناردوویت» زۆربەی ئەو شتانەی کە جوولەکە ناکۆکیی و کێشەیانە لەسەری، باسی دەکات بۆیان. «جا کەوایە هەقبوو ئەوانە دوای بکەوتنایە تا هەق و ناهەقیان بۆ دەرکەوتایە»، مەبەست لێی هەڵگرانی تەورات و ئینجیلە﴿أَكۡثَرَ ٱلَّذِي هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ﴾وەك خیلاف و ڕا جیاییان لەبارەی عیساوە، جولەکە درۆیان بەدەمیەوە کرد و، نەصرانیەکان زێدەڕۆییان تێدا کرد . قورئان هات و قسەی وەسەتی

---

(١) تفسير ابن كثير (٥/ ٦٢٠).

کرد لەو نێوەندەدا و فەرمووی: عیسا بەندە و پێغەمبەر و کەلیمەی خودایە و، ئاراستەی مەریەمی کرد و ڕوحی خودایە .

**✍ شایەتحاڵی لەئایەتەکە:**

ئیسپاتکردنی ئەوەی تێدایە کە قورئان کەلامی خودایە لەبەر ئەوەی هەموو بابەتەکانی کتێبە ئاسمانییەکانی پێشووی لەخۆ گرتووە، هەروەها حوکم کردنی بەدادپەروەرانە لەنێوان تاقمەکانی ئەهلی کیتاب و، ئەوەی ئەمە حاڵی بێت تەنها لەلایەن خوداوەیە.

**✍ سود و فائیدەی هەموو ئەو ئایەتانەی کە نووسەر هێناویەتی:**

ئیسپاتکردنی کەلام بۆ خودا و، مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەماعە لەم بابەتەدا: ئیسپاتکردنی هەموو ئەو شتانەیە کە قورئان و سونئە بوونەتە بەڵگە لەسەری لەوانە خوای پەروەردگار وەسف کراوە بەکەلام، وکەلامی خوداش یەکێکە لەسیفاتە زاتیەکان لەبەر ئەوەی پەیوەستە بەخوی خوداوە و خودا وەسف کراوە پێی. ولەهەمان کاتدا سیفاتی فیعلیشە؛ لەبەرئەوەی بەویست و خواستی دێتە بوون و، خودا قسەدەکات گەربیەوێت و، چۆن بیەوێت و، بەوەی بیەوێت، هەر قسەکەر و موتەکەلیم بووە و، بەردەوامیش قسەکەر و موتەکەلیمە؛ چونکە هەر لەئەزەلەوە کامڵ بووە، کەلامیش سیفەتی کەماڵە، هەروەها لەبەر ئەوەی خودا وەسفی خۆی پێکردووە و پێغەمبەرەکەشی وەسفی پەروەردگاری پێکردووە.

دواتر مەزهەب و بۆچوونی ئەوانە باسدەکرێت کەموخالیف و جیاوازن و خیلافیان درووست کردووە لەم بابەتەدا لەگەڵ ڕەتدانەوە و وەڵامدانەوەی بۆچوونەکانیان ـ إن شاء الله ـ .

## [٢٢] ئیسپاتکردنی دابەزاندنی قورئان لەلایەن خوداوە:

فەرمایشتی :﴿ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ مُبَارَكٌ ﴿١٥٥﴾ ﴾ [الأنعام: ١٥٥]، واتە:ئەم قورئانەش ناردمانە خوارێ کتێبێکی پیرۆزو پڕ پیتە ،﴿ لَوۡ أَنزَلۡنَا هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ عَلَىٰ جَبَلٖ لَّرَأَيۡتَهُۥ خَٰشِعٗا مُّتَصَدِّعٗا مِّنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِ ﴿٢١﴾ ﴾ [الحشر: ٢١] ، واتە: ئەگەر «گریمان» ئەم قورئانەمان دابەزاندایە سەر کێوێک، کە دەرکی کردبا بەوەی تیایەتی، ئەو دەمە دەتبینی بە کزیی و پارە پارە بوویی لە ترسی خوا! کەوابوو ئێوە بیرێ بکەنەوە ئەی ئادەمیزادەکان! لە خوا بترسن و تەنها قورئان بکەنە بەرنامەی خۆتان،﴿ وَإِذَا بَدَّلۡنَآ ءَايَةٗ مَّكَانَ ءَايَةٖ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مُفۡتَرِۭۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿١٠١﴾ قُلۡ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلۡقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّ لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهُدٗى وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ ﴿١٠٢﴾ وَلَقَدۡ نَعۡلَمُ أَنَّهُمۡ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٞۗ لِّسَانُ ٱلَّذِي يُلۡحِدُونَ إِلَيۡهِ أَعۡجَمِيّٞ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيّٞ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ ﴾ [النحل: ١٠١،١٠٣]، واتە: هەر کات ئێمە ئایەتێک بە ئایەتێکی تر بگۆڕین و لابەرین، وەیان ئایەتێکی تر لەجێی ئەو دابنێین، و خوا بۆ خۆی زاناترە بەوەی دایدەبەزێنێ، واتە: ئەوچاک دەزانێت چ شتێ چاکە بۆ ئێستاو بۆ ئاییندەو کامەش هەڵگرێ و بیسڕێتەوە، کەچی ئەوەندە کەودەن و نەفامن لەوەڵامدا دەیانوت: ئەی موحەممەد! تۆهەر درۆ هەڵدەبەسیت، بۆیە بەو شێوەیەو بەئارەزووی خۆت هەر رۆژەی ئاڵ و گۆڕێ دەکەیت، ئەمڕۆ شتێک دەڵێیت و، سبەینێ شتێکی دیکە، نا، تۆ درۆ هەڵبەست نیت، بەڵکو ئەوانە زۆربەیان بۆخۆیان نەزانن و، لەحیکمەتی خوا تێناگەن، بۆیە وا رەخنەی بێجێ دەگرن و تەسلیم نابن .تۆ لە وەڵامیاندا بڵێ: (روح القدس)ی (جوبریل)ـە کە لەلای پەروەردگارتەوە بەحەق و دادگەرانە دایبەزاندووە، تا ئەوانەی بڕوایان هێناوە دامەزراوو دڵنیا بکات، وەهیدایەت و ڕێنمایی و، مژدە بێ بۆ

**موسڵمانان.سوێندبێ ئێمەش چاک دەزانین کەئەوانە پێت دەڵێن: هەر ئادەمیە کە ئەم قورئانەی فێر دەکات، مەبەستیان لە کابرایەکی رۆمی بوو!خۆ زمانی ئەوکەسەی ئەوان نیازیانە ئەم قورئانە بدەنە پاڵی ئەو عەجەمییەو لە عارەبیش نەزان و کۆڵە، ئەم قورئانەش بەزمانێکی عەرەبیی خۆشخوان و رەوانبێژی ئاشکرایە، باشە! ئەر کەسێک عەرەبی چاک نەزانێ چۆن دەتوانێ شتی وا بەو هەموو رەوانبێژیی و بەلاغەتەوە بڵێ!.**

---

## شەرح

دوای ئەوەی نووسەر ئەو ئایەتانەی هێنا کە بەڵگەن لەسەر ئیسپاتکردنی کەلام بۆ خودا و، قورئانی پیرۆز کەلامی خودایە، دواتر ئەو ئایەتانەی هێنا کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی قورئان لەلایەن خوداوە دابەزیوە، بۆنموونە فەرمایشتی:﴿وَهَٰذَا كِتَٰبٌ﴾ئاماژەیە بۆ قورئانی پیرۆز و، لێرەدا (**اسم الإشارة**) موبتەدەئە و خەبەرەکەی(**کتاب**)ـە و﴿أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ﴾ سیفەتن بۆ (**کتاب**)، وسیفەتی(**الإنزال**)ـی پێش خست ؛ چونکە کافرەکان نکۆڵیان لێ دەکرد .

و(**المبارك**) واتە: بەرەکەتی زۆرە لەبەرئەوەی چەندان سوودی دینی ودنیایی تێدایە.

فەرمایشتی: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ﴾ئەمە هەواڵدانە لەبارەی گەورەیی قورئانەوە بۆیە جێی خۆیەتی دڵەکان بۆی داخورپێن - ئەو قورئانە گەر دابەزیایەتە سەر کێو، کە چەند بەهێز و رەقە لێی تێبگەیشتایە ئەوا ملکەچ و زەلیل دەبوو؛ لەترسی خودا و، ترسی سزاکەی، دەی چۆن دەکرێت ئێوەی مرۆڤ دڵتان نەرم نەبێت و دانەخورپێت. لەکاتێکدا زانیاریتان لەسەر خودا هەیە و لەپەیامەکەی گەیشتوون؟! .

هەروەها فەرمایشتی: ﴿ وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ ﴾ ئەمە هاتنە سەر باسی گومانە کوفریەکانی سەبارەت بەقورئانە و لەگەڵ وڵامدانەوەی . وفەرمایشتی: ﴿بَدَّلْنَآ﴾ مانای (**التبديل**): لابردنی شتێك و دانانی شتێکی تر لەجێگەکەی و، لابردنێ ئایەت: لابردنیەتی بەئایەتێکی تر، کە ئەویش نەسخکردنیەتی بەئایەتێکی تر ﴿قَالُوٓاْ﴾ ، واتە: کافرەکانی قورەیش ئەوانەی کەنەزان و جاهل بوون بەحیکمەتی نەسخ﴿ إِنَّمَآ أَنتَ ﴾ بەڕاستی تۆ ئەی موحەممەد ﴿ مُفْتَرٍۭ ﴾ ، واتە : درۆزن و درۆهەڵبەستی بەدەم خوداوە و درۆ دەکەیت بەوەی بانگەشەی ئەوە دەکەیت گوایە خودا فرمانی پێکردووی بەشتێك، دواتر بانگەشەی ئەوە دەکەیت فرمانی پێکردووی بەدژەکەی. خوای پەروەردگاریش وڵامی دانەوە و جەهل و نەزانیانی دەرخست و، فەرمووی: ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ ، واتە: بەڵکو زۆربەیان نازانن و هیچ زانستێکیان پێ نییە، یاخود حیکمەتی نەسخ نازانن، نەسخ بەرمەبنای مەسڵەحەتێکە کە خودا خۆی دەیزانێت، ڕەنگە تەشریع کردنی شتێك بۆ ماوەیەکی دیاری کراو مەسڵحەتێکی دیاری کراو بەدەست بخات، پاشان تەشریع کردنی شتێکی تر یاخود دژەکەی مەسڵەحەت بێت و گونجاو بێت . خۆ ئەگەر حیکمەتەکەی بەدەرکەوێت بۆ ئەوکافرانە ئەوا بەتەئکید دەزانن کە ئەوە هەقە و لەجێی خۆیەتی و گونجاوە .

پاشان وەڵامی ئەو قسەیەیانی دایەوە کە دەیان وت ئەو گۆڕان و لابردنی حوکمە لەلایەن خودی موحەممەدەوەیە، بەوەش درۆ بەدەم خوداوە دەکات، خوداش فەرمووی: ﴿ قُلْ نَزَّلَهُۥ ﴾واتە: بڵێ قورئانی دابەزاندووە﴿ رُوحُ ٱلْقُدُسِ ﴾ ، واتە : جبریل (علیه السلام) و(**القدس**) : پاك، واتە: جبریلی پاك دایبەزاندووە، ئەمە لەبابی ئیزافەی وەسفکراو (**الموصوف**)ـە بۆلای سیفەتەکەی ﴿مِن رَّبِّكَ﴾، واتە: سەرەتاو سەرچاوەی دابەزاندنەکەی لەلایەن خوداوەیە﴿ بِٱلْحَقِّ ﴾بەهەق، لەمەحەلی نەصبدا

دەبێتە حال ﴿لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ، واتە: بۆ ئەوەی ئەوانە جێگیر و دامەزراو کات کە ئەهلی ئیمانن و، بڵێن: هەرچی ناسیخ و مەنسوخ هەیە هەمووی لەلایەن پەروەردگارمانەوەیە، لەبەرئەوەی ئەوان دەیانزانی نەسخ چەند مەسڵەحەتی لەخۆگرتووە بۆیە جێگیر و دامەزراو بوون لەسەر ئیمان ﴿وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ﴾ ئەم دووە مەعتوفن لەسەر مەحەلی﴿لِيُثَبِّتَ﴾ واتە : بەڵکو جێگیر و دامەزراو بن و ببێتە ڕێنوێنی و موژدەیەکیش بۆیان .

پاشان خوای پەروەردگار باس لەگومانێك لەگومانەکانی تریان دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ﴾ ،واتە : بەدڵنیاییەوە ئێمە دەزانین ئەو کافرانە دەڵێن: ئێمە تەئکیدین کە ئەوەی قورئان فێری موحەممەد دەکات مرۆڤێکە لەنەوەی ئادەم و فریشتەیەک نیە لەفریشتەکان، ئەو مرۆڤەی کە فێری دەکات پێشتر تەورات و ئینجیل و کتێبی ئەعەجەمیەکانی خوێندووە ؛ لەبەرئەوەی موحەممەد کەسێکی نەخوێندەوارە بۆیە ناکرێت لەقورئاندا باس لەبەسەرهات و سەرگوزشتەی سەدەکانی پێشوو بکات.

خوای پەروەردگاریش وڵامی دانەوە و فەرمووی: ﴿لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ﴾، واتە : خۆ زمانی ئەوکەسەی ئەوان نیازیانە ئەم قورئانە بدەنە پاڵی ئەو عەجەمییەو لە عارەبیش نەزان و کوڵە ﴿وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ﴾ ، ئەم قورئانەش بەزمانێکی عەرەبیی خۆشخوان و ڕەوانبێژی ئاشکرایە، باشە! ئەگەر کەسێک عەرەبی چاک نەزانێ چۆن دەتوانێ شتی وا بەو هەموو ڕەوانبێژیی و بەلاغەتەوە بڵێ! دەی کەوایە چۆن بانگەشەی ئەوە دەکەن مرۆڤی غەیرە عەرەب پێغەمبەر ﷺ فێردەکات لەکاتێکدا ئێوە خۆتان نەتانتوانی دژایەتی بکەن بەهێنانی سورەتێك هاوشێوەی قورئان لەکاتێکدا ئێوە زمانتان عەرەبیە و کەسانی ڕەوانبێژ و زمان پاراون ؟ !

**✍ ئەو سوودانەی کەلەم ئایەتانەدایە:**

ئیسپاتکردنی ئەوەی قورئان لەلایەن خوداوە دابەزیوە، هەروەها قورئان کەلامی خودایە و کەلامی هیچ کەسێك نییە لەمرۆڤ و فریشتەکان، وولاّمدانەوەی ئەوانەی کە بانگەشەی ئەوە دەکەن ئەم قورئانە کەلامێکی مەخلوق و دروستکراوە، لەم ئایەتانەدا ئیسپاتی (عولو)ی خودای تێدایە؛ چونکە عادەتەن دابەزاندن نابێت مەگەر لەجێگایەکی بەرزەوە نەبێت . واللە أعلم .

←❦❦❦→

## [٢٣] ئیسپاتکردنی بینینی خودا لەلایەن باوەڕدارانەوە لەڕۆژی دوایی دا:

﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ ﴾ [القيامة : ٢٢، ٢٣] ، **واتە: لە رۆژی قیامەتدا دەموچاوو ڕوخسارگەلێ (واتە: ڕوومەتی باوەڕداران) گەشاوەو پاراوو پرشنگدارەو خۆشیی و شادییان لێ دەبینرێ. بۆ پەروەردگاری خۆیان دەڕوانن،** وفەرمایشتی :﴿ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ [المطففين: ٣٥] ،**واتە: لەسەر قەنەفە ڕازاوەکانەوە پاڵیان لێداوەتەوەو تەماشا دەکەن و دۆزەخییەکان بەچاوی خۆیان دەبینن** ،﴿ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ﴿٢٦﴾ ﴾ [یونس : ٢٦] ،**واتە: بۆ ئەوانەش چاکە دەکەن، پاداشی زۆرچاک و بەهەشت هەیە، وە زیاد لەوەش، واتە: دیتنی ڕووی پیرۆزی خوای میهرەبان و تەماشاکردنیی**﴿ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ ﴿٣٥﴾ ﴾ [ق: ٣٥] ،**واتە: حەزیشیان لە هەرچی بێت بۆیان هەیە داوای بکەن، وە زیادەش لەوە کە بە خەیاڵی هیچ کەسێکدا نایەت، لامان هەیە.**

**وهذا الباب في كتاب الله كثير . ومن تدبر القرآن طالباً للهدى تبين له طريق الحق. واتە: ئەم باسە لەقورئانەکەی خوادا زۆرە. وە هەرکەسێکیش لەقورئان وردبێتەوە بەنیەتی ڕێنوێنی ئەوا ڕێگای ڕاستی بۆ بەدیار دەکەوێت.**

---

### شەرح

فەرمایشتی: ﴿وُجُوهٌ﴾ ، واتە : دەم و چاوی باوەڕداران﴿يَوْمَئِذٍ﴾ ، واتە : لەڕۆژی دواییدا ﴿نَّاضِرَةٌ﴾ بە(**الضاد**) لە (**النضارة**)ـەوە هاتووە، کە بریتییە لە جوانی و درەوشاوەیی، واتە: ڕوناك و جوان و ڕەونقدار ﴿إِلَىٰ رَبِّهَا﴾ ، واتە : بەدیهێنەر و خالقی

﴿نَاظِرَةٌ﴾[١]، واتە : بەچاوەکانی دەڕوانێتە پەروەردگار، هەروەك بەموتەواتری لەچەندان فەرموودەی سەحیح دا هاتووە و، هاوەڵان و تابیعین و سەلەفی ئەم ئومەتە و پێشەوایان ئیسلام کۆدەنگن لەسەری [٢].

✍ **شایەتحاڵی لەئایەتەکە:**

ئیسپاتکردنی بینی خودا لەلایەن باوەڕدارانەوە لەڕۆژی دواییدا.

---

(١) جەماوەری زانایان- وەک لە چەندین فەرموودەی ڕەواو (**صەحیح**) وەرگیراوە- دەڵێن: مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە کە لە ڕۆژی قیامەتدا بەندە صاڵحەکان تەماشای خوای خۆیان دەکەن و، بە چاوی خۆیان دەیبینن، وەک چۆن بە ئارەزووی خۆیان تەماشای مانگە شەوی چواردە دەکەن و دەیبینن. (ئیبن کەسیر) دەڵێ: ڕای کۆی هاوەڵان و شوێنکەوتوان (**الصحابة والتابعون**)یش هەر ئەمەیە، وە هەموو پێشەوایانی ئیسلام پاش ئەوانیش یەک دەنگن تێیدا. پێغەمبەر ﷺ بۆ پشتگیری لەو مەبەستە دەفەرموێ: «**إنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كما تَرَوْنَ هذا القَمَرَ..** » واتە: بێگومان ئێوە لە ڕۆژی قیامەت خودای خۆتان دەبینن، وەک چۆن ئەو مانگە دەبینن. (صحيح البخاري، كتاب مواقيت الصلاة، باب فضل صلاة العصر، حديث: ٥٣٩، صحيح مسلم، كتاب المساجد ومواضع الصلاة، باب فضل صلاتي الصبح والعصر، حديث: ١٠٣٦).وە دەفەرموێ: «**إذا دَخَلَ أَهْلُ الجَنَّة الجَنَّةَ، قالَ: يقولُ اللهُ تَبارَكَ وتَعالَى: تُرِيدُونَ شيئًا أَزِيدُكُمْ؟ فيَقولونَ: أَلَمْ تُبَيِّضْ وُجُوهَنا؟ أَلَمْ تُدْخِلْنا الجَنَّةَ، وتُنَجِّنا مِنَ النَّارِ؟ قالَ: فَيَكْشِفُ الحِجابَ، فَما أُعْطُوا شيئًا أَحَبَّ إليهم مِنَ النَّظَرِ إلى رَبِّهِمْ عزَّوجلَّ. وفي رواية: وزادَ ثُمَّ تَلا هذه الآيَةَ: لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الحُسْنَى وزِيادَةٌ** ». واتە: کاتێ: ئەهلی بەهەشت چوونە نێو بەهەشتەوە، خودای میهرەبان دەفەرموێ: ئایا هیچی ترتان دەوێ بۆتان زیاد بکەم؟ ئەوانیش دەڵێن: ئایا ڕووت سپی نەکردوین.؟ ئایا ئێمەت نەخستۆتە نێو بەهەشتەوەو لە ئاگر ڕزگارت کردوین.؟ پاشان خودا حیجاب و بەربەست لا دەباو ڕوخساری پیرۆزی دەردەکەوێ، هیچ شتێک لەوەی پێیان بەخشراوە «بە ئەهلی بەهەشت» خۆشتر نیە لە بینین و سەیرکردنی خودا. صحيح مسلم، كتاب الإيمان، باب إثبات رؤية المؤمنين في الآخرة ربهم، حديث: ٢٩٢. یان دەفەرموێ: «..**فَيَتَجَلَّى لهَمْ يَضْحَكُ**.. ». صحيح مسلم، كتاب الإيمان، باب أدنى أهل الجنة منزلة فيها، حديث: ٣٠٤. واتە: خودا گەورەیی و شکۆی خۆی بۆیان دەردەخاو پێدەکەنێت. (**تەفسیری ڕامان**).

(٢) شرح العقيدة الطحاوية (٢١٠).

فەرمایشتی: ﴿عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ﴾ جەمعی (أريكة)یە، کە ئەویش کورسی و قەنەفەی ڕازاوەیە،﴿يَنظُرُونَ﴾ تەماشای خودا دەکەن، بەڵام کافران پێشتر و لەئایەتەکەی پێش ئەم ئایەتەدا هاتووە کە ئەوان﴿ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴾ ، واتە: ئاگاداربن! بەڕاستی ئەوانە لەو ڕۆژەدا لە دیتنی خواوەندیان بێبەش و مەحجووبن و نابینن[1].

✍ **شایەتحاڵی لەئایەتەکە:**

ئیسپاتکردنی بینی باوەڕداران بۆ پەروەردگاریان .

فەرمایشتی : ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ﴾ ،واتە: ئەوانەی چاکەیان کرد بەئەنجامدانی ئەوەی کە خودا فەرزی کردبوو لەسەریان و وازهێنان لەوەی ڕێگریان لێکرابوو لەتاوان و خراپە ﴿ٱلْحُسْنَىٰ﴾ ،واتە : پاداشتێکی چاك، ووتەیەك هەیە دەڵێت: بەهەشت.

﴿وَزِيَادَةٌ﴾،کە بریتیە لەتەماشاکردنی خوای پەروەردگارە هەروەك تەفسیرەکەی لەپێغەمبەری خواوە ﷺ لە صەحیح موسلیم و جگە لەویشدا [2]، وسەلەف و پێشەوایانی ئەم ئومەتەش هەمان تەفسیریان کردووە، کەواتە مەوزوعی شاهیدی ئەم ئایەتە پیرۆزە:

ئیسپاتکردنی بینینی پەروەردگارە لەلایەن باوەڕدارانەوە لەڕۆژی دوایی دا .

هەروەها فەرمایشتی : ﴿ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا ﴾ ، واتە : بۆ باوەڕداران هەیە لەبەهەشتدا ئەوەی کە دەروونیان حەزی پێیەتی و چاویان پێی دەگەشێتەوە و لەزەتی لێ دەبینێ لەجۆرە خۆشی و ناز و نیعمەت ﴿وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ﴾ ، واتە: لەوە زیاتریش کە بریتییە لە

---

(١) پێشەوا (**شافیعیی**) دەڵێت: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر دیتن و بینینی خوای پەروەردگار لە ڕۆژی بەرێدا، پێشەوا (**مالیک**)یش دەڵێت: کاتێک کە دیتنی زاتی خوا دوژمنانی لێ بێبەش بکرێت، ئەوا بێگومانە کە زاتی خۆی دەرئەخات بۆ دۆستەکانی، وەک دەفەرمووێ: **﴿وجوه يومئذ ناضرة، إلى ربها ناظرة﴾**.(تەفسیری ڕامان).

(٢) برقم (١٨١)، وابن ماجه (١٨٧).

تەماشاکردنی زاتی (الله)، هەرئەمەش مەوزوعی شاهیدی ئایەتەکەیە، کە ئەویش ڕوانینە بۆ ڕوخسار و دەم وچاوی زاتی خودا لەبەهەشتدا .

✍ **ئەو سوودانەی کەلەم ئایەتە هەڵدەهێنجرێت:**

ئیسپاتکردنی بینینی خودا لەلایەن باڕوادارانەوە لەڕۆژی دوایی دا، ئەوە گەورەترین نیعمەتێکە کە بەدەستی دێنن. ئەمە بۆچوونی هاوەڵان و تابیعین و پێشەوایانی ئیسلامە، بەپێچەانەی ڕافیزە و جەهمی و موعتەزیلەکانەوە ئەوانەی کە نەفی بینینی خودا دەکەن و لەو کارەشیاندا پێچەوانەی قورئان و سوننە و کۆدەنگی پێشەوایانی ئەم ئومەتەن، بەپشت بەستن بەچەند گومانێکی بێبنەما و هۆکارێکی باتڵ، لەوانە[١]:

١- دەڵێن : ئیسپاتکردنی بینینی خودا وا دەخوازێت بوترێت خودا لەجیهەت و لایەکەوە دەبینرێت ئەوەش وا دەخوازێت جسم بێت و خودای پەروەردگاریش پاك و بێگەرد و دوورە لەوە . لەوڵامی ئەم گومانەدا دەڵێین: لەفزی (جیهەت) و (لا) یاخود (ڕوو) جۆرێك لەئیجمالی وناڕونی تێدایە، بۆیە دەڵێین: ئەگەر مەبەست لەجیهەت و ڕوو ئەوەبێت کە خودا ڕۆچووبێت یاخود بەکوردیەکەی تێکەڵی شتێك لەدروستکراوەکانی بووبێت ئەوا باتڵە و بەڵگەکان ئەو مانایە ڕەتدەکەنەوە، ئەمەش مەرج نییە ڕوو بدات لەئیسپاتکردنی بینینی خودادا و، ئەگەر مەبەست لەجیهەت وڕوو ئەوەبێت خودا لەسەروی دروستکراوەکانیەوەتی ئەوا شتێکی سابتە بۆ خودا و نەفی کردنی باتڵە، ئەوەش دژی بینینی خودا نییە .

٢- ئەم فەرمایشتەی خودا کە بەموسای فەرموو دەکەنە بەڵگە: ﴿ لَن تَرَىٰنِي ﴾واتە: نامبینی، ئەوەش کاتێ بوو کەموسا داوای لەخودا جل جلاله کرد لەدونیادا ببینێت .

(١) شرح العقيدة الطحاوية (٢٣٠).

ولاَمی ئەم بیانووەش ئەوەیە: ئایەتەکە نەفی بینین دەکات لەدنیادا نەك ڕۆژی دوایی، هەروەك لەبەڵگەی تردا بینینی خودا چەسپاوە لەڕۆژی دوایی دا . وحاڵ وباری خەڵك لەڕۆژی دوایی دا تەواو جیاوازە لەگەڵ حاڵی دنیایاندا .

٣- ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە: ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ﴾ واتە: چاوەکان پەی بەخودا نابەن(١).

وەڵامی ئەم بیانووەش:

ئایەتەکە نەفی پەیپێبردن(**الإدراك**)دەکات و، هیچ ئاماژەیەکی تێدا نییە بۆ نەفی بینینی خودا و(**الإدراك**)بەمانای : دەورەدان و پەی پێ بردن (**الإحاطة**) دێت لەهەموو لایەکەوە، باوەڕداران خودا دەبینن بەڵام بەتەواوی پەی پێ نابەن، جا نەفی پەیپێبردن (**الإدراك** ) نەفی بینین نییە، وئایەتەکە باسی بینین دەکات . والله تعالى أعلم .

ووتەی نووسەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) : (وهذا الباب في كتاب الله كثير) واتە : بابەتی ئیسپاتکردنی ناو و سیفەتەکانی خودا لەقورئاندا بەڵگەیەکی زۆری لەسەرە و، نووسەر تەنها هەندێکی هێناوە، لەچەندان ئایەتدا ئیسپاتی ناو و سیفەتەکانی خودا کراوە بەو شێوەیەیی کە شایستە و گونجاوە لەگەڵی زاتی اللەدا، (ومن تدبر القرآن طالبًا) واتە : ئەوەی لەقورئان ورد بێتەوە وبیر لەو هیدایەت و ڕێنوێنیانەی بکاتەوە کەتێیدایەتی، ئەوا (تبين له طريق الحق) واتە : ڕێگای هەق و ڕاستی بۆ ڕوون دەبێتەوە، ولێ ورد بوونەوەو تێفکرین لەقورئان داواکراو و مەتڵوبە لەکاتی خوێندنەوەیدا، خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ [ص: ٢٩]، واتە: ئەمە کتێبێکە پیرۆز، دامان بەزاند بۆ تۆ ئەی موحەممەد! -ﷺ- تا ئەوانە لە ئایەتەکانی ڕا بمێنن و فامیدەو ژیرەکانیش ئامۆژگاری لـێوەرگرن. (شێخ حەسەنی بەصریی) دەڵێت: سوێندم بەخوا لەبەرکردنی

---

(١) مجموع الفتاوى (٦/ ٢٤٣)، والكواشف الجلية عن معاني الطحاوية (٥٤٠).

گشت پیتەکانی هەموو قورئان، لەگەڵ پشتگوێ خستنی مەبەستەکانی تەدەبوور و تێفکران نییە، هەندێ کەس دەڵێ: تەواوی[١] قورئانم لەبەرەو تەنها پیتێکم لێ نەپەڕاندووە، بەڵام ئەگەر ماناو داواکارییەکانی پشتگوێ خستبێ، سوێند بەخوا ئەو کەسە هەموو قورئانی پەڕاندووە و پشتگوێی خستووە!، خودا فەرموویەتی:﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴾ [محمد : ٢٤] ،واتە:ئایا ئەوانە بۆ لە ئایەتەکانی قورئان ڕانامێنن و تێنافکرێن، تا پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرن؟ بەڵکو قوفڵ لەسەر دڵیان دراوەو، هیچ خێرێکی تێناچێ، بۆیە ئاوا گومڕاو سەرگەردان بوون؟، وفەرموویەتی : ﴿ أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا۟ ٱلْقَوْلَ أَمْ جَآءَهُم مَّا لَمْ يَأْتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾ [المؤمنون : ٦٨] ، واتە: ئاخۆ ئەوان تێنەفکران لەم گوفتارە، واتە: لە قورئان، تا بەو هۆیەوە بزانن کتێبێکی موعجیزەو لەلای خواوەندیانەوەیە؟ یان ئەو بانگەوازەی پێغەمبەر کە هاتووە بۆلایان، نامۆیە بە بانگەوازەکانی پێغەمبەرانی پێشوو، کە باپیرانیان پێیان گەیشتوون؟ واتە: ئەو بانگەوازەش موحەممەد (پێغەمبەر) پێی هاتووە، هەر لە جۆرو چەشنی بانگەوازی پێغەمبەرانی پێشووە، کە بە باپیرانیان نامۆ نەبووە.

⁂

## بەشی دووەم
## بابەتێک تایبەت بەپلەو وپێگەی سوننەت
## و بەڵگەی فەرموودە لەسەر ناو و سیفاتەکانی خودا :

**ثُمَّ فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَالسُّنَّةُ تُفَسِّرُ الْقُرآنَ وتُبَيِّنُهُ، وتَدُلُّ عَلَيْهِ، وتُعَبِّرُ عَنْهُ.**
**پاشان لەسوننەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ، سوننەت تەفسیری قورئان دەکات و ڕوونی دەکاتەوە ودەلالەت دەکات لەسەری وگوزارشتی لێدەکات .**

---

**شەرح**

ووتەکەی : (ثم في سنة رسول الله) پاشان لەسوننەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ ، ئەمە عەتفە لەسەر وتەکەی پێشووی : (وقد دخل في هذه الجملة ما وصف الله به نفسه في سورة الإخلاص . .) هتد..، واتە : یەکێکی تر لەبەڵگەکان لەسەر ناو و سیفاتەکانە ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ وەسفی خودای پێکردووە ئەوەی کە لەفەرموودە صەحیحەکاندا هاتووە؛ چونکە سوننەت ئەسڵ وبنەمای دووەمە کە پێویستە بگەڕێینەوە بۆلای دوای قورئانەکەی خودا، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ ﴾ [النساء : ٥٩] ، واتە:ئینجا ئەگەر لەشتێکدا کێشەو ناکۆکیتان بوو ، بیگێڕنەوە بۆلای خواو پەیامبەر ﷺ، واتە: باتەنها قورئان و سوننەت داوەرو حەکەمتان بن، جا گەڕاندنەوە بۆلای خودا : گەڕاندنەوەیە بۆلای قورئانەکەی و گەڕاندنەوەش بۆلای پێغەمبەر ﷺ لەدوای وەفاتی : گەڕانەوەیە بۆلای سوننەکانی، و(**السنة**) : لەڕووی زمانیەوە بریتییە : ڕێگا و ڕێباز، ولەڕووی شەرعەوە : ئەوەیە کە لەپێغەمبەری خواوە ﷺ هاتووە لەقسە یاخود کردار یاخود تەقریر .

**پێگەی سوننەت:**

دەڵێت : (فالسنة تفسر القرآن) واتە : سوننەت تەفسیری مانا و مەبەستەکانی قورئان دەکات، پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بۆی دابەزیوە بۆخەڵکی ڕوون دەکاتەوە، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾ [النحل : ٤٤] ،واتە: وا بۆ تۆش ئەم قورئانەمان دابەزاندە خوارێ [ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ ] بۆ ئەوەی بۆ ئەو خەڵکە ڕوون بکەیتەوە ئەوەی بۆیان دابەزێنراوە لە یەکخواپەرستی و شەرع و حەڵاڵ و حەرام..هتد.

هەروەها سوننەت (تُبين القرآن) واتە: ئەوەی بەکورتی هاتووە ڕوونی دەکاتەوە ؛ وەك نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکات وزۆرەبەی ئەحکامەکان کە لەقورئاندا بەکورتی هاتوون و سوننەت ڕوونیان دەکاتەوە و وردەکاریەکەیان بەیان دەکات و دەیخاتە ڕوو.

هەروەها سوننەت (تدل علی القرآن وتعبر عنە) واتە : دەلالەت دەکات لەسەر ئەوەی قورئان دەلالەتی کردووە لەسەری و گوزارشت دەکات لەوەی کە قورئانی گوزارشتی لێ کردووە، وموافقی قورئان دەبێت، دواتر لەئەنجامدا حوکمەکە لەوانە دەبێت کە قورئان و سوننەت دەلالەتیان کردووە لەسەری، وەك ناو و سیفاتەکانی خودا .



**وَمَا وَصَفَ الرَّسُولُ بِهِ رَبَّهُ ـ عَزَّ وَجَلَّ ـ مِنَ الأَحَادِيثِ الصِّحَاحِ الَّتِي تَلَقَّاهَا أَهْلُ الْمَعْرِفَةِ بِالْقَبُولِ؛ وَجَبَ الإِيمَانُ بِهَا كَذَلِك .**

**وئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ وەسفی پەروەردگاری پێ کردووە لەفەرموودە سەحیحەکاندا ئەوانەی کە زانایانی فەرموودەناس بەسەحیحیان داناوەو قەبوڵیان کردووە؛ پێویستە بەهەمان شێوە ئیمانی پێ بهێندرێت.**

---

## شەرح

ووتەکەی : (وما وصف . . .) هتد.. موبتەدەئە و خەبەرەکەی ئەم برگەی ترە لەقسەکەی : (وجب الإيمان بها كذلك) واتە : واجبە ئیمان بهێندرێت بەوەی لەسوننەتدا هاتووە هەروەك چۆن واجبە ئیمان بهێندرێت بەوەی خودا وەسفی خۆی پێ کردووە لەقورئاندا؛ چونکە پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیە کە پەروەردگاری وەسفی کردووە و فەرموویەتی: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴾ [النجم: ٣، ٤] ،واتە: وە قسەو گوفتاری پێغەمبەر ﷺ لە ڕووی هەواو هەوەسەوە نیە، جا کەسێ ئاوابێ چۆن ڕێگە ون دەکات؟!

ئەو قورئانەی کە ئەو دەیڵێت، جگە لەوە کە بە وەحیی بۆی دەنێرێ، هیچی تر نیە، واتە: ئەم قورئانە هەر لەلایەن خوداوەیە.

جا ئەو سوننەتەی کە پێغەمبەر ﷺ دەری بڕیوە بەشێکە لەوەحی و لەلایەن خوداوەیە، هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾ [النساء : ١١٣] ، واتە: لەگەڵ ئەوەیشدا خوا قورئان و ودانایی و حیکمەتی بۆناردیت و، واتە: ئەوانە چۆن ئەتوانن سەر لەتۆ تێک بدەن.

و(**الكتاب**) : بریتیە لەقورئان، و(**الحكمة**): بریتیە لەسوننەت. بۆیە واجبە ئیمان بهێندرێت بەوەی لەسوننەتدا هاتووە، بەتایبەت لەبابەتی عەقیدەدا، خوای پەروەردگار

فەرموویەتی : ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟﴾ [الحشر : ٧] ، واتە: وە هەرچی پەیامبەر ﷺ پێیدان وەربگرن، واتە: بەچی فەرمانی پێکردن بیکەن چ لەم دەستکەوتەداو، چ لەهەر شتێکی تردا جێبەجێی بکەن، وە رێیشی لە هەر شتێ لێگرتن، ئێوەش دەستی لێهەڵگرن .

بەڵام بۆ قەبوڵ کردنی فەرموودە و ئیمان بوون پێی پێویستە پێش ئەوەی بزانرێت تا چەند سەحیحە و لەپێغەمبەرەوە ﷺ هاوتووە، هەربۆیە شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) گوتی : (من الأحاديث الصحاح) لەفەرموودە سەحیح وڕاستەکان و(**الصحاح**) : جەمعی (**صحيح**)ـە، و فەرموودەی سەحیح (**الحديث الصحيح**) [١] : ئەوەیە کە کەسێکی دادگەر و بەئاگا ئەوەی لەبەر کردنی باشە گێڕابێتیەوە لەکەسێکی هاوشێوەی خۆیەوە و لەگەڵ ئەوەشدا فەرموودەکە شاز نەبێت و عیللەتی تێدا نەبێت، ئەوەش ئەوەیە کە پێنج مەرجی تێدا کۆ بووەتەوە :

١- (**عدالة الرواة**) واتە: ڕاوییەکان ـ ئەوانەی فەرموودەکەیان گێڕاوەتەوە ـ عادل بن ،واتە: کەسانێکی ڕاستگۆ بن و خاوەن کەسایەتی بن و دوور بن لەکاری هەرزە و منداڵانە.

٢- (**ضبطهم**) واتە: لەبەرکردنیان باش بێت و شت زوو لەبیر نەکەن.

٣- (**اتصال السند**) واتە: سەنەدەکەیان ـ ئەوانەی کە فەرموودەکەیان گێڕاوەتەوە ـ دەستا و دەست گێڕابێتیانەوە، و هیچ کەسێك لەو نێوەندەدا تەرك نەکرابێت.

٤- (**سلامته من العلة**) واتە: دوور بێت لەعیللەت، واتە: لەو هۆکارە نادیارانەی کە سەحیحی فەرموودە لەکەدار دەکەن.

(١) تدريب الراوي (٦١) ، والباعث الحثيث (١٩).

٥- **(سلامته من الشذوذ)** واتە: پارێزراو بێت لەوەی شاز بێت،واتە: فەرموودەکە لەو فەرموودانە نەبێت کە کەسێکی متمانەپێکراو(سیقه) گێڕابێتیەوە و پێچەوانەی کەسانی متمانەپێکراو(سیقه)ی هاوشێوەی خۆی کردبێت.

ووتەکەی : (تلقاها أهل المعرفة) واته : زانایانی فەرموودەناس وەریان گرتبێت و بەسەحیحیان دانابێت، بەڵام هیچ حیسابێك بۆ کەسانی نەشارەزا بەو زانستە ناکرێت[1] .

**پاشان شێخ چەند نموونەیەکی هێناوەتەوە ئەوەی کەلەسوننەتدا هاتووە لەسیفاتی خودا و دەڵێت:**



---

(١) واتە: ئەگەر فەرموودەیەك زانایانی فەرموودەناس وەریان گرتبێت ئەوا حیساب بۆ قسەی کەسانی نەزان بەو زانستە ناکرێت لەحاڵەتێکدا گەر قسەیان لەبارەی ئەو فەرموودەیەوە کردبێت.

## [١] سابت بوونی دابەزینی خودا بۆ ئاسمانی دونیا بەو شێوەیەیی کە شایستە و گونجاوە لەگەڵ زاتی خودادا:

فَمنْ ذَلكَ: مثْلُ قَوْله ﷺ : «يَنْزِلُ رَبُّنَا إلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا كُلَّ لَيْلَة حينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرِ، فَيَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ، مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ، مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ». مُتَّفَقٌ عَلَيْه.[١] .

لەوانە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ: «خوای پەروەردگارمان هەموو شەوێك دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا ئەو کاتەی کە سێیەکی شەو دەمێنێت و دەفەرموێت: کێ بانگم لێ دەکات، تا وەڵامی بدەمەوە، کێ داوام لێ دەکات، تا پێی ببەخشم، کێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکات، تا لێی خۆش بم».

---

شەرح

ووتەکەی : «ينزل ربنا» واتە : دابەزینێك کە شایستەی بێت و لەگەڵ گەورەیی خودادا بگونجێ باوەڕمان پێیەتی و نایشوبهێنین بەدابەزینی دروستکراوەکان؛ چونکە خودا﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾ هیچ شتێك هاوشێوەی نییە، «إلى سماء الدنيا» واتە : بۆ ئاسمانی دونیا ئەمە لەبابی ئیزافەی مەوسوفە بۆلای سیفەتەکەی «حين يبقى ثلث الليل الآخر» بەڕفعی وشەی (الآخر) لەبەر ئەوەی سیفەتە(ثلث)، ئەمە دیاریکردنی کاتی دابەزینی خودایە. وتەکەی : «فأستجيب له» بەنەصب لەبەر ئەوەی وەڵامی پرسیار(الاستفهام)ـە، وبەهەمان شێوە : «فأعطيه» و «أغفر له» ، ووتەکەی: «فأستجيب له» واتە: وەڵامی بانگەوازەکەی بدەمەوە .

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (١١٤٥)، ومسلم (٧٥٨).

✍ **شایەتحاڵی فەرموودەکە:**

تێیدا دابەزینی خودا سابت بووە و، دابەزین یەکێکە لەسیفەتە فیعلیەکان و، لەفەرموودەکەدا ئیسپاتی عولو و بەرز وبڵندی خودا کراوە، چونکە دابەزین لەجێگای بەرزەوەیە.

جا ئەم فەرموودەیە وەڵامە بۆ ئەوانەی کە فەرموودەکە تەئویل دەکەن بەوەی گوایە ماناکەی: دابەزینی ڕەحمەت یاخود فرمانی خودایە ؛ چونکە ئەسڵ (هەقیقەت و حەزف نەکردنە)، واتە:(نەك مەجاز و حەزف کردن) )، هەروەها لەبەر ئەوەی دەفەرموێت : «من يدعوني فأستجيب له» کێ داوام لێ دەکات وڵامی دەمەوە. جا ئایە بەئەقڵی هیچ کەسێکدا دێت بڵێت ڕەحمەت یاخود فرمانەکەی ئەم قسەیەیی کردووە ؟![1] .

لەفەرموودەکەدا ئیسپاتی کەلام کراوە بۆ خودا هەروەك تێیدا هاتوو : «فيقول . . .» هتد، هەروەها تێیدا ئیسپاتی بەخشین و وەڵامدانەوە و لێخۆش بوون کراوە بۆ خودا و، ئەمانەش سیفەتی فیعلین.

ووتەکەی : (متفق عليه) واتە : لەصەحیحی بوخاری و موسلیم دا هاتووە .

---

(١) مختصر صواعق المرسلة (٤٢٠).

## [٢] ئیسپاتکردنی دڵخۆش بوون و پێکەنین بۆ خودا :

وَقَوْلُهُ: ﷺ : «لَلَّهُ أَشَدُّ فَرَحًا بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ الْمُؤْمِنِ التَّائِبِ مِنْ أَحَدِكُمْ بِرَاحِلَتِهِ»الحديث. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ[1] . وفەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ :«خودا دڵخۆشترە بە تۆبەی بەندەکەی لەوەی کاتێ وڵاخ و بارەکەی ...»تەماشای تەواوی فەرموودەکە بکە.

وَقَوْلُهُ: ﷺ : «يَضْحَكُ اللهُ إِلَى رَجُلَيْنِ يَقْتُلُ أَحَدُهُمَا الآخَرَ؛ كِلاهُمَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ». مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ[2] . وفەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ :«خودا پێکەنین دەیگرێت بەدوو پیاو دانەیەکیان ئەوی تریانی کوشتووە؛ کەچی هەردووکیان دەچنە بەهەشتەوە!».

---


شەرح

(لله) لامەکە لامی دەسپێکە(**الابتداء**) و«أشد فرحاً» مەنصوبە لەبەر ئەوەی تەمیزە، و(**الفرح**) لەڕووی زمانەوانیەوە : دڵخۆشی و ئاسودەیی دڵە «بتوبة عبده» جا(**التوبة**) : بریتیە لەبەتەواوی وازهێنان لەتاوان و گەڕانەوە بۆ تاعەت و عیبادەت «براحلته» و(**الراحلة**) : ئەو وشترەیە کە دەگونجێ بڕوات و(**الحديث**) مەنصوبە بە(**فعل**)ێکی نادیار(موقەدەر)، وتەقدیرەکەی: (**أكمل الحديث**)واتە: فەرموودەکە تەواو بکە؛ چونکە نووسەر تەنها مەوزوعی شاهیدەکەی هێناوە، کە ئەویش دڵخۆشی (**الفرح**)ـە بۆ خودا بەو شێوەیەی شایستەی زاتی (الله)یە، ئەوەش سیفەتی کەمالە و دڵخۆشی و

---

(١) متفق عليه : أخرجه البخاري (٦٣٠٨) ، ومسلم (٢٧٤٤) .
(٢) متفق عليه : أخرجه البخاري (٢٨٢٦) ، ومسلم (١٨٩٠) .

فەرەحی هیچ کەسێك لەبەدیهێنراوەکانی ناشوبهێت پێی، بەڵکو وەکو گشت سیفەتەکانی تری وایە، جا ئەو فەرەح و دڵخۆشیە وەك چاکە و بەخششێك وایە نەك مەبەست لێی ئەوەبێت خودا پێویستی بەتەوبەی بەندەکەی بێت و سوودی لێ ببینێت، لەبەرئەوەی خودا تاعەت و عیبادەتی هیچ کەسێك سوودی پێ ناگەیەنێت، هەروەها سەرپێچی هیچ سەرپێچی کارێکیش زیانی لێ نادات .

ووتەکەی : «یضحك الله إلی رجلین . . .خودا بۆ حاڵی دوو کەس دێتە پێکەنین» هتد، پێغەمبەر ﷺ لەکۆتایی فەرموودەکە هۆکارەکەی ڕوونکردووەتەوە و فەرموویەتی: «**یقاتل هذا في سبیل الله عز وجل فیستشهد ثم یتوب الله علی القاتل فیسلم فیقاتل في سبیل الله عز وجل فیستشهد**» ،واتە: ئەوەیان لەپێناوی خوادا دەجەنگێت و شەهید دەبێت پاشان بکوژی ئەمە تۆبە دەکات و خوداش تۆبەکەی قەبوڵ دەکات و دواتر ئەمیش لەپێناوی خودادا دەجەنگێت و شەهید دەبێت.

بێگومان ئەمەش دەرخەری تەواوی و بەرفراوانی ئیحسان و چاکەی خودا و بەرفراوانی ڕەحمەتەکەیەتی، موسوڵمانەکە لەپێناوی خودادا دەجەنگێت و بێباوەڕەکە دەیکوژێت، خودا ڕێز لەموسوڵمانەکە دەنێت و پلەی شەهیدی پێدەبەخشێت پاشان خودا بەڕەحم و کەرەمی خۆی هیدایەتی کافرە بکوژەکە دەدات بۆ ئیسلام و هەردوکیان دەچنە بەهەشتەوە ، بێگومان ئەمەش شتێکی عەجیب و سەرسوڕهێنەرە و پێکەنینیش(**الضحك**) عادەتەن بەشتی سەرسوڕهێنەر دێت ئەوەی کە جیاوازە لەهاوشێوەکانی و حاڵەتێکی ناوازە و دەگمەنە .

**✍ ئەوەی تێبینی دەکرێت لە فەرموودەکەدا:**

ئیسپاتکردنی پێکەنینە (**الضحك**) بۆ خودا، ئەمەش یەکێکە لەسیفەتە فیعلیەکان کە ئیسپاتی دەکەین بۆ خودا بەو شێوەیەی کەلەگەڵ گەورەیی و عەزەمەتی خودادا گونجاوە و، پێکەنین خودا هەرگیز هاوشێوەی پێکەنینی دروستکراو وبەدیهێنراوەکان نییە .

## [٣] ئیسپاتکردنی سەرسوڕمان و پێکەنین بۆ خودا:

وَقَوْلُهُ ﷺ: «عَجِبَ رَبُّنَا مِنْ قُنُوطِ عِبَادِهِ وَقُرْبِ غِيَرِهِ، يَنْظُرُ إِلَيْكُمْ أَزِلِينَ قَنِطِينَ، فَيَظَلُّ يَضْحَكُ يَعْلَمُ أَنَّ فَرَجَكُمْ قَرِيبٌ». حَدِيثٌ حَسَنٌ[١].

**وفەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ : «خوای پەروەردگارمان پێی سەیرە کە بەندەکانی لە کاتی نەبارینی باراندا بێئومێد دەبن لە ڕەحمەتی خوا ونزیکی گۆڕینی حاڵ لەتەنگانە و ناخۆشیەوە بۆ فەراحی و خۆشی، تەماشاتان دەکات لەکاتێکدا لەتەنگ وچەڵەمەدان، بەردەوام پێدەکەنێ ئەودەزانێت ڕزگاربوونتان لەو ناخۆشی و ناڕەحەتیە نزیکە لە دەمێکدا وادەی کرانەوەی دەرگای خۆشی بۆ بەندەکانی نزیک بووەتەوە».**

---

شەرح

«عجب ربنا» لە(**المصباح**)دا دەڵێت : سەرسوڕمان (**التعجب**) بەدوو شێوە بەکار دێت: دانەیەکیان: کەسەکە لێی ڕازیە و پێی خۆشە، واتە: پێی باشە و هەواڵی ڕازی بوونی دەدات لەبارەیەوە. **دووەم:** ئەوەیە کە پێی ناخۆشە، واتە: نکۆڵی لێ دەکات وبەخراپە باسی دەکات .

«من قنوط عباده» و(**القنوط**) واتە : بێهیواییەکی لەڕادەبەدەر، مەبەست لێی لێرەدا: بێ هیوا بوونە لەدابارین باران و نەمانی وشکەساڵی «وقرب غِيَرَه» وشەی (**غِيره**) بەکەسری پیتی (غ) و فەتحی پیتی (يـ)واتە: گۆڕانی حاڵ لەناڕەحەتیەوە بۆ خۆشی و فەراحی «ينظر إليكم أزلين» و(**الأزل**) بەسکونی پیتی(زْ) واتە : تەنگانە، دەوترێت:

---

(١) أخرجه أحمد (١٦٣٠٢) ، وابن ماجه (١٨١) وغيرهما .

(**وقد أزل الرجل يأزل أزلاً**) واتە: کاتێ کەتوشی تەنگانە و بێبارانی و وشکە ساڵی دەبێت) [1] .

«فيظل يضحك»واتە: پێدەکەنین دەیگرێت، ئەمە یەکێکە لەسیفەتە فیعلیەکان ئەوەی کەناشوبهێ بەهیچ سیفەتێك لەسیفاتی دروستکراوەکانی، لەفەرموودەکەدا ئیسپاتی دوو سیفەتی فیعلی کراوە بۆ خوای پەروەردگار کە ئەوانیش سەرسوڕمان و پێکەنینە و، ئەمە دوو سیفەتن بەو شێوەیەن کە شایستەی پەروەردگارە و هاوشێوەی سەرسوڕمانی دروستکراو(مەخلوق) و پێکەنینی دروستکراو(مەخلوق) نین، هەروەها لەفەرموودەکەدا ئیسپاتی تەماشاکردن و ڕوانین کراوە بۆ خودا، ئەوەش بەهەمان شێوە یەکێکە لەسیفەتە فیعلیەکان، خوای پەروەردگار تەماشای بەندەکانی دەکات، هیچ شتێك لەئاسمان و زەویدا شاراوە و نادیار نییە بەلای خوداوە .



---

(١) «المعجم الوسيط» (١٦/١) .

## [٤] ئیسپاتکردنی قاچ(الرجل)، و پێ(القدم) بۆ خودا (جل جلاله) :

وَقَوْلُهُ ﷺ : «لا تَزَالُ جَهَنَّمُ يُلْقَى فِيهَا وَهِيَ تَقُولُ: هَلْ مِنْ مَزِيدٍ حَتَّى يَضَعَ رَبُّ الْعِزَّةِ فِيهَا رِجْلَهُ» وَفِي رِوَايَةٍ: «عَلَيْهَا قَدَمَهُ فَيَنْزَوِي بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ، فَتَقُولُ: قَط قَط». مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ(١) .

**وە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ: «بەردەوام دۆزەخ خەڵکی تێدەکرێت ئەویش هەر دەڵێت: بابێت ئایا زیاتر هەیە بیهێنن؟ تاوەکو خوای پەروەردگار قاچی دەخاتە نێوی. ولەگێڕانەوەیەکی تردا: پێی لەسەر دادەنێت ئەملا و ئەولاکەی دێتە یەک و، دەڵێت: بەسە بەسە».**

---

### شەرح

فەرمایشتی : «لا تزال جهنم» وشەی(جهنم) ناوێکە لەناوەکانی ئاگری دۆزەخ، وتراوە: بۆیە ئەوناوەی لێنراوە ؛ لەبەر ئەوەی زۆر قوڵە، ووتراوە: لەبەر تاریکیەکەی ئەو ناوەی لێنراوە و لە(**الجهومة**)ـەوە وەرگیراوە کەبریتیە لەتاریکی «يلقى فيها» واتە: دۆزەخیەکانی تێدەکرێت ئەویش هەر دەڵێت: «هل من مزيد» واتە : داوای زیاتر دەکات لەبەر فراوانیەکەی، خوای پەروەردگاریش پەیمانی داوە پڕی بکات «حتى يضع رب العزة فيها رجل»کاتێ کە ئاگری دۆزەخ لەوپەڕی گەورەیی و فراوانیدایە و، خوداش بەڵێنی داوە پڕی بکات و، ڕەحمەت و دادگەری خوداش وا دەخوازێت هیچ کەسێك بەبێ تاوان سزا نەدات بۆیە پەیمانەکەی دێنێتە دی و پێی دەخاتە سەری دۆزەخ «فينزوي بعضها إلى بعض» واتە : دۆزەخ دێتە یەک و ئەملاو ئەولاکەی

---

(١) متفق عليه : أخرجه البخاري (٦٦٦١) ، ومسلم (٢٨٤٨) .

بەرتەسك دەبێتەوە و جێگای هیچ کەسێکی تری تێدا نامێنێت و دەڵێت: «قط قط» واتە : تەواو بەسمە .

**✍ ئەوەی تێبینی دەکرێت لە فەرموودەکەدا:**

لەفەرموودەکەدا ئیسپاتی قاچ و پێ کراوە بۆ خودا بەو شێوەیەیی کە شایستە و گونجاوە لەگەڵ زاتی خودادا، ئەمەش یەکێکە لەسیفەتە زاتیەکان هاوشێوەی دەم و چاو دەست. والله تعالی أعلم .

بەڵام موعەتیلەکان بەهەڵەدا چوون لەتەفسیر کردنی ئەم فەرموودەیەدا کاتێ دەڵێن: «قدمە» پێی جۆرێکە لەدروستکراوەکان، ودەڵێن : «رجلە» کۆمەڵە خەڵکێکە، ووەڵامی ئەمەش: ئەوەیە بوترێت: پێغەمبەری خوادا ﷺ فەرمووی: (**حتی «یضع**»تاوەکو دایدەنێت) ونەیفەرموو: (**حتی یلقي**)تاوەکو فڕێی دەدات، هەروەك لەسەرەتای فەرموودەکەدا هاتووە : («**یلقی فیها**»فڕێ دەدرێتە ناوی)، هەروەها بەهیچ شێوەیەک گونجاو نییە تەفسیری پێ بکرێت بەخەڵك؛ چونکە نەمانای هەقیقی ئەوە هەڵدەگرێت ونەمانای مەجازی.



## [٥] ئیسپاتکردنی بانگکردن و دەنگ و کەلام بۆ خودا (جل جلاله):

وَقَوْلُهُ: «يَقُولُ تَعَالَى: يَا آدَمُ فَيَقُولُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ. فَيُنَادِي بِصَوتٍ: إِنَّ اللهَ يَأْمُرُكَ أَنْ تُخْرِجَ مِن ذُرِّيَّتِكَ بَعْثًا إِلَى النَّارِ». مُتَّفقٌ عَلَيْهِ(١) .

وفەرمایشتەکەی ﷺ: «خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ئەی ئادەم ئەویش دەڵێت: بەڵێ من لەخزمەتتدام و گوێڕایەڵم بۆت، بانگ دەکات بەدەنگ: خودا فرمانت پێ دەکات ئەو کەسانە لەنەوەکەت دەربکەیت لەئاگر کە فرمان کراوە بەدەرهێنانیان» .

وَقَوْلُهُ ﷺ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إلاَّ سَيُكَلِّمُهُ رَبُّهُ وَلَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ تَرْجُمَانٌ»(٢) .

وفەرمایشتەکەی ﷺ: «هیچ یەکێك لەئێوە نیە ئیللا خودا ڕاستەوخۆ گفتوگۆی لەگەڵ دەکات و هیچ وەرگێڕێك لەنێوانیاندا نییە».

---

شەرح

فەرمایشتی : «لبيك وسعديك» وشەی(لبيك) ، واتە: من بەردەوامم لەگوێڕایەڵی کردنتدا، «وسعديك» لە(**مساعدة**)ـەوە هاتووە: کەبریتییە لەبەگوێ کردن، واتە: هاریکار و گوێڕایەڵم لەتاعەت و فەرمان بەرداری تۆدا.

فەرمایشتی: «فينادي» بەکەسری دالەکە واتە: بانگ دەکات، و بانگکەر (**المنادي**) بریتیە لەخودا «بصوت» واتە: بەدەنگ و، ئەمە جەخت کردنە لەوتەکەی کە دەڵێت: «ينادي»بانگدەکات؛ چونکە بانگ کردن نابێت تەنها بەدەنگ نەبێت، ئەمەش هاوشێوەی ئەم فەرمایشتەی خودایە : ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمًا﴾واتە: بەدڵنیاییەوە خودا گفتوگۆی لەگەڵ موسا کرد.

---

(١) متفق عليه : أخرجه البخاري (٦٥٣٠) ، ومسلم (٢٢٢).
(٢) متفق عليه : أخرجه البخاري (٧٤٤٣) ، ومسلم (١٠١٦) .

وە فەرمایشتی : «بعثاً إلى النار» وشەی (**البعث**) لێرەدا واتە: نێردراو و ئارستە کراو، وە مانا و مەبەستەکەشی ئەوەیە: ئەهلی دۆزەخ لەکەسانی تر جودا بکەرەوە .

✍ **شایەتحاڵی فەرموودەکە:**

ئیسپاتی قسە و بانگکردنی بەدەنگێکی بیستراو تێدایە بۆ خودا، جا ئەوە لەڕۆژی دواییدا ڕوو دەدات، ئەم فەرموودەیە ئەوەی لێ ئیستیفادە دەکرێت خودا قسە دەکات و بانگ دەکات هەرکات بیەوێ و هەرچۆنێك کە بیەوێ . وفەرمایشتی : «ما منکم من أحد»واتە: هیچ یەکێک لەئێوە نییە، جا ئەم قسەیە ڕووی لەهاوەڵان بوو، بەڵام ئەمە عام و گشتگیرە و هەموو باوەڕداران دەگرێتەوە و هیچ کەسێك نییە «إلا سیکلمە ربە» واتە: ئیللا خودا بەبێ هیچ واستە و نێوەندگیرێك یەك قسەی لەگەڵ دەکات و لەنێوانیاندا «ترجمان» و (**الترجمان**): ئەو کەسەیە کە قسەی زمانێك وەردەگێڕێت بۆ زمانێکی تر .

✍ **هەروەها شایەتحاڵێکی تری فەرموودەکە:**

ئیسپاتکردنی گفتوگۆی خودای تێدایە لەگەڵ بەندەکانی و، خودا قسە دەکات کاتێ کە ویستی لەسەر بێت و، قسەکردنی خودا یەکێکە لەسیفەتە فیعلیەکانی و، خودا لەڕۆژی دوایی دا قسە لەگەڵ هەموو باوەڕدارێکدا دەکات .



## [٦] ئیسپاتکردنی عولو و بەرز و بڵندی خودا و، بەرز بوونەوەی بەسەر عەرشدا:

وَقَوْلُهُ ﷺ فِي رُقْيَةِ الْمَرِيضِ: «(رَبَّنَا اللهَ الَّذِي فِي السَّمَاءِ، تَقَدَّسَ اسْمُكَ، أَمْرُكَ فِي السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، كَمَا رَحْمَتُكَ فِي السَّمَاءِ اجْعَلْ رَحْمَتَكَ فِي الأَرْضِ، اغْفِرْ لَنَا حُوبَنَا وَخَطَايَانَا، أَنْتَ رَبُّ الطَّيِّبِينَ، أَنْزِلْ رَحْمَةً مِنْ رَحْمَتِكَ، وَشِفَاءً مِنْ شِفَائِكَ عَلَى هَذَا الْوَجِعِ؛ فَيَبْرَأَ». حَدِيثٌ حَسَنٌ، رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَغَيْرُهُ[١].

وفەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ: لەباری ڕوقیە کردن بۆ نەخۆش: «پەروەردگارمان ئەوەی کە لەسەرووی ئاسمانە، ناوت بەرز وپیرۆز بێت، فرمانت لەزەوی و ئاسماندا جێ بەجێیە، هەروەك ڕەحم وبەزەیت لەئاسمانە، ڕەحمەتی خۆت دابەزێنە سەر زەوی، لەتاوان و سەرپێچیەکانمان خۆشبە، تۆ پەروەردگاری پێغەمبەران و شوێنەکەوتوانیانی، ڕەحمەت و بەزەییەکت دابەزێنە، وشیفاو چارەسەرێك لەشیفاکانت بۆ ئەم نەخۆشیە بەڵکو چاك بێتەوە».

وَقَوْلُهُ ﷺ:«أَلاَ تَأْمَنُونِي وَأَنَا أَمِينُ مَنْ فِي السَّمَاءِ»حديث صحيح[٢] .

وفەرمایشتەکەی تری ﷺ: «ئایا ئەوە ئێوە بەدەسپاکم نازانن لەکاتێکدا من ئەمنیم ودەسپاکم لای ئەوانەی لەئاسمانن؟!».

وَقَوْلُهُ ﷺ: «وَالْعَرْشُ فَوْقَ الْمَاءِ، وَاللهُ فَوْقَ الْعَرْشِ، وَهُوَ يَعْلَمُ مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ». حَدِيثٌ حَسَنٌ، رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَغَيْرُهُ[٣] . وفەرمایشتەکەی تری ﷺ: «وعەرش

---

(١) أخرجه أبو داود (٣٨٩٢)، وأحمد (٢٤٤٥٧).

(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (٤٣٥١)، ومسلم (١٠٦٤).

(٣) أخرجه أبو داود (٤٧٢٦)، وصح موقوفًا عن ابن مسعود، أنظر (الأسماء والصفات للبيهقي (٢/ ١٤٥).

**لەسەرووی ئاوەوەیە و خودا لەسەرەوەی عەرشە و ئەو دەزانێت ئەو حاڵ و بارەی ئێوەی لەسەرە» .**

**وَقَوْلُهُ ﷺ لِلْجَارِيَةِ: «أَيْنَ اللهُ؟». قَالَتْ: فِي السَّمَاءِ. قَالَ: «مَنْ أَنَا؟». قَالَتْ: أَنْتَ رَسُولُ اللهِ. قَالَ: «أَعْتِقْهَا فَإِنَّهَا مُؤْمِنَةٌ». رَوَاهُ مُسْلِمٌ(١) .**

**وفەرمایشتەکەی تری ﷺ بەجاریەکە: «خودا لەکوێیە؟» گوتی: لەئاسمانە. فەرمووی: «ئەی من کێم؟»گوتی: پێغەمبەری خودا. فەرمووی: «ڕزگاری بکە ئەمە باوەڕدارە».**

## شەرح

«في رقية المريض» واتە : خوێندن بەسەر نەخۆشدا بەئومێدی چاک بوونەوە، ئەمەش درووستە گەر بەقورئان و ئەو دوعا و پاڕانەوە بێت کە ڕێی پێدراوە، بەڵام ئەگەر بە وشەی شیرکی یاخود کرداری شیریکی بێت ئەوا درووست نییە، «ربنا الله الذي في السماء» واتە : لەسەر ئاسمان ، لێرەدا پیتی«في» بەمانای : (**على**) دێت، هاوشێوەی ئەم ئایەتە : ﴿فَسِيحُواْ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ [التوبة: ٢] واتە: (**على الأرض**) واتە: بەسەر ئەرزدا بڵاوە بکەن و بگەڕێن، ودرووستیشە (في) بە مانا ئەسڵیەکەی خۆی کە (**الظرفية**) بێت، ئەوکات مەبەست لە وشەی(**السماء**) : **مطلق العلو**، واتە: مەبەست لێی بەرزی و بڵندی ڕەها بێت.

«تقدس اسمك» واتە : ناوت پاک و بێگەردە، دوورە لەهەموو عەیب و ناتەواویەك، ئەو ناوە تاکە و ئیزافە کراوە، بۆیە هەموو ناوەکانی خودا دەگرێتەوە . «أمرك في السماء والأرض» واتە : فرمانە کەونی و قەدەرییەکان، ئەوانەی هەموو

(١) برقم (٥٣٧).

دروستکراوەکان و ڕووداوەکان لێوەی سەرچاوە دەگرن، خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾ [یس: ٨٢] ،واتە: بەراستیی هەر کاتێ ویستی شتێ بەدی بهێنێ هەر ئەوەیە کە پێی بفەرمووێ ببە!، ئەویش دەستبەجێ دەبێت. وە فرمانە شەرعییەکان ئەوانەی کە ئەو شەریعەتەیان لەخۆ گرتووە کە خودا تەشریعی کردووە بۆ بەندەکانی .

«کما رحمتك في السماء اجعل رحمتك في الأرض» هاوشێوەی ڕەحمەتەکەت لەئاسمان ڕەحمەتیش دابارێنە سەر زەوی، ئەمەش تەوەسول کردن و پاڕانەوەیە بەڕەحمەت و بەزەیی خودا ئەوەی کە هەموو ئەهلی ئاسمانی گردۆتەوە بەوەی هەندێکی دابەزێنێتە سەر زەوی «اغفر لنا حوبنا وخطايانا» ئەمە داوای لێخۆش بوون کردنە بەوەی خودا تاوانەکانی داپۆشێت و بیپارێزێت لەتاوان، جا (**المغفرة**) لە (**المغفر**)ـەوە هاتووە ئەوەی دەپێچرێت لەسەر و لە لێدان و بەرکەوتن دەیپارێزێت، و(**الحوب**) : گوناهە، و(**الخطايا**): تاوانە .

«أنت رب الطيبين» تۆ پەروەردگاری پاکژەکانی، ئەمەش تەوەسول پاڕانەوەیەکی ترە، و(الطيبين) : جەمعی(طيب)، کە ئەوانیش پێغەمبەران و شوێنکەوتوانیانە، وئیزافەی پەروەردگار (**رب**) بۆلای ئەوانە وەك ڕێز و شکۆیەکە بۆیان، گەرنا خودا پەروەردگار و خاوەنی هەموو شتێکە «أنزل رحمة من رحمتك» واتە : ئەو ڕەحمەتەی کە دروستکرا(مەخلوقە)؛ چونکە ڕەحمەت دوو جۆرە[1]:

**جۆری یەکەم:** ڕەحمەتێک کە سیفەتێکە لەسیفەتەکانی خودا، هەروەك لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿ وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖ ﴾ [الأعراف : ١٥٦] ، واتە: ڕەحمەت وبەزەییەکەی من کە هەموو شتێکی گردووەتەوە.

---

(١) بڕوانە : فتح الباري (١٠/ ٥٣٢).

**جۆری دووەم:** ڕەحمەتێك کە ئیزافە دەکرێت و دەدرێتە پاڵ خودا، ئەمەیان لەبابی ئیزافەی دروستکراو(مەخلوقە) بۆلای دروستکار(خالیقەکەی) وەك ئەوەی کەلەم فەرموودەیەدا هاتووە، هەروەها وەک ئەوەی لەو فەرموودەیەیی تردا هاتووە: «**خلق الله مائة رحمة**» الحديث [1]،واتە: خودا سەد ڕەحمەتی خەلق کردووە، جا پێغەمبەرﷺ داوای لەپەروەردگاری کرد ئەم ڕەحمەتەی دابەزێنێتە سەر نەخۆش لەبەر پێویستی پێی؛ بەڵکو بەو ڕەحمەتەی شیفای بدات .

✍ **شایەتحاڵی فەرموودەکە:**

لەم فەرموودەیەدا ئیسپاتی عولو و بەرز وبڵندی خودا کراوە، هەروەها ئیسپاتی ئەوەش کراوە کە خودا لەئاسمانە و، عولو سیفەتێکی زاتیە هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، هەروەك لەفەرموودەکە تەوەسول کردن هەیە بۆلای خودا بەوەسف و سەنا و ستایش کردن بەپەروەردگاریەتی و خاوەنداریەتی و قودوسیەت و پەرستراویەتی و بەرزی و بڵندی وگشتگیری ئەمر و فرمانەکانی، هەروەها بەڕەحم و بەزەیی، پاشان لەفەرمودەکەدا داوای لێخۆش بوون و شیفای نەخۆشیش بوونی هەیە.

وە فەرمایشتەکەی ﷺ : «ألا تأمنوني»واتە: ئەوەچی ئێوە بەئەمینم نازانن! پێغەمبەر ﷺ ڕووی دەمی کردە ئەوکەسەی کە لەدابەش کردنی غەنیمەت و دەستکەوتدا ڕەخنەی لێگرت، و«ألا» : ئاداتی ئیستیفتاح و هۆشیار کردنەوەیە .

وە «تأمنوني» : لە (**الأمانة**)ـەوە هاتووە، کە بریتیە لە ئەمین بوون ودوور بوون لەخیانەت و نادادپەروەی ، واتە : (**ألا تأمنوني في قسمة المال**)ئەوەچیە ئێوە متمانەتان لەسەرم نیە لەدابەشکردنی ماڵ و دەستکەوتی جەنگدا، «وأنا أمين من في السماء» واتە: لەکاتێکدا من بەئەمین دانراوم لەگەیاندنی وەحی و پەیامی خوداو

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٦٤٦٩)، ومسلم (٢٧٥٢).

شەریعەتەکەیدا، ئەوەش بەسە بۆ ئەوەی شایەتی بێت لەسەر ئەمین و دەسپاکی و ڕاستگۆیی پێغەمبەر ﷺ .

✍ **شایەتحاڵێکی تری فەرموودەکە:**

ئیسپاتی عولوی تێدایە بۆ زاتی (الله)، هەروەك فەرمووی: «من في السماء» ئەوەی لەسەرووی ئاسمانە، یاخود لەئاسمانە، پێشتر شەرحی ئەم بڕگەیامان.

وفەرمایشتی : «والعرش فوق ذلك» پێشتر تەفسیری عەرش کرا، وفەرمایشتی : «فوق ذلك» واتە : لەسەرووی دروستکراو(مەخلوقاتەوە) ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لەفەرموودەکەدا بۆ هاوەڵەکانی باسکرد لەدووری نێوان زەوی و ئاسمان و نێوان هەر ئاسمانێك بۆ ئاسمانەکەی تر و، چڕی هەر ئاسمانێك و ئەو ڕوبارەی کە لەسەرووی ئاسمانی حەوتەمەوەیە و دووری نێوان سەرو و خواروی ئەو بەرزاییە بێشومارانەی کە لەسەرووی ئەو ڕوبارەوە هەیە، پاشان لەسەرەوەی ئەوەشەوە عەرش هەیە «والله فوق العرش» واتە : خودا بەرز و بڵند بووەتەوە بەسەر عەرشدا بەرز و بڵندیەك کە شایستە بێت بەگەورەیی و عەزەمەتی زاتی (الله) جل جلاله «وهو یعلم ما أنتم علیه» واتە: ئەو دەزانێت ئێوە لەسەر چ حاڵ و بارێکن بەو زانستە فراوانەی کە دەوری هەموو شتێکی داوە و هیچ شتێك لای ئەو شاراوە و نادیار نیە .

✍ **شایەتحاڵێکی تری فەرموودەکە:**

ئیسپاتکردنی عولو و بەرز بوونەوەی خودا بەسەر عەرشەکەیەوە، عەرشەکەی لەسەرووی هەموو دروستکراوەکانەوەیە و، زانستی خودا دەوری هەموو کار و کردەوەی بەندەکانی داوە، هیچ شتێك لای نادیار و شاراوە نیە .

(وقوله للجاریة) واتە: کەنیزەکەی موعاویەیی کوڕی حەکەم کاتێ کە سەیدەکەی موعاویە لێی توڕە بوو و زلەیەکی لێدا، پاشان پەشیمان بووەوە و هەواڵی لەو بارەیەوە گەیاندە پێغەمبەر ﷺ و، گوتی: ئایە ئازادی نەکەم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : «بلی، جئني بها»واتە: بەڵێ، بیهێنە بۆلام، ئەویش هێنای بۆلای ، پێغەمبەر ﷺ لێی پرسی : «أین الله؟» واتە: خودا لەکوێیە؟ ئەمەش بەڵگەیە لەسەر دروستیەتی پرسیار کردن

لەبارەی خوداوە بە(أين)لەکوێیە، کەنیزەکەش گوتی : «في السماء» واتە : خودا (جل جلاله) لەئاسمانە، ـ وپێشتر تەفسیری ئەم کەلیمەیە (**في السماء**)مان کرد - پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: «من أنا؟ »واتە: ئەی من کێم؟ پرسیاری لەبارەی بیر و باوەڕیەوە لێ کرد، ئەویش گوتی: (**أنت رسول الله**)تۆ پێغەمبەری خوایت، دانی نا بەوەی پەیام هێنەری خودایە، پێغەمبەریش ﷺ بەسەیدەکەی فەرموو: «أعتقها، فإنها مؤمنة»واتە: ئازادی بکە ئەمە کەسێکی باوەڕدارە. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەرکەسێك ئەو شایەتیە بدات ئەوا باوەڕدارە و، مەرجی ئازاد کردن باوەڕداریەتیە .

✍ **شایەتحاڵێکی تری فەرموودەکە:**

بەڵگەی تێدایە لەسەر (عولو)ی خودا بەسەر دروستکراوەکانییەوە لەسەر هەموو ئاسمانەکانیەوە و، ئاماژە دەکرێت بۆ خودا بەوەی لەجیهەتی (عولو)وە بەئاماژەدانێکی حسی .



## [٧] ئیسپاتکردنی لەگەڵ بوونی خودا بۆ بەندەکانی و، ئەو لەگەڵ بوونە پێچەوانەی عولوی خودا نییە لەسەر عەرشەکەی:

وَقَوْلُهُ ﷺ: «أَفْضَلُ الإِيمَانِ أَنْ تَعْلَمَ أَنَّ اللهَ مَعَكَ حَيْثُمَا كُنْتَ». حَدِيثٌ حَسَنٌ أخرجه الطبراني(١).

وە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ : «باشترین باوەڕ ئەوەیە بزانیت خودات لەگەڵە لەهەر جێگایەك بوویت» .

وَقَوْلُهُ ﷺ: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ إِلَى الصَّلاةِ؛ فَلاَ يَبْصُقَنَّ قِبَلَ وَجْهِهِ، وَلاَ عَنْ يَمِينِهِ؛ فَإِنَّ اللهَ قِبَلَ وَجْهِهِ، وَلَكِنْ عَنْ يَسَارِهِ، أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ» مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ(٢).

وفەرمایشتەکەی تری پێغەمبەر ﷺ : «گەر یەکێك لەئێوە هەستا نوێژی کرد با تف نەکاتە پێش خۆی، چونکە خودا لەپێشەوەیەتی، وبا تف نەکاتە لای ڕاستی، بەڵکو بیکاتە لای چەپی یاخود ژێر پێی» .

وَقَوْلُهُ ﷺ : «اللهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ وَالأَرْضِ وَرَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ، فَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى، مُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ وَالْقُرْآنَ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي وَمِنْ شَرِّ كُلِّ دَابَّةٍ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا، أَنْتَ الأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ؛ اقْضِ عَنِّي الدَّيْنَ وَأَغْنِنِي مِنَ الْفَقْرِ». رِوَايَةُ مُسْلِمٌ(٣) .

وفەرمایشتەکەی تری پێغەمبەر ﷺ: «خودایە پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و زەوی، پەروەردگاری عەرشی گەورە، پەروەردگارمان و پەروەردگاری هەموو شتێك،

---

(١) في الأوسط (٨/ ٣٣٦)، ومسند الشاميين (٥٣٥، ١٤١٦)، ورواه أبو نعيم في الحلية (٦/ ١٢٤).

(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (٤١٦)، ومسلم (٥٤٨).

(٣) برقم (٢٧١٣).

تەقێنەری دانەوێڵە و ناوك و دابەزێنەری تەورات و ئینجیل و فورقان (قورئان)، پەنات پێدەگرم لە شەڕ و زیانی هەموو ئەو دروستکراوانەی خۆت، خودایە تۆ هیچ شتێکت لە پێشەوە نە بووە و دەمێنیت لە دوای لەناوچوونی هەموو دروستکراوەکان و بە هێز و بەتوانایت و هیچ شتێکیش لە سەروو تۆوە نییە و هەموو درووست کراوەکانت پێویستیان بە تۆیە و کەسیش نییە، کە هاو شێوەی تۆ بێت، سا خودایە قەرزداریمان لەسەر لابەرە و دەوڵەمەندیشمان بکە لە هەژاری».

وَقَوْلُهُ ﷺ لَمَّا رَفَعَ الصَّحَابَةُ أَصْوَاتَهُمْ بِالذِّكْرِ: «أَيُّهَا النَّاسُ! أَرْبِعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ؛ فَإِنَّكُمْ لاَ تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلاَ غَائِبًا، إِنَّمَا تَدْعُونَ[1] سَمِيعًا بَصِيراً قَرِيبًا. إِنَّ الَّذِي تَدْعُونَهُ أَقْرَبُ إِلَى أَحَدِكُمْ مِنْ عُنُقِ رَاحِلَتِهِ». مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

وفەرمایشتەکەی تری پێغەمبەر ﷺ کاتێ کەهاوەڵان لەکاتی زیکر کردندا دەنگیان بەر بەرز کردەوە : «ئەی خەڵکینە، لەسەرخۆتان وبەزەییتان بە خۆتاندا بێتەوە و ئەوەندە دەنگ بەرزمەکەنەوە، چونکە ئێوە داوا لە زاتێك ناکەن کە نابیست و غائیب بێت، بەڵکو داوا لە خوایەك دەکەن کە بیسەرە و نزیکە، ئەوەی داوای لێ دەکەن نزیکترە لەیەکێك لەئێوەوە لەملی وشترەکەی».

## شەرح

فەرمایشتی : «أفضل الإيمان» واتە: یەکێك لەباشترین خەسڵەتەکانی باوەڕ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی باوەڕ چەندان پلەیە و بەهێزی و لاوازی هەیە، یەکێك لەباشترین پلەی باوەڕ ئەوەیە: «أن تعلم أن الله معك» بزانیت خودا لەگەڵتە، واتە: بەزانست و ئاگایی خۆی «حيثما كنت» واتە : لەهەر جێگایەك بووی، جا هەرکەسێك

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢٩٩٢)، ومسلم (٢٧٠٤).

ئەوەی زانی و ئەو هەستەی لا درووست بوو ئەوا نهێنی و ئاشکرا لای ئەو یەکسان دەبێت و لەهەموو حاڵ و بارێکدا ترسی خودای لەدڵدا دەبێت و شەرمی لێدەکات (أخرجه الطبراني) واته: ( أبو القاسم سليمان اللخمي) یەکێك لەحافزەکان ئەوانەی فەرموودەیەکی زیکریان گێڕاوەتەوە و ئەم فەرموودەیەیی لە [المعجم الكبير]دا ڕیوایەت کردووە .

جا فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئیسپاتکردنی لەگەڵ بوونی خودا بۆ بەندەکانی بەزانست و ئاگاداربوون لەکار و کردەوەکانیان و، پێویستە لەسەر مرۆڤ بەردەوام ئەوەی لەیاد بێت وکردەوەکانی چاك بکات . وە فەرمایشتی : «إذا قام أحدكم إلى الصلاة» واته: کاتێ چووە نێو نوێژەوە، «فلا يبصق» واته: با تف نەکاتە «قبل وجهه» واته: پێشی خۆی ، «قِبل» . بەکەسری قافەکە و فەتحی بائەکە «فإن الله قبل وجهه» چونکە خودا لەپێشەوەیەتی، ئەمە هۆکاری ڕێگری کردنەکەیە لەتف کردنە پێش خۆ لەکاتی نوێژدا بەوەی خودا «قبل وجهه» واته : لەبەرانبەریەتی، ئەم لەبەرانبەر بوونە بەشێوەیەکە کە شایستە وگونجاو بێت لەگەڵ زاتی اللەدا جل جلاله ئەمەش مانای ئەوە ناگەیەنێت خودا تێکەڵی درووستکراوەکانی بووبێت، بەڵکو خودا لەسەرووی ئاسمانەکانی خۆیەتی و بەرز و بڵند بووەتەوە بەسەر عەرشدا و نزیکە لەدروستکراوەکانی و دەورەی داون .

«ولا عن يمينه» واته : وبا نوێژ خوێن تف نەکات بەلای ڕاستی دا؛ ئەوەش وەك ڕێزێك بۆلای ڕاست، لەبەرئەوەی دوو فریشتەکە لەلای ڕاستی نوێژ خوێنەکەوەن، هەروەك لەڕیوایەتەکەی بوخاری دا هاتووە «ولكن عن يساره أو تحت قدمه» واته : بەڵکو با نوێژ خوێنەکە تف بکاتە لای چەپی یاخود ژێر پێی.

### ✍ شایەتحاڵی فەرموودەکە:

ئیسپاتکردنی نزیکی خودای تێدایە لەبەندەکەیەوە کاتێ کە نوێژ دەکات و لێی نزیک بوونەوەی و خودا لەسەرووەیەتی.

وە فەرمایشتی : «اللهم رب السموات السبع» وشەی (**اللهم**)ئەسڵەکەی : (**یا الله**)یە، میمەکە لەبری یائی نیدائەکەیە[1]، «رب السموات السبع» واتە: دروستکار(خالیق) و بەدیهێنەر و خاوەنی، «ورب العرش العظیم» واتە : عەرشێکی مەزن و گەورە کە هیچ کەسێك ئەندازەی گەورەییەکەی نازانێت جگە لەخودا نەبێت، عەرش گەورەتین دروستکراوەکانە، پێشتر تەفسیری عەرشمان کرد «ربنا ورب کل شيء» واتە : خالیق و بەدیهێنەر و ڕۆزی دەرمان و دروستکار و خاوەنی هەموو شتێك ، لەم فەرموودەیەدا ئیسپاتی خاوەنداریەتی خودا کراوە بۆ هەموو شتێك «فالق الحب والنوی» واتە : تەقێنەری دانەوێڵە و ناوکی خورما «منزل التوراة» دابەزێنەری تەورات بۆ سەر موسا «والإنجیل» بۆ سەر عیسا «والقرآن» بۆ سەر موحەمەد (علیهم أفضل الصلاة والسلام)، جا ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر فەزڵ و پلەی ئەم کتێبانە و، ئەو کتێبانە لەلایەن خوداوە دابەزێندراون .

«أعوذ» واتە : پەنا دەگرم و پەنا دێنمە «بك»لای تۆ ئەی خودایە«من شر کل دابة» واتە : لەشەڕ و خراپەی هەموو جۆرە گیاندارێك کە بەسەر زەویدا دەڕوات «أنت آخذ بناصیتها» جا (**الناصیة**) : پێشی پێشەوەی سەر و نێو چەوانە، واتە: ئەجەلم و ڕۆزیم و هەموو ژیانم بەدەستی تۆیە و لەژێر دەسەڵاتی تۆدایە هەرچۆنێکت بوێ وای لێدەکەیت، بەڵکو شەڕەکەیم لێ دوور خەیتەوە .

«أنت الأول فلیس قبلك شيء، وأنت الآخر فلیس بعدك شيء، وأنت الظاهر فلیس فوقك شيء، وأنت الباطن فلیس دونك شيء» ئەم چوار ناوە: دوانیان ناون بۆ ئەزەلیەت و ئەبەدیەتی خودا، کە ئەوانیش (الأول والآخر) ، ودوو ناوەکەی تریان بۆ عولو و نزیکی خودایە، ئەوانیش : (الظاهر والباطن) ئەم دووەیان مەوزوعی شاهیدی فەرموودەکەن؛ چونکە لەم دوو فەرموودەیەدا ئیسپاتی عولو و نزیکی خودا کراوە، جا

---

(١) شرح ابن عقیل (٣/ ٢٦٥)، والتنبیهات السنیة (١٧٧).

ئەم دوو ناوە پێچەوانە و دژی یەك نین، خودا (جل جلاله) نزیکە لەبەرزی و عولویدا ، وبەرز و بڵندیشە لەنزیکی دا .

«اقض عني الدين» واتە : قەرز و مافەکانی خودا و قەرز و مافەکانی خەڵکم بۆ بدەرەوە، ئەمەش جۆرێکە لەدەرخستنی بێدەسەڵاتی و لاوازی و بێتوانایی «وأغنني من الفقر» ، و(**الفقر**)پێویستیە، و(**الفقير**) : ئەوکەسەیە کە هیچی نییە یاخود هەندێ شتی هەیە، بەڵام بەشی پێویستیەکانی ناکات، هەروەها لەفەرموودەکەدا دروستێتی تەوەسول کردن هەیە بۆلای خودا بەناو و سیفاتەکانی لەجێ جەبێ کردنی پێویستیەکان و وەڵامدانەوەی پاڕانەوە .

(وقوله ﷺ لما رفع الصحابة أصواتهم بالذكر) واتە: فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ کاتێ کە هاوەڵان دەنگیان بەرز کردەوە بەزیکر، ئەوە لەجەنگی خەیبەردا بوو، هەروەك لەهەندێ ڕیوایەتی فەرموودەکەدا هاتووە، ئەو زیکرەی کە دەنگیان پێی بەرز کردەوە ئەمە بوو : (**الله أكبر لا إله إلا الله**).

هەروەها فەرمایشتەکەی : «اربعوا» واتە: بەزەیتان بەخۆتاندا بێتەوە «فإنكم» بەڕاستی ئێوە، ڕونکردنەوەی هۆکاری فەرمان کردنەکەیە بەبەزەیی هاتنەوەکە «لا تدعون أصم ولا غائبا» واتە: لەکەسێك ناپاڕێنەوە نابیست و دوور و غائیب بێت و نەتانبینێت، نەفی نەبیست و نەبینینی کرد و، دژەکەیانی ئیسپاتکرد و فەرمووی: «إنما تدعون سميعاً بصيراً قريباً» واتە: بەڵکو ئێوە بانگی کەسێکی بیسەر وبینا و نزیك دەکەن بۆیە پێویست بەدەنگ بەرزکردنەوە ناکات «إن الذي تدعونه أقرب إلى أحدكم من عنق راحلته» خودا نزیکە لەو کەسەی لێی دەپاڕێتەوە و زیکرو یادی دەکات. بۆیە پێویست بەدەنگ بەرزکردنەوە ناکات وخودا دەنگمان دەبیستێت کاتێ دەنگمان نزم بکەینەوە هەروەك چۆن دەنگمان دەبیستێت کاتێ بەرزی دەکەینەوە.

✍ **شایەتحاڵێکی تری فەرموودەکە:**

ئیسپاتی نزیکی خودای تێدایە لەو کەسەی لێی دەپاڕێتەوە، خودا دەنگە زۆر نزم و نهێنیەکان دەبیستێت هەروەك چۆن دەنگە بەرزەکان دەبیستێت.

هەموو ئەم فەرموودانە لەگەڵ بوونی خودا بۆ دروستکراوەکانی و هەروەها نزیکی لێیانەوە وگوێبیست بوونی دەنگەکانیان وبینینی جوڵەو حەرەکاتیان ئیسپات دەکات و، ئەوەش پێچەوانە و دژ نییە لەگەڵ عولوی خودا و بەرزبوونەوەی بەسەر عەرشدا، پێشتر باسی لەگەڵ بوونی خودا وجۆرەکانی و بەڵگەیانی لەقورئانی پیرۆزدا کرد لەگەڵ تەفسیر کردنی ئەو بەڵگەو شەواهیدانە . والله أعلم .



## [٨] ئیسپاتکردنی بینینی خودا لەلایەن باوەڕدارانەوە:

قَوْلُهُ ﷺ: «إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ الْقَمَرَ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، لاَ تُضَامُونَ فِي رُؤْيَتِهِ، فَإِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَن لاَّ تُغْلَبُوا عَلَى صَلاةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَصَلاةٍ قَبْلَ غُرُوبِهَا؛ فَافْعَلُوا». مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ[١] .

وفەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ: «ئێوە پەروەردگارتان دەبینن هەروەك چۆن مانگ لەشەوی چواردەدا دەبینن و، توشی هیچ کێشە وپاڵەپەستۆیەك نابن لەبینینیدا، هەتا دەتوانن ئاگادار بن و پارێزگاری لە ئەنجامدانی نوێژەکانتان بکەن لە پێش دەرچوونی خۆر (نوێژی بەیانی) ولە پێش ئاوابوونی خۆر (نوێژی عەسر)» .

---

### شەرح

فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ: «إنكم سترون ربكم» ڕووی قسەکە لەباوەڕدارانە و(سین)ـەکە بۆ داهاتوویەکی نزیکە و، مەبەست لێی جەختکردنەوەیە[٢] ، ووتەکەی : «ترون ربكم» واتە : بەچاوەکانتان دەیبینن، جا ئەو فەرموودانەی باس لەبینینی خودا دەکەن لەلایەن باوەڕدارانەوە موتەواتیرن .

وفەرمایشتی: «كما ترون القمر ليلة البدر» هەروەك چۆن مانگی چواردە دەبینن، واتە: ئەوشەوەی مانگ پڕ دەبێت کە ئەویش مانگی چواردەیە، لەو شەوەدا مانگ بەتەواوی پڕ دەبێت وبەجوانی دەبیندرێت، ومەبەست لەم چواندنە جەختکردنەوەیە لەبینینی خودا و، نەفی مەجاز لێی، ئەم چواندنە چواندنی بینینە بەبینین نەك چواندنی

---

(١) متفق عليه : أخرجه البخاري (٥٥٤) ، ومسلم (٦٣٣) .
(٢) بڕوانە: «التنبيهات السنية» (١٨٠) .

بینراو بەبینراو ؛ چونکە خودا فەرموویەتی: ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ﴾واتە:هیچ شتێك هاوشێوەی خودا نییە .

هەروەها فەرمایشتی : «لا تُضامون في رؤيته» بەزەممی تائەکە و تەخفیفی میمەکە، واتە : توشی هیچ نارەحەتی و ستەمێك نابن لەبینینی دا بەشێوەیەك هەندێکتان بینین و هەندێک نەیبینن، لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە بەفەتحی تائەکە و تەشدیدی میمەکە، واتە: هەندێکتان ناچن بۆلای ئەویتر لەپێناو بینینی دا، ماناکەی بەپێی ئەم ڕیوایەتە: هەمووتان لەیەك جێگادا کۆنابنەوە بۆ بینینی بەشێوەیەک توشی پاڵەپەستۆ ببن، وماناکەی بەپێی هەردوو ڕیوایەتەکە: هەمووتان بەدڵنیاییەوە دەیبینن هەریەکەو لەجێگاکەی خۆیەوە[1] . .

هەروەها فەرمایشتی : «فإن استطعتم أن لا تغلبوا» واتە: گەر توانیتان لەوانە نەبن کە سەرقاڵ نابن بەهۆی نوستن و ئیش وکارەوە «على صلاة قبل طلوع الشمس» لەنوێژ کردن پێش خۆرهەڵاتن، کە ئەویش نوێژی بەیانییە، «وصلاة قبل غروبها»ونوێژ کردن پێش ئاوابوونی خۆر کە ئەویش نوێژی عەسرە «فافعلوا» واتە : ئەوە بکەن و پارێزگاری بکەن لەم دوو نوێژە بەجەماعەت لەکاتی دیاری کراوی خۆیاندا و، ئەم دوو نوێژەی بەتایبەت هێناوە لەبەر ئەوەی فریشتەکان تێیدا ئامادە دەبن و، ئەم دوو نوێژە باشترین نوێژن، بۆیە وا گونجاوە پاداشتی ئەوانە بدرێتەوە کە پارێزگاری لێدەکەن بەباشترین پاداشت کە ئەویش تەماشاکردنی خودایە (جل جلاله) .

**✍ شایەتحاڵی فەرموودەکە:**

ئیسپاتکردنی بینینی خوای تێدایە لەلایەن باوەڕدارانەوە بەچاوی سەر لەڕۆژی دوایی دا، پێشتر باسی ئەوانەمان کرد کە لەم بابەتەدا ناکۆکن و وڵامی گومانەکانیانمان دایەوە لەکاتی تەفسیرکردنی ئەو ئایەتانەدا کە ئیسپاتی بینینی خودا دەکەن . والله أعلم .

---

(١) بڕوانە: «فتح الباري» (١٣/٥٢٦) ، و «التذكرة» للقرطبي (١ / ٣٩٤) .

## هەڵوێستی ئەهلی سوننە
## بەرانبەر ئەو فەرموودانەی کە ئیسپاتی سیفەتەکانی خودای تێدا کراوە

**إِلَى أَمْثَالِ هَذِهِ الأَحَادِيثِ الَّتِي يُخْبِرُ فِيهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ رَبِّهِ بِمَا يُخْبِرُ بِهِ؛ فَإِنَّ الْفِرْقَةَ النَّاجِيَةَ أَهْلَ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ يُؤْمِنُونَ بِذَلِكَ؛ كَمَا يُؤْمِنُونَ بِمَا أَخْبَرَ اللهُ بِهِ فِي كِتَابِهِ؛ مِنْ غَيْرِ تَحْرِيفٍ وَلا تَعْطِيلٍ، وَمِنْ غَيْرِ تَكْيِيفٍ وَلاَ تَمْثِيلٍ.**

**جگە لەم فەرموودانەش کە تێیدا پێغەمبەر ﷺ لەپەروەردگاریەوە هەواڵی داوە لەبارەیەوە؛ کۆمەڵەی ڕزگاربوو لەئەهلی سوننە و جەماعەت باوەڕیان پێیەتی، هەروەک چۆن باوەڕیان بەوەیە کە خودا هەواڵی لەبارەوە داوە لەقورئانەکەیدا، بەبێ گۆڕین مانا و لەکارخستن و بەبێ چۆنیەتی بۆدانان و چواندن.**

---

### شەرح

ئەمە ڕونکردنەوەی هەڵوێستی ئەهلی سوننە و جەماعەیە بەرانبەر ئەو فەرموودانەی کە هاتوون لەبارەی سیفاتەکانەوە، جا هەڵوێستیان بەرانبەر ئەم فەرموودانە هەمان هەڵوێستە کە بەرانبەر ئایەتەکانی سیفات هەیانە، کە بریتیە لە باوەڕبوون بەهەقیقەتەکەی بەو شێوەیەیی کە دەلالەت دەکات لەسەری، لەمانا دیارو ئاشکراکەی لاینادەن بۆ جۆرەها تەئویلی ناڕاست و باتڵ و، نەفی ئەو مانایە ناکەن کەدەیدات بەدەستەوە و لەکاری خەن، هەروەها ئەو سیفاتانە ناشوبهێنن بەسیفەتی دروستکراوەکان؛ چونکە خودا (لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ).

ئەوان بەوکارەیان پێچەوانەی ڕێچکە داهێنراوەکان دەکەن هاوشێوەی جەهمی و موعتەزیلە وئەشعەریەکان ئەوانەی کە هەڵوێستیان بەرانبەر ئەم دەقانە هەڵوێستێکی

نەرێنییە و نکۆڵی لێدەکەن یاخود تەئویلی دەکەن و مانا هەقیقیەکەی پێنادەن، هەروەها موشەبیهەکان ئەوانەی زێدەڕۆییان کرد لەئیسپاتکردندا بەشێوەیەك خودایان شوبهاند بە دروستکراوەکانی، تعالى الله عما يقولون علواً كبيراً.



# پێگە و پایەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەنێو گروپ و تاقمە ئیسلامییەکاندا

بَلْ هُمُ الْوَسَطُ فِي فِرَقِ الأُمَّةِ؛ كَمَا أَنَّ الأُمَّةَ هِيَ الْوَسَطُ فِي الأُمَمِ؛ فَهُمْ وَسَطٌ فِي بَابِ صِفَاتِ اللهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى بَيْنَ أَهْلِ التَّعْطِيلِ الْجَهْمِيَّةِ، وَأَهْلِ التَّمْثِيلِ الْمُشَبِّهَةِ؛ وَهُمْ وَسَطٌ فِي بَابِ أَفْعَالِ اللهِ بَيْنَ الْجَبْرِيَّةِ وَالْقَدَرِيَّةِ. وَفِي بَابِ وَعِيدِ اللهِ بَيْنَ الْمُرْجِئَةِ والْوَعِيدِيَّةِ مِنَ الْقَدَرِيَّةِ وَغَيْرِهِمْ.

وَفِي بَابِ أَسْمَاءِ الإِيمَانِ والدِّينِ بَيْنَ الْحَرُورِيَّةِ وَالْمُعْتَزِلَةِ، وَبَيْنَ الْمُرْجِئَةِ وَالْجَهْمِيَّةِ. وَفِي أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ بَيْنَ الرَّافِضَةِ وَ الْخَوَارِجِ.

بەڵکو ئەوان وەسەتن لەنێو گروپە ئیسلامیەکاندا، هەروەك چۆن ئوممەتی ئیسلامی وەسەتە لەنێو ئومەتانی تردا، ئەهلی سوننە وەستن لەبابەتی ناو وسیفاتەکانی خوادا لەنێوان جەهمیەکان ئەوانەی سیفاتەکانی خودا تەعتیل دەکەن و لەکاری دەخەن لەگەڵ موشەبیهەکاندا ئەوانەی سیفاتەکانی خودا دەشوبهێنن بەسیفاتی درووستکراوەکانی، هەروەها وەسەتن لەبابەتی کارەکانی خودادا لەنێوان جەبری و قەدەرییەکاندا و، لەبابەتی هەڕەشەکانی خوادا وەسەتن لەنێوان مورجیئە و وەعیدیە قەدەرییەکاندا و، لەبابەتی هەقیقەتی ئیماندا ودیندا وەسەتن لەنێوان حوروری و موعتەزیلە لەگەڵ مورجیئە و جەهەمییەکان و، لەبابەتی هاوەڵانی پێغەمبەری خودا وەسەتن لەنێوان ڕافیزە و خەواریج دا.

---

## شەرح

دوای ئەوەی شێخ باسی هەڵوێستی ئەهلی سوننە و جەماعەی کرد بەرانبەر بەو دەقانەی کە لەقورئان سوننەدا هاتوون لەبارەی سیفاتەکانی خوداوە، ویستی تیشك

بخاتە سەر ڕێز وپلەیان لەنێو تاقم وگروپە ئسلامیەکاندا تاوەکو ڕێز و قەدر و پلەیان بەبەراورد بەتاقمەکانی تر بزانرێت. چونکە بەڕاستی دژەکان جوانی دژی خۆیان دەردەخەن، وەك وتراوە: شتەکان بەدژەکانیان ڕوندەبنەوە . شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: (بل هم الوسط في فرق الأمة) لەکتێبی [**المصباح المنير**]دا دەڵێت : (**الوسط بالتحريك**) : مامناوەند(**المعتدل**)، ومەبەست لە (**الوسط**) لێرەدا: ئەوەی مامناوەند و دادپەروەرە ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾ [البقرة:١٤٣] ،واتە: هەر چۆنێ بۆ ئایینی پیرۆزی ئیسلام ڕێنماییمانکردن، هەر ئاواش لە تەواوی ئیشوکاردا کردومانن بە ئوممەت و گەلێکی میانڕەوی مامناوەند، واتە: ئێوە ئەی موسڵمانان! نە وەکو (نەصارا) زێدەڕەون، نەوەکو جوولەکەش کەمتەر خەمن، کەوابوو ئێوە ئوممەتێکی خێرخوازو هەڵبژێردراون ، تا لەسەر ئەو خەڵکە ببنە شایەت کە: بەڵێ.. پەیامبەر -ﷺ- پەیامەکەی خوای گەورەی بەڕاست و ڕەوان گەیاند.

**جا ئەهلی سوننە وەسەتن:** بەو مانایەیی: ئەوان داپەروەر و باشترینن، هەروەها ئەوان: مامناوەندن لەنێوان زێدەڕۆی و کورتڕەویدا و، ئەوان وەسەت و مامناوەندن لەنێو گروپە ئیسلامیەکاندا، هەروەك چۆن ئومەتی ئیسلامی وەسەتە لەنێوان ئومەتانی تردا. ئەم ئوممەتە وەستە لەنێوان ئومەتاندا ئەوەش لەڕووی ئەوەی هەندێکیان بەرەو زێدەڕۆیی وتوندڕەوی چوون و ئومەتانێکی تر کە بەرەو شلڕەوی و کورتڕەوی چوون؛ ئەهلی سوننە وجەماعە لەم ئومەتەدا وەسەتن لەنێوان گروپە داهێنراوەکاندا ئەوانەی کە لایانداوە لەڕێگای ڕاست و هەندێکیان بەرەو زێدەۆیی و هەندێکیانیش بەرەو کورتڕەوی .

✍ **پاشان شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) درێژەی ئەم بابەتە ڕوون دەکاتەوە و دەڵێت: (فهم) ئەوان، واتە: ئەهلی سوننە و جەماعە :**

**یەکەم:** (وسط في باب صفات الله سبحانه وتعالى بين أهل التعطيل الجهمية وأهل التمثيل المشبهة) جەهمیەکان - نیسبەتە بۆلای جەهمی کوڕی سەفوانی تورموزی ـ ئەم تاقمە زێدەڕۆییان کرد لە پاك ڕاگرتن و تەنزیهی خودادا تاوەکو نەفی ناوەکانی خوداو سیفاتەکانیان کرد ؛ بەحسابی خۆیان وەك هەڵاتن لەچواندنی خودا، بەوهۆیەوە ناویان نرا موعەتیلە؛ لەبەر ئەوەی ئەوان تەعتیلی ناو و سیفاتەکانی خودایان کرد و لە کاریانخست .

(وأهل التمثيل المشبهة) ئەم ناوەیان لێ نرا ؛ لەبەرئەوەی زێدەڕۆییان کرد لەئیسپاتکردنی سیفاتەکاندا، تاوەکو خودایان چواند بەدروستکراوەکانی و سیفاتەکانی خودایان شوبهاند بەسیفاتی درووستکراوەکان، تعالى الله عما يقولون .

بەڵام ئەهلی سوننە وەسەت و مامناوەند بوون لەو نێوەندەدا، سیفاتەکانی خودایان ئیسپاتکرد بەو شێوەیەیی کە شایستە و گونجاوە لەگەڵ زاتی (الله)دا بەبێ شوبهاندن و چواندن، ئەمان زێدەڕۆییان نەکرد لەبەپاك ڕاگرتن و تەنزیهدا، هەروەها زێدەڕۆیشیان نەکرد لەئیسپاتدا، بەڵکو تەنزیهی خودایان کرد بەبێ تەعتیل و لەکارخستنی سیفاتەکانی، وناو و سیفاتیان بۆ ئیسپاتکرد بەبێ چواندن .

**دووەم :** وئەهلی سوننە و جەماعە (وسط في باب أفعال الله بين الجبرية والقدرية)واتە: مامناوەندن لەبابەتی کار و فیعلەکانی خودادا لەنێوان جەبری و قەدەریەکاندا .

هەرچی(الجبرية)یەکانە نیسبەتە بۆلای **(الجبر)**تۆپزی و زۆر لێکردن؛ چونکە ئەوان دەڵێن : بەندە زۆرلێکراو مەجبوورە لەسەر ئەنجامدانی کارەکانی، ئەم تاقمە زێدەڕۆییان کرد لەئیسپاتکردنی کار وفیعلەکانی خودادا بەشێوەیەك کە نەفی کار و فیعلیان کرد لەبەندە و هەموویان دایە پاڵ خودا و، بانگەشەی ئەوەیان دەکرد مرۆڤ هیچ شتێك ناکات، بەڵکو خودا فاعیل و بکەرە هەقیقیەکەیە و مرۆڤ مەجبور و زۆرلێکراوە لەئەنجامدانی کار و کردەوەکانی دا و هیچ دەسەڵات و ئیختیارێکی نییە، حەرەکە و جوڵە و کارەکانی هەمووی ناچارییە و بەزۆرە، هاوشێوەی حەرەکە و

جوڵەی ئەو کەسەی دەلەرزێت بەبێ ویستی خۆی، و ئەمان دەڵێن دانەپاڵی کردەوە بۆلای مرۆڤ مەجازە و هەقیقەت نییە .

(والقدرية) نیسبەتە بۆ لای قەدەر، ئەم تاقمە ، واتە: قەدەرییەکان بەپێچەوانەی جەبریەکانەوە زێدەڕۆییان کرد لەئیسپاتکردنی کار وفیعلی بەندەکاندا و، گوتیان: ئەوە مرۆڤە بەدیهێنەری کار و کردەوەکانی خۆیەتی، بەبێ ئەوەی ویست و ئیرادەی خودای لەسەر بێت و، دەڵێن: کارەکانی بەندەکان لەژێر دەسەڵات و ویستی خودادا نییە و خودا تەقدیری نەکردووە و نەیویستووە، بەڵکو مرۆڤەکان خۆیان و سەربەخۆ ئەنجامیان داوە.

بەڵام ئەهلی سوننە مامناوەندیان هەڵبژارد و گوتیان: بەندە ویست و ئیختیاری هەیە و کاریش لێوەی ڕوو دەدات، بەڵام ناتوانێت هیچ شتێك ئەنجام بدات بەبێ ویست و ئیرادە وتەقدیری خودا، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴾ [الصافات: ٩٦] ،واتە: خودا ئێوەی بەدیهێناوە وئەو کار و کردەوانەش کە ئەنجامی دەدەن. وەك دیارە ئایەتەکە کار و کردەوەی ئیسپات کرد بۆ بەندەکان بەڵام لەهەمان کاتدا ئاماژەی بەوەکرد کە ئەو کار و کردەوانە بەدیهێنراوی خودان و خودا تەقدیری کردوون .

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ [التكوير: ٢٩] ، واتە: هیچ شتێکتان ناوێت و ناتوانن بتانەوێت مەگەر ئەوە نەبێ کە پەروەردگاری جیهانیان ویستی لەسەرە و دەیەوێت. لەم ئایەتەدا ویست و مەشیئەتی ئیسپاتکرد بۆ بەندەکان، بەڵام ویست و مەشیئەتێك کە لەدوای ویست و مەشیئەتی خوداوە دێت و تابعیەتی.

دواتر لەبابەتی قەدەردا زیاتر لەم بارەوە قسەو باسمان دەبێت ـ إن شاء الله تعالى ـ.

**سێیەم:** ئەهلی سوننەو جەماعە مامناوەند و وەسەتن لەبابەتی وەعید و هەڕەشەکانی خودادا ، و(الوعيد) بریتییە: لەهەڕەشە و ترساندن، لێرەدا مەبەست لێی ئەو دەقانەیە کە هەڕەشەو چاوترساندنیان تێدایە بۆ کەسانی سەرپێچیکار بەوەی سزا دەدرێن.

ووتەکەی: (بين المرجئة والوعيدية من القدرية وغيرهم) واتە: لەنێوان مورجیئەو قەدەرییە وەعیدییەکان ، و(**المرجئة**) : نیسبەتە بۆلای (**الإرجاء**) کە بریتییە لەدواخستن و تاخیرکردن و، ئەو ناوەیان لێنراوە ؛ لەبەر ئەوەی ئەوان کردەوەیان دواخستووە و دەریانهێناوە لەپێناسەی ئیمان، بەشێوەیەك پێیان وایە کەسێك تاوانی گەورە ئەنجام بدات فاسق نییە و، دەڵێن: لەگەڵ ئیماندا هیچ تاوانێك زیانی نییە، هەروەك چۆن لەگەڵ کوفردا هیچ تاعەت و عیبادەتێك سوودی نییە، لەلای ئەوان کەسێك تاوانی گەورەش ئەنجام بدات ئیمانی کامڵ و تەواوە و هیچ هەڕەشەیەك نایگرێتەوە، ئەوان زۆر کورتڕەون لە حوکم دان بەسەر تاوانباردا و زیاد لە پێویست شلڕەون، تاوەکو ئاستێك پێیان وایە تاوان ئیمان لاواز ناکات و، حوکمی فاسق بوون نادرێت بەسەر کەسێکدا تاوانی گەورەی ئەنجام دابێت.

هەروەها هەرچی (الوعيدية)یەکانیشە: ئەوانە ئەو کەسانەن کە پێیان وایە دەبێ و پێویستە ئەو هەڕەشەیەی لەکەسی تاوانبار کراوە بهێندرێتە جێ و، زۆر توندن لەوەدا، بەشێوەیەك دەڵێن: کەسێک تاوانی گەورەی ئەنجام دابێت گەر بمرێت و تەوبەی نەکردبێت ئەوا بەهەتا هەتایی لەدۆزەخ دا دەمێنێتەوە و، لەدونیادا لەچوارچێوەی ئیمان دەردەکەن و کافری دەکەن .

**بەڵام ئەهلی سوننە و جەماعە مامناوەند و وەسەتن لەنێوان ئەو دوو تاقمەدا و دەڵێن:** کەسێك تاوانی گەورە ئەنجام بدات تاوانبارە و ئیمانی کامڵ نییە و حوکمی فاسقی دەدرێت بەسەریدا - نەك وەك مورجیئەکان کە دەڵێن: ئیمانێکی کامڵی هەیە و هیچ هەڕەشەیەك نایگرێتەوە - بەڵام ئەو کەسە بەهەتا هەتایی لەدۆزەخ دا نامێنێتەوە گەر چووە ناوی، بەڵکو دەکەوێتە سەر ویستی خودا گەر بیەوێ لێی خۆش دەبێت و،

گەریش ویستی لێبێت بەئەندازەی تاوانەکەی سزای دەدات پاشان لەئاگر ڕزگاری دەبێت و دەچێتە بەهەشتەوە - وە نەوەك وەعیدیەکان کە حوکمی کافری دەدەن بەسەریدا و دەڵێن بەهەتا هەتایی لەدۆزەخ دا دەمێنێتەوە - مورجیئەکان وابەستەی ئەو دەقانە بوون کە وەعد و پەیمانی خۆشی تێدایە و هەرچی وەعیدیەکانیشە دەستیانگرتووە بەو دەقانەوە کە هەڕەشە و تۆڵەسەندنەوەی تێدایە، بەڵام ئەهلی سوننە هەریەك لەو دووەیان وەرگرتووە و هیچ یەکێك لەو دوو جۆرە دەقانەیان فەرامۆش نەکردووە.

**چوارەم:** ئەهلی سوننە و جەماعە مامناوەند و وەستن لە(باب أسماء الإيمان والدين) واتە : لەبابەتی حوکم دان بەسەر مرۆڤدا بەکوفر، یاخود ئیسلام یاخود فیسق و، لەپاداشتی کەسی سەرپێچی کاردا لەدونیا و دوارۆژدا .

(بين الحرورية والمعتزلة وبين المرجئة والجهمية)واتە: لەنێوان حوروری و موعتەزیلە و جەهمییەکان، و(**الحرورية**) : خەواریجەکانن، ئەم ناوەیان لێنراوە وەك نیسبەتێك بۆ (**حروری**) کە دێیەکە لەعێراق، لەو جێگایەدا هەموو خەواریجەکان کۆبوونەوە ئەو کاتەی کە لەدژی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕاپەڕین وخروجیان کرد .
و(المعتزلة) : شوێنەکەوتەی واسڵی کوڕی عەتان ئەوەی کە ئیعتزالی کرد لەکۆڕ و مەجلیسی حەسەنی بەسری و لێی جیا بووەوە و، شوێنکەوتووەکانی بەهۆی ئەو خیلاف و ڕاجیاییەوە لەدەوری کۆ بوونەوە و حەسەنیش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەبارەی واسڵەوە گووتی: (**إنه قد اعتزلنا**)ئەو لێمان جودا بووەوە، بۆیە لەوەوە ناویان نرا موعتەزیلە.

جا هەریەك لەمەزهەبی خەواریج و موعتەزیلە بەرانبەر بەکەسێك تاوانی گەورە ئەنجام بدات لەموسوڵمانان: مەزهەبێکی توندە، لەبەرئەوەی ئەوان لەئیسلام دەریدەکەن، بەڵام موعتەزیلەکان دەڵێن: نەموسوڵمانە و نەکافریشە، بەڵکو لەو نێوەندەدایە ( **المنزلة بين المنزلتين**)! وهەرچی خەورایجەکانیشە گوتیان: کافرە، بەڵام

هەردوو تاقمەکە (خەواریج و موعتەزیلە) کۆدەنگن لەسەر ئەوەی گەر بەو حاڵەوە بمرێت بەهەتا هەتایی لەدۆزەخ دا دەمێنێتەوە.

جا لە بەرانبەر ئەم دوو تاقمە توندەدا هەریەک لە مورجیئەو جەهمییەکان درووست بوون و زیاد لە پێویست کورتڕەو شلڕەو بوون لەبارەی ئەوکەسەی تاوانی گەورە ئەنجام دەدات و، گوتیان: لەگەڵ ئیماندا تاوان هیچ زیانێکی نییە؛ لەبەرئەوەی ئیمان لای ئەوان (**هو تصديق القلب فقط**)تەنها بەڕاست زانینی بەدڵ، یاخود (**مع نطق اللسان**)لەگەڵ دەربڕین بەزمان، لەمەشدا خیلافیان هەیە و هەندێکیان دەڵێن تەنها بەڕاست زانینی دڵە و، هەندێکی تریانیش دانپیانانی زمانیشی بۆ زیاد دەکەن و، لای ئەوان کردار(**عمل**) بەشێك نییە لەئیمان و پێیان وایە ئیمان بەکردەوەی چاکە زیاد ناکات و بەتاوانی خراپەش کەم ناکات و لاواز نابێت، کەسی تاوانبار لای ئەوان ئیمانەکەی کەم ناکات و شایستەی چوونە دۆزەخ نییە بەمەرجێك بەحەڵاڵی نەزانێت.

**هەرچی ئەهلی سوننە و جەماعەشە مامناوەند و وەستن لەنێوان ئەو دوو تاقم و بۆ چوونەدا و دەڵێن:**

کەسی تاوانبار بەهۆی تاوانەوە لەبازنەی باوەڕ دەرناچێت و، بەنیسبەت سزادانیەوە دەکەوێتە سەر ویستی خودا گەر ویستی لەسەر بێت لێی خۆش دەبێت گەرنا سزای دەدات بەئاگری دۆزەخ، بەڵام بەهەتا هەتایی تێیدا نامێنێتەوە وەك ئەوەی خەواریج و موعتەزیلەکان دەیڵێن و، تاوان ئیمان لاواز دەکات و خاوەنەکەی شایستەی چوونە نێو دۆزەخە مەگەر خودا لێی خۆش بێت، وکەسێك تاوانی گەورە ئەنجام بدات فاسقە و ئیمانەکەی تەواو نییە، نەك وەک ئەوەی مورجیئەکان دەیڵێن : گوایە ئیمانەکەی کامڵ و تەواوە، والله تعالى أعلم .

**پێنجەم:** ئەهلی سوننە و جەماعە مامناوەند و وەسەتن لەبارەی (أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ بَيْنَ الرَّافِضَةِ وَ الْخَوَارِجِ).سەحابە وهاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﷺ لەنێوان ڕافیزە و خەواریج دا، و(**الصحابي**): ئەو کەسەیە کە گەیشتووە بە پێغەمبەر ﷺ و باوەڕی پێهێناوە و لەسەر ئەو باوەڕە مردووە.

و(الرافضة): ناوێکە لە ڕەفزکردنەکەوە(**الرفض**)هاتووە، کە بریتیە لەتەرک و ڕەتکردنەوە، هۆکاری ناولێنانیان بەم ناوە؛ ئەوەبوو ئەو تاقمە چوونە لای زەیدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەین و پێیان گوت: خۆت بەریکە لە شێخەین (ئەبو بەکر و عومەر)، ئەویش بەقسەی نەکردن و، گوتی: پەنا بەخوا کارێکی وا بکەم، ئەوانیش لەبەرانبەردا زەیدیان ڕەفز کرد و، ئەم ناوەیان لێنرا .

مەزهەبی ڕافیزە لەئاست هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ: ئەوان زێدەڕۆییان کرد لەعەلی و ئالو بەیتدا و ڕێزیانیان دا بەسەر غەیری خۆیاندا و لەگەڵیشدا دوژمنایەتیان بەرپا کرد دژ بە هاوەڵەکانی تر، بەتایبەت سێ خەلیفەکە ئەبو بەکر و عومەر وعوسمان رضي الله عنهم و،وجوێنیان پێدان و نەفرەتیان لێکردن، بەڵکو هەندێکیان کافر کرد ، لەبەرانبەر ئەواندا خەواریج هەبوو کە تەواو پێچەوانەی ئەمانە بوون و عەلیان کافر کرد و زۆرێکی تر لەهاوەڵانیان تەکفیر کرد و لەگەڵیان جەنگان و ماڵ و خوێنیانیان حەلاڵ کرد.

**هەرچی ئەهلی سوننە و جەماعەیە پێچەوانەی هەموانیان کرد**، خۆشەویستیان بۆ هاوەڵان دەربڕی، بەڵام زێدەڕۆییان تێدا نەکرد و، دانیان نا بەفەزڵ و پلەی هەموو هاوەڵاندا و پێیان وایە دوای پێغەمبەر ﷺ باشترینی ئەم ئومەتەن . دواتر ڕونکردنەوەی زیاتر لەم بارەیەوە دەخەینەڕوو .



## واجبی باوەڕهێنان بەوەی خودا لەسەر عەرشە و(بەرزی و عولوی خودا بەسەر درووستکراوەکانیەوە) و (لەگەڵ بوونی بۆ دروستکراوەکانی) و نەبوونی هیچ دژ یەکیەک لەنێوانیاندا

فَصْلٌ: وَقَدْ دَخَلَ فِيمَا ذَكَرْنَاهُ مِنَ الإِيمَانِ بِاللهِ الإِيمَانُ بِمَا أَخْبَرَ اللهُ بِهِ فِي كِتَابِهِ، وَتَوَاتَرَ عَن رَّسُولِه، وَأَجْمَعَ عَلَيْه سَلَفُ الأُمَّةِ؛ مِنْ أَنَّهُ سُبْحَانَهُ فَوْقَ سَمَاوَاتِهِ، عَلَى عَرْشِهِ، عَلِيٌّ عَلَى خَلْقِه، وَهُوَ سُبْحَانَهُ مَعَهُمْ أَيْنَمَا كَانُوا، يَعْلَمُ مَا هُمْ عَامِلُونَ؛ كَمَا جَمَعَ بَيْنَ ذَلِكَ فِي قَوْلِهِ: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۚ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۖ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤﴾﴾ [الحديد: ٤].

جۆرێکی تر لەباوەڕبوون بەخودا لەوەی کەئاماژەمان پێدا باوەڕبوونە بەوەی خودا هەواڵی لەبارەوە داوە لەقورئانەکەیدا و بەموتەواتری لەپێغەمبەرەکەیەوە هاتووە و زانایان کۆدەنگن لەسەری، کە ئەویش لەسەر عەرش بوونی خودایە و بەرزی و بڵندییەتی بەسەر درووستکراوەکانیەوە و، خودا لەگەڵیان لەهەر جێگایەك بن و ئاگاداری کار و جوڵەکانیانە، هەروەك هەمووی لەم فەرمایشتەیدا کۆیکردووەتەوە:

هەر ئەو خوایە ئاسمانەکان و زەویی لە ماوەی شەش ڕۆژدا درووستکرد ، پاشان بڵندبوویەوە بۆ سەر عەرش. بە بڵندبوونەوەیەک کە شایستەی زاتی خۆی بێت. (أيْ: استواءً يَلِيْقُ بجَلاَلِه مِنْ غَيْرِ تَشْبِيهٍ وَلاَ تمْثِيلٍ ولاَ تَعْطِيْلٍ ولاَ تَحْرِيْفٍ كَمَا هُوَ مَذْهَبُ السَّلَفْ..). واتە: بڵندبوونەوەیەک کە شایستەی پلەو مەقامی خودا بێت، بەبێ هیچ جۆرە لێکچواندنێک و هاوشێوەییەک بۆ خودا، یان ڕەتکردنەوەی سیفاتگەلێک بۆ خودا، یان گۆڕانکاریی لە ناوو سیفاتی خودادا بکرێ، ئەمەش مەزهەب و پەیڕەوی سەلەفی ساڵحە. دەزانێ چی دەچێت بەناو زەوییدا لە باران و

زیندەوەرو.. هتد ، چییشی لێدەر دەچێ، لە ڕووەک و گژو گیاو میوەو..هتد، چی لە ئاسمان دێتە خوارێ و، چییش پێیدا سەر دەکەوێ، وەک فریشتەو کاروکردەوەکان، وە لە هەر جێگایەکیشدا بن ئەو (خوا)یەتان لەگەڵە، وە خوا بە هەموو کارەکانتان بینایە، هەر شتێک ئێوە ئەنجامی بدەن ئەو دەیبینێ .

**وَلَيْسَ مَعْنَى قَوْلِهِ:﴿ وَهُوَ مَعَكُمْ ﴾ [الحديد: ٤]. أَنَّهُ مُخْتَلِطٌ بِالْخَلْقِ؛ فَإِنَّ هَذَا لاَ تُوجِبُهُ اللُّغَةُ، بَلِ الْقَمَرُ آيَةٌ مِنْ آيَاتِ اللهِ مِنْ أَصْغَرِ مَخلُوقَاتِهِ، وَهُوَ مَوْضُوعٌ فِي السَّمَاءِ، وَهُوَ مَعَ الْمُسَافِرِ وَغَيْرُ الْمُسَافِرِ أَيْنَمَا كَانَ، وَهُوَ سُبْحَانَهُ فَوْقَ عَرْشِهِ، رَقِيبٌ عَلَى خَلْقِهِ، مُهَيْمِنٌ عَلَيْهِمْ، مُطَّلِعٌ عَلَيْهِم إِلَى غَيْرِ ذَلِكَ مِن مَّعَانِي رُبُوبِيَّتِهِ.**

ومانای فەرمایشتی﴿وَهُوَ مَعَكُمْ﴾ واتە: ئەو لەگەڵتانە، تێکەڵ بوون نییە لەگەڵ درووستکراوەکان، ئەمە لەڕوی زمانەوانیشەوە مەرج نییە و، پێچەوانەی ئەوەیە کە سەلەف و پێشەوایانی ئەم ئوممەتە لەسەری بوون، هەروەها پێچەوانەی ئەو فیترەتەشە کە خودا خەڵکی لەسەر دروستکردووە، بۆنموونە مانگ نیشانەو بەڵگەیەکی بچووکە لەنیشانە و بەڵگەکانی خودا و، لەئاسمان جێگیر بووە و، لەگەڵ گەشتیار و غەیری گەشتیاریشە لەهەر جێگایەکدا بن و، خوای پەروەردگار لەسەر عەرشەکەیەتی و، چاودێرە بەسەر دروستکراوەکانیەوە و، زاڵ و بەدەسەڵاتە بەسەریانەوە و، ئاگاداری ورد و درشتیانە . . وجگە لەمانەش لەو مانایانەی تری پەروەردگاریەتی خودا.

---

## شەرح

نووسەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەم دووانەی بە تایبەت هێناوە و تیشکی خستووەتە سەر، کە ئەوانیش: (الاستواء على العرش ومعيته للخلق) واتە: بەرز و بڵند بوونەوەی خودا بەسەر عەرشدا هاوکات لەگەڵ بوونی خودا بۆ درووستکراوەکانی ؛ لەپێناو ئەوەی ئەو گومان و کێشەیە بڕەوێنێتەوە و نەیهێڵێت، کە ئەویش بوونی گومانە

لە دژ یەکی نێوان ئەو دووەدا، ڕەنگە کەسێك وا گومان بەرێت ئەو دوو سیفەتەی خودا هاوشێوەی سیفەتی دروستکراوەکانن و، خودا تێکەڵە لەگەڵیان، دەی کەوایە چۆن دەکرێت لەگەڵیانیش بێت و لەهەمان کاتدا لەسەر عەرشیش بێت؟! چۆن دەگونجێ نزیك بێت لێیانەوە بەبێ تێکەڵ بوون لەگەیان؟!

✍ وەڵامی ئەم گومانە هەروەك شێخ لەچەند ڕوویەکەوە ڕوونی کردووەتەوە [1]:

**یەکەم:** ئەو تێگەیشتنە بوونی نییە لەزمانی عەرەبی دا ئەو زمانەی کە قورئان پێی دابەزیوە، چونکە بەڕاستی وشەی لەگەڵ(مع) لەزمانی عەرەبی دا بۆ موساحەبە و هاوەڵی ڕەهایە و بەمانای تێکەڵ بوون و توانەوە لەیەکدیدا و بەریەك کەوتن نایەت. بۆنموونە تۆدەڵێیت: (**زوجتي معي**)خێزانم لەگەڵمە، لەکاتێکدا تۆ لەجێگەیەکی و ئەویش لەجێگایەکی ترە و، دەڵێیت: (**مازلنا نسير والقمر معنا**) واتە: ئێمە بەردەوام بووین لەڕێکردن بەشەو و مانگیشمان لەگەڵ بوو، لەکاتێکدا مانگ لەئاسمانە و لەگەڵ گەشتیاری وجگە لەویشدایە لەهەر کوێیەک بن، جا ئەگەر دروست بێت ئەم قسەیە لەبارەی مانگەوە لەکاتێدا دروستکراوێکی بچووکە، دەی چۆن ئەوە ناوترێت لەئاست بەدیهێنەر و درووستکارێکی مەزن کە لەهەموو شتێك مەزن ترە؟!.

**دووەم:** ئەم قسەیە پێچەوانەی کۆدەنگی سەلەف و پێشەوایانی ئەم ئوممەتەیە لەهاوەڵان و تابیعین وتابیعی تابیعین (کە پێك دێن لەسەدە زێڕینەکان) ئەوانەی کە قودوەو پێشەوان، ئا ئەمانە کۆدەنگن لەسەر ئەوەی خودا بەرز وبڵند بووەتەوە بەسەر عەرشدا، بەرزە بەنیسبەت دروستکراوەکانی و تێکەڵاویان نەبووە و جودایە لێیان، هەروەها کۆدەنگن لەسەر ئەوەی لەگەڵ دروستکراوەکانیەتی بەعیلم و زانستی خۆی هەروەك تەفسیری ئەم ئایەتەیان : ﴿ وَهُوَ مَعَكُمْ ﴾ بەوە کردووە .

---

(١) بڕوانە : مختصر الصواعق المرسلة (٤٥٥)، وفتح رب البرية بتلخيص الحموية للشيخ ابن عثيمين (٥٩).

**سێیەم** : ئەمە پێچەوانەی ئەو فیترەتەیە کە خودا خەڵکی لەسەر بەدیهێناوە، واتە: لەناخیاندا چەسپاندوویەتی، خەڵک فیترەتیان وا ڕاهاتووە، کە دان دەنێن بەعولو و بەرزی خوادا بەسەر دروستکراوەکانیەوە، دەبینیت خەڵك لەکاتی ناخۆشی و نارەحەتیدا دەست بەرەو ئاسمان بەرز دەکەنەوە و بەملاو ئەولادا ناچن بێ ئەوەی کەسێك ڕێنیشاندەریان بێت بۆ ئەوە، بەڵکو ئەوە تەنها سروشتێکە و خودا خەڵکی لەسەر بەدیهێناوە و هەستی تێدا دروست کردوون .

**چوارەم** : ئەوە پێچەوانەی ئەوەیە، کە خودا هەواڵی لەبارەوە داوە لەقورئانەکەیدا و بەموتەواتری لەپێغەمبەرەکەیەوە هاتووە بەوەی خودا لەسەر عەرشەکەیەتی و لەسەروی دروستکراوەکانیەوەیەتی و، لەگەڵیانە لەهەر جێیەك بن .

جا دەقی موتەواتیر[(١)]: ئەوەیە کە کۆمەڵە کەسێك گێڕاویانەتەوە عادەتەن ناکرێ و ناگونجێ کۆدەنگ بن لەسەر درۆ و، لەهاوشێوەی خۆیانەوە گێڕاویانەتەوە لەسەرەتاوە تا کۆتاییەکەی.

ئایەت و فەرموودە لەم بارەیەوە زۆر زۆرە لەوانە ئەو ئایەتەی کە نووسەر هێناویەتی . والله أعلم .

ووتەکەی نووسەر ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کەدەڵێت: (وهو سبحانه فوق عرشه رقيب على خلقه مهيمن عليهم مطلع عليهم) جەختکردنەوەیە لە قسەکانی پێشوو کە باسی عولوی خودای تێدا کرابوو وە هەروەها لەگەڵ بوونی خودا بۆ دروستکراوەکانی، ئەوەش بەهێنانی دوو ناو لەناوەکانی کە ئەوانیش:(الرقيب والمهيمن)، خوای تەعالا فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴾ [النساء : ١] ، واتە: بێگومان خوا بەوردیی و هەمیشەیی ئاگادارو چاودێرە بەسەرتانەوە، دەزانێ ئەرکی سەرشانتان ئەنجام دەدەن، یان نا.

(١) تدريب الراوي (٦٢٧)، والتنبيهات السنية (١٩٥).

و(**الرقيب**) [(١)]: واتە: چاودێر بەسەر حاڵ و باری بەندەکانیەوە. ئەوەش بەڵگەیە لەسەر نزیکی خودا لێیانەوە، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ ﴾ [الحشر: ٢٣] ، واتە:خوا (الله) هەر ئەو زاتەیە -کە بێجگە لەو- هیچ پەرستراوێکی تر بە هەق نیە [ **الْمَلِكُ** ] پاشاو فەرمانڕەوای هەموو بوونەوەرە، خاوەنی تەواوی ئیش و کارە، چی دەکات باڵا دەستی نیە [ **الْقُدُّوسُ** ] پاک و بێگەردەو بێخەوشە لە هەر سیفەتێکی ناشیرین [ **السَّلَامُ الْمُؤْمِنُ** ] ئاشتیدەرو دڵنیاکەرە، پەیامبەران و ئیماندارانی ئەمین کردووە لە سزای خۆی [ **الْمُهَيْمِنُ** ] چاودێرو پارێزەری دروستکراوەکانیەتیی و هیچ شتێکی لیٚ وون نابێت .

و(**المهيمن**) [(٢)]: ئەوەیە کە شاهیدە بەسەر دروستکراوەکانیەوە و ئاگاداری کردەوەکانیانە و چاودێرە بەسەریانەوە .

(إلى غير ذلك من معاني ربوبيته) واتە : جگە لەم مانایانەش کە خوازەری پەروەردگاریەتی خودان کە وا دەخوازن بەزاتی خۆی لەسەروی دروستکراوەکانیەوە بێت و، ئاگاداری کردەوەکانیان بێت و، نزیك بێت لێیانەوە بەعیلم و زانستی خۆی، کار و بارەکانیان ڕاپەڕێنێت و، پاداشتیان بداتەوە لەسەری .

⊱ ❧❧❧ ⊰

---

(١) النهج الأسمى (١/ ٣٧٧).

(٢) النهج الأسمى (١/ ١١٩).

## ئەوەی پێویستە باوەڕمان پێی بێت لەبارەی عولوی خودا و لەگەڵ بوونی و مانای لەئاسمان بوونی خودا و بەڵگەکانی

وكُلُّ هَذَا الْكَلام الَّذِي ذَكَرَهُ اللهُ ـ مِنْ أَنَّهُ فَوْقَ الْعَرْشِ وَأَنَّهُ مَعَنَا ـ حَقٌّ عَلَى حَقِيقَتِهِ، لاَ يَحْتَاجُ إِلَى تَحْرِيفٍ، وَلَكِنْ يُصَانُ عَنِ الظُّنُونِ الْكَاذِبَةِ؛ مِثْلِ أَنْ يُظَنَّ أَنَّ ظَاهِرَ قَوْلِهِ: ﴿ فِي ٱلسَّمَآءِ ﴿١٧﴾ ﴾ [الملك:١٧]. أَنَّ السَّمَاءَ تُظِلُّهُ أَوْ تُقِلُّهُ، وَهَذَا بَاطِلٌ بِإِجْمَاعِ أَهْلِ الْعِلْمِ وَالإِيمَانِ؛ فَإِنَّ اللهَ قَدْ ﴿ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ﴿٢٥٥﴾ ﴾ [البقرة: ٢٥٥] ، وَهُوَ ﴿ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَاۚ ﴿٤١﴾ ﴾ [فاطر:٤١] ، و ﴿ وَيُمْسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِۦٓۗ ﴿٦٥﴾ ﴾ [الحج:٦٥] ، ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ بِأَمْرِهِۦۚ ﴿٢٥﴾ ﴾ [الروم:٢٥]. هەموو ئەو وتانەی کە خودا باسی کردووە ـ لەوەی خودا لەسەر عەرشە و لەگەڵمانە ـ هەقە و لەسەر هەقیقەتەکەیەتی و، پێویست بەتەحریف و گۆڕین ناکات، بەڵام لەگومانی درۆینە دەپارێزرێت، وەك ئەوەی کەسێك وا گومان بەرێت فەرمایشتی (فِي السَّمَاءِ) بەمانای ئەوە دێت گوایە ئاسمان خودای هەڵگرتووە یاخود دەوری داوە و سێبەری بۆ کردووە، ئەمە تێگەیشتنێکی باتڵ و ناڕەوایە بەکۆدەنگی زانایان و ئەهلی ئیمان، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (کورسیەکەی ئاسمانەکان و زەوی گردووەتەوە) وهەر ئەوەیە کە (ئاسمانەکان وزەوی ڕاگردووە و ناهێڵێت داڕوخێن و لەناوچن)، و(ئاسمانی گردوود و ناهێڵێت بکەوێت سەر زەوی مەگەر بەویستی خۆی نەبێت)، و (یەکێک لەنیشانە و بەڵگەکانی خودا ئەوەیە ئاسمان و زەوی بەفرمانی خودا ڕاوەستان و جێگیرن).



شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) واجبی باوەڕهێنانی ڕووندەکاتەوە بەنیسبەت ئەوەی خودا هەواڵی لەبارەی خۆیەوە داوە لەوەی کە لەسەر عەرشە و، لەگەڵمانە: پێویستە ئیمانی پێ بهێندرێت بەو شێوەیەی کە خودا هەواڵی لەبارەوەداوە و، درووست نییە تەئویل بکرێت و لابدرێت لەمانا دیار و هەقیقەتەکەی، وەك ئەوەی موعەتیلەکان لەجەهمی و موعتەزیلەکان و هاوشێوەکانیان دەیڵێن، ئەوانە پێیان وایە لەسەر عەرش بوونی خودا هەقیقەتەکەی مەبەست نییە بەڵکو مەجازە و مەبەست لێی شتێکی ترە و، تەئویلی (**الاستواء على العرش**) واتە: وەستان و بەرز بوونەوەی خودا بەسەر عەرشدا، دەکەن بە(**الاستيلاء على الملك**)واتە: دەستگرتن بەسەر موڵك و ساماندا، وە (**علو الله على خلقه**)واتە: بەرزی و بڵندی خودا بەسەر درووستکراوەکانیەوە، تەئویل دەکەن بە(**علو قدره وقهره**) بەرزی پلە و توانا و دەسەڵاتی و، هاوشێوەی ئەم تەئویلە باتڵ و ناڕەوانە کە تەحریف و گۆڕینی کەلامی خودایە و لادانیەتی لەمانا هەقەکەی کە دەیخوازێت . هەندێکیان دەڵێن: مانای لەگەڵ بوونی خودا بۆ ئێمە: بوونی خودایە لەهەموو جێگایەك هاوشێوەی قسەی حولولیە جەهمیەکان و جگە لەوانیش . تعالى الله عما يقولون علواً كبيراً.

ووتەکەی: (ولكن يصان عن الظنون الكاذبة مثل : أن يظن أن ظاهر قوله : في السماء أن السماء تقله أو تظله) و(**تقله**) : واتە: هەڵی دەگرێت. و(**تظله**) : واتە: سەتری دەکات و دایدەپۆشێت.

و(**الظلة**) : ئەو شتەیە کە لەسەرەوەت سێبەرت بۆ دەکات، وکاتێ دەوترێت خودا لەئاسمانە ئەو دوو مانایە مەبەست نییە. بۆیە هەرکەسێك ئەو گومانە بەرێت ئەوا توشی هەڵەیەکی ئێجگار گەورە بووە لەبەر دوو هۆکار:

**یەکەم :** ئەوە پێچەوانەی ئەو تێگەیشتنەیە کە کۆدەنگی زانایان و باوەڕدارانی لەسەرە، ئەوان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی خودا لەسەر عەرشە وجودایە لەدروستکراوەکانی و لەزاتی خودادا هیچ شتێك نییە لەدروستکراوەکانی دا وبەپێچەوانەشەوە، پێشتر تەفسیری ئەم فەرمایشتەمان کرد : ﴿ أَمْ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾ ، وگوتمان گەر مەبەست لە ئاسمان(**السماء**) ئەو ئاسمانە بێت کە هەیە ئەوا (**في**) بەمانای : (**على**) دێت ، واتە : (**على السماء**)لەسەر ئاسمانە، هاوشێوەی فەرمایشتی : ﴿وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِي جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ﴾، واتە: (**على جذوع النخل**) واتە: لەسەروی دارخورماکانەوە لەخاچتان دەدەین، وە ئەگەر مەبەست لە(**السماء**)ئاسمان: (**العلو**)بەرزی بێت، ئەوا مانای : (**في السماء**)لەئاسمان، واتە : (**في العلو**)لەبەرزیەتییە . والله أعلم .

**دووەم :** ئەم گومان و تێگەیشتنە پێچەوانە و دژە لەگەڵ بەڵگەکانی قورئان ئەو بەڵگانەی کە دەلالەت دەکەنە سەر گەورەیی خودا و بێ پێویستی لەدرووستکراوەکانی و پێویستی درووستکراوەکانی پێی، هەروەك لەم فەرمایشتەدا هاتووە: ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ واتە: کورسیەکەی ئاسمانەکان و زەوی داگرتووە و، کورسی دروستکراوێکی گەورەیە ولەبەر دەمی عەرشدایە و، گەورەترە لەئاسمانەکان و زەوی و، عەرش گەورەترە لێی، جا ئەگەر ئاسمانەکان و زەوی بچوکتر بن لەکورسی و، کورسیش بچوکتر بێت لەعەرش و، خودا گەورەتر بێت لەهەموو شتێك، ئەوا چۆن دەکرێت ئاسمان دەوری خودا بدات و بیگرێتە خۆ یاخود کورسی هەڵی بگرێت یاخود سێبەری بۆ بکات و داپۆشێت؟!

هەروەها فەرمایشتی : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا﴾،واتە: بەڕاستیی خوا ئاسمانەکان و زەویی ڕاگرتووە تا دانەڕوخێنن ولەناو نەچن، ﴿وَيُمْسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِۦٓ﴾ ،واتە:ئەم ئاسمانەش ڕادەگرێ تا بەسەر

زەویدا نەکەویٚ، مەگەر بەفەرمانی خۆی، ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ بِأَمْرِهِۦ﴾ ، واتە:هەر لەنیشانەکانی بوون و دەسەڵاتی ئەوە کە ئەم ئاسمانٚ و زەوییە بەفەرمانی ئەو وەستاون . ئائەم ئایەتانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی پێویستیان بەخودایە، وئەوە خودایە ڕایگرتووە وناهێڵیٚ بکەوێت و لە ناوبچێت، کەواتە ڕاوەستانی تەنها بەفرمانی خودایە، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا بەئەقڵەوە ناچێت خودا پێویستی بەئاسمان بێت؛ بۆ ئەوەی هەڵیبگرێت یاخود سێبەری بۆ بکات . تعالى الله عن هذا الظن الباطل علواً كبيراً.



## واجبی باوەڕهێنان بەنزیکی خودا و ئەو نزیکییە پێچەوانەی عولوی خودا نییە

قال رحمه الله:

وَقَد دَخَلَ فِي ذَلِكَ الإِيمَانُ بِأَنَّهُ قَرِيبٌ مُجِيبٌ؛ كَمَا جَمَعَ بينَ ذَلِكَ فِي قَوْلِهِ: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ﴿١٨٦﴾ ﴾[البقرة: ١٨٦]. الآيَة، وَقَوْلِه ﷺ: «إِنَّ الَّذِي تَدْعُونَهُ أَقْرَبُ إِلَى أَحَدِكُم من عُنق رَاحِلَتِه»[١] . وَمَا ذُكِرَ فِي الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ مِنْ قُرْبِهِ وَمَعِيَّتِه لاَ يُنَافِي مَا ذُكِرَ مِنْ عُلُوِّهِ وَفَوْقِيَّتِه؛ فَإِنَّهُ سُبْحَانَهُ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ فِي جَمِيعِ نُعُوتِهِ، وَهُوَ عَلِيٌّ فِي دُنُوِّه، قَرِيبٌ فِي عُلُوِّه.

شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت:

بەشێکی تر لەباوەڕهێنان بەخودا باوەڕهێنانە بەوەی خودا نزیکە و وڵامی دوعا وپاڕانەوەکان دەداتەوە، هەروەکو ئەو دووەی پێکەوە لەم فەرمایشتەیدا هێناوە: (ئەی موحەممەد ﷺ هەرکات بەندەکانم پرسیاریان لێکردی لەبارەی منەوە ئەوا من نزیکم لێیانەوە و وەڵامی دوعای دوعاکار دەدەمەوە گەر دوعای کرد)، وفەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ «ئەو کەسەی ئێوە داوای لێدەکەن نزیکترە لێتانەوە لەملی وشترەکەی لەیەکێك لەئێوەوە»، ئەوەی باسکراوە لەقورئان و سوننەدا لەبارەی نزیکی و لەگەڵ بوونی خودا لەگەڵ عولو و لەبەرزی بوونی پێچەوانە و دژ بەیەك نین؛ چونکە بەڕاستی هیچ شتێك هاوشێوەی خودا نییە لەهیچ جۆرە سیفەتێکی دا تاوەکو ئەو گومانە ببرێت و ئەو قیاسە بکرێت، خوای پەروەردگار بەرزە وبڵندە لە نزیکدا و نزیکە لەعولویدا.

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢٩٩٢)، ومسلم (٢٧٠٤).

# شەرح

دوای ئەوەی نووسەر پێداگری کرد لەسەر واجب بوونی باوەڕ بەعولوی خودا بەسەر درووستکراوەکانیەوە و ئیستواکردنی لەسەر عەرشەکەی لەم بەشەدا ئاماژەی داوە بەوەی واجبە باوەڕ بهێندرێت بەوەی خودا نزیکە، وە وتەکەی کە دەڵێت : (وقد دخل في ذلك) واتە : جۆرێك یاخود بەشێك لەباوەڕبوون بەخوا بریتیە لە(الإيمان بأنه قريب) واتە : باوەڕبوون بەوەی خودا نزیکە لەدروستکراوەکانیەوە و(مجيب) وڵامی دوعا و پاڕانەوەکانیان دەداتەوە (كما جمع بين ذلك) واتە : هەروەك ئەو دووانەی (نزیکی و وەڵامدانەوەی) لەم فەرمایشتەدا پێکەوە هێناوە : ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي ﴾ ،واتە: هەرکات بەندەکانم پرسیاریان لێکردی لەبارەی منەوە.

لەبارەی هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتەوە ڕیوایەت کراوە: «**أن رجلاً جاء إلى النبي ﷺ فقال : يا رسول الله ، أقريب ربنا فنناجيه ، أم بعيد فنناديه ؟! فسكت النبي ﷺ فنزلت هذه الآية**» [1] ، واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایە پەروەردگارمان نزیکە بەدەنگی نزم داوای لێ بکەین، یاخود دوورە ودەبێ بانگی لێ بکەین؟! پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ بوو و دواتر ئەم ئایەتە دابەزی.

﴿ فَإِنِّي قَرِيبٌ ﴾ ،واتە: من نزیکم لەدوعاکەرەوە و ﴿ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ﴾ وڵامی دوعای دوعاکەر دەدەمەوە گەر بپاڕێتەوە، ئا ئەمە جۆرێکە لەئاماژەدان بەوەی لەکاتی دوعادا دەنگ نزم بکەنەوە و بەدەنگی بەرز مەپاڕێنەوە، هەروەك لەفەرمایشتەکەی پێغەمبەردا ﷺ بەڕوونی ئەمە هاتووە : «إن الذي تدعونه أقرب إلى أحدكم من عنق راحلته» پێشتر شەرحی ئەم فەرموودەیە کراوە.

---

(١) رواه ابن جرير وابن أبي حاتم وغيرهما .

جا ئەم ئایەت و فەرموودەیە بەڵگەن لەسەر نزیکی خودا لەکەسی دوعاکەرەوە ئەوەش بەوڵامدانەوەی دوعاکەی، ئەم نزیکیەش پێچەوانە و دژ نییە لەگەڵ عولوی خودادا؛ هەربۆیەشە نووسەر گوتی: (وما ذكر في الكتاب والسنة من قربه ومعيته لا ينافي ما ذكر من علوه وفوقيته) ؛ چونکە هەموو ئەمانە هەق و ڕاستن، وهەقیش هیچ دژ یەکی تێدا درووست نابێت و پێچەوانەی یەک نییە، هەروەها لەبەرئەوەی خودا فەرموویەتی : (ليس كمثله شيء في جميع نعوته) واتە : خودا لەهەموو سیفاتەکانی دا هاوشێوە و هاوێنەی نییە، بۆیە ناوترێت: گەر خودا لەسەروی درووستکراوەکانیەوەیەتی چۆن دەکرێت لەهەمان کاتدا لەگەڵیان بێت؟؛ چونکە خودی ئەم پرسیارە هەڵەیە و سەرچاوەکەی قیاس کردنی خودایە بەدروستکراوەکانی و ئەو جۆرە لەقیاسەش باتڵ و ناهەقە ؛ چونکە خودا (ليس كمثله شيء) واتە: هیچ شتێك هاوشێوەی خودا نییە.

جا نزیکی و عولو هەردوکیان لەیەك کاتدا لەخودادا کۆبوونەتەوە؛ ئەوەش لەبەر عەزەمەت و گەورەیی پەیبردنی بەهەموو شتەکان و، حەوت چینی(تەبەقە)ی ئاسمان لەدەستی خودادایە هاوشێوەی دەنکە خەرتەلەیەك لەدەستی یەکێك لەئێوەدا، دەی کەسێك ئاوها گەورە و مەزن بێت چۆن ناکرێت لەسەر عەرش بێت و لەهەمان کاتدا نزیکیش بێت لەدروستکراوەکانیەوە هەرچۆنێك بیەوێت؟! (وهو علي في دنوه قريب في علوه) واتە: وە خودا بەرز و بڵندە لەنزیکی دا و نزیکە لەعولوی دا، هەروەك لەدەقەکانی قورئان و سوننەدا هاتووە و زانایانی ئەم ئوممەتە کۆدەنگن لەسەری و ئەمەش یەکێکە لەتایبەتمەندیەکانی خودا، جا (علي في دنوه) واتە : لەکاتی نزیکی دا لەدروستکراوەکانیەوە بەرز و بڵندە (قريب في علوه) واتە : لەحاڵی عولویدا لەسەر عەرش نزیکە لەدرووستکراوەکانیەوە .

## واجبی باوەڕهێنان بەوەی قورئان کەلامی هەقیقی خودایە

قال رحمه الله:

وَمِنَ الإِيمَانِ بِاللهِ وَكُتُبِهِ الإِيمانُ بِأَنَّ الْقُرْآنَ كَلامُ اللهِ، مُنَزَّلٌ، غَيْرُ مَخْلُوقٍ، مِنْهُ بَدَأَ، وَإِلَيْهِ يَعُودُ، وَأَنَّ اللهَ تَكَلَّمَ بِهِ حَقِيقَةً، وَأَنَّ هَذَا الْقُرْآنَ الَّذِي أَنْزَلَهُ عَلَى مُحَمَّدٍ ـ ﷺ ـ هُوَ كَلامُ اللهِ حَقِيقَةً، لاَ كَلامَ غَيْرِهِ. وَلا يَجُوزُ إِطْلاقُ الْقَوْلِ بِأَنَّهُ حِكَايَةٌ عَنْ كَلاَمِ اللهِ، أَوْ عِبَارَةٌ؛ بَلْ إِذَا قَرَأَهُ النَّاسُ أَوْ كَتَبُوهُ فِي الْمَصَاحِفِ؛ لَمْ يَخْرُجْ بِذَلِكَ عَنْ أَنْ يَكُونَ كَلامَ اللهِ تَعَالَى حَقِيقَةً، فَإِنَّ الْكَلاَمَ إِنَّمَا يُضَافُ حَقِيقَةً إِلَى مَنْ قَالَهُ مُبْتَدِئًا، لاَ إِلَى مَنْ قَالَهُ مُبَلِّغًا مُؤَدِّيًا. وَهُوَ كَلامُ اللهِ؛ حُرُوفُهُ، ومَعَانِيهِ؛ لَيْسَ كَلامُ اللهِ الْحُرُوفَ دُونَ الْمَعَانِي، وَلاَ الْمَعَانِيَ دُونَ الْحُرُوفِ.

شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت :

بەشێك لەئیمان هێنان بەخودا و کتێبەکانی: ئیمان هێنانە بەوەی قورئان کەلامی خودایە و دابەزێندراوە، دروستکراو (مەخلوق) نییە و، لەوەوە هاتووە بۆلای ئەویش دەگەڕێتەوە و، خودا بەهەقیقی قسەی پێکردووە، ئەو قورئانەی کە دابەزاندە سەر موحەمەد کەلامی خودایە بەهەقیقی، کەلامی کەسانی تر نییە.

بۆیە درووست نییە بوترێت: قورئان گێڕانەوەی کەلامی خودایە، یاخود گوزارشتە لەکەلامی خودا و، کاتێکیش خەڵك دەیخوێنن یاخود دەینوسن لەموسحەفەکاندا؛ ئەوە مانای ئەوە ناگەیەنێت کەلامی خودا نەبێت بەهەقیقی، کەلام بەهەقیقی دەدرێتە پاڵ ئەوەی یەکەم جار دەریبڕیوە، نەک ئەوەی دەیگەیەنێت. وە قورئان کەلامی خودایە بەپیت و ماناکەشیەوە، نەك پیتەکانی هی خودا بێت و ماناکەی هی کەسانی تر و، نەك ماناکەی لەخوداوە بێت جگە لەپیتەکانی.

## شەرح

یەکێک لەبنەماکانی ئیمان: ئیمان هێنانە بەخودا و ئیمان هێنانە بەکتێبەکانی ـ هەروەک پێشتر ئاماژەمان پێدا ـ وە بەشێك لەم دوو بنەما گەورەیە ئیمان بوونە بەوەی قورئان کەلامی خودایە.

جا ئیمان هێنان بەخودا: ئیمان بوون بەسیفاتەکانی لەخۆ دەگرێت. کەلامی خوداش بەشێکە لەسیفەتەکانی، خوای پەروەردگار وەسفکراوە بەوەی قسە دەکات بەوەی ویستی لەسەرە، گەر ویستی هەبێت، بەردەوام لەڕابردوو و داهاتووشدا قسە دەکات و کەلامەکەی کۆتایی نایەت و جۆری کەلام بەنسبەت خوداوە ئەزەلی و هەتا هەتاییە و، موفردات و تاک تاکی کەلامەکەی بەردەوام بەش بەشی دێتە بوون بەپێی حیکمەت ودانایییەکەی .

هەروەها جۆرێکی تر لەکەلامی خودا قورئانی پیرۆزە، ئەو قورئانەی کە گەورەترین کتێبی خودایە ـ ئیمان هێنان پێی لەپێشی پێشەوەی ئیمان هێنانە بەکتێبەکانی خودا ـ وە قورئان لەلایەن خوداوە دابەزێندراوە و خودا قسەی پێکردووە و دایبەزاندووەتە سەر پێغەمبەرەکەی، قورئان (منزل غیر مخلوق) واتە: دابەزێندراوە لەلایەن خوداوە و مەخلوق و دروستکراو نییە؛ لەبەرئەوەی سیفەتێکە لەسیفەتەکانی و، داویەتیە پاڵ خۆی، هاوشێوەی دانەپاڵی سیفەت بۆلای وەسفکراو، وە سیفاتەکانی خودا درووستکراو(مەخلوق) نین، چەند گروپ و تاقمێك لەم بابەتەدا پێچەوانەی ئەهلی سوننەن و شێخ لێرەدا بۆچوونی هەندێکیان هێناوە بەم شێوەیەیی لای خوارەوە :

١- **بۆچوونی جەهمیەکان ئەوانەی دەڵێن**[1]: خودا قسە ناکات، بەڵکو کەلامی لەغەیری خۆیدا درووست(خەلق) کردووە و وای لەو کەسە کردووە گوزارشت

---

(١) بڕوانە : معارج القبول (١/ ٤٨٣).

لەکەلامەکەی بکات و بیگەیەنێت، بۆیە دانەپاڵ و ئیزافەی کەلام لەلای ئەوان بۆلای خودا مەجازە نەك هەقیقی؛ چونکە خودا کەلامی درووست(خەلق) کردووە و ئەو ـ خودا ـ قسەکەرە، بەو مانایەیی درووستکاری(خالیقی) کەلامە لەغەیری خۆیدا، ئەم بۆچوونەش باتڵە و ناتەواوە لەبەرئەوەی پێچەوانەی بەڵگە نەقڵی و ئەقڵیەکانە، هەروەها پێچەوانەی بۆچوون و قسەی زانایان و پێشەوایانی ئیسلامە، چونکە بەڕاستی بەئەقڵەوە ناچێت کەسێك پێی بوترێت قسەکەر مەگەر ئەو کەسە بەهەقیقی قسەی کردبێت چۆن دەوترێت: **(قال الله)** خودا گوتی ، لەکاتێکدا قسەکەر کەسێکی تر بێت؟! و، چۆن دەوترێت: **(کلام الله)** کەلامی خودا، لەکاتێکدا کەلامەکە هی کەسێکی تر بێت ؟!

ووتەی نووسەر : (منه بدأ وإليه يعود ، وأن الله تكلم به حقيقة، وأن هذا القرآن الذي أنزله على محمد ﷺ هو كلام الله حقيقة لا كلام غيره) قورئان سەرەتاکەی لەخوداوەیە و هەر بۆ ئەویش دەگەڕێتەوە، خودا هەقیقەتەن قسەی پێکردووە، ئەم قورئانەی کە خودا دایبەزاندووەتە سەر پێغەمبەر موحەمەد ﷺ کەلامی خودایە بەهەقیقی وکەلامی کەسانی تر نییە. مەبەستی بەم وتانە ڕەتدانەوەی جەهمییەکانە، ئەوانەی کە دەڵێن: قورئان سەرەتاکەی لەجگە لەخوداوەیە و، خودا بەهەقیقی قسەی پێنەکردووە، بەڵکو مەجازە و کەلامی کەسانی ترە دراوەتە پاڵی؛ چونکە خودا درووستکار(خالق) و بەدیهێنەری قورئانە.

هەروەها مانای وتەکەی : (منه بدأ) واتە: قورئانە لەخوداوە سەرچاوەی گرتووە و لەخوداوە دەرچووە و قسەی پێکردووە (ومن) بۆ سەرەتای مەبەستە، ووتەکەی: (وإليه يعود) واتە : قورئان دەگەڕێتەوە لای خودا؛ چونکە لەکۆتایی ژیاندا قورئان هەڵدەگیردرێت و نامێنێت و هیچ بەشێکی نەلە سنگ و نەلە موصحەفەکاندا نامێنێت، ئەوەش یەکێکە لەنیشانەکانی دواڕۆژ، یاخود ماناکەی ئەوەیە: نیسبەتی قورئان دەدرێتە پاڵ خودا و لەوەوە هاتووە.

٢- پاشان شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بۆچوونی کولابیەکان ـ شوێنکەوتوانی عەبدوڵڵای کوڕی سەعیدی کوڕی کولاب - لەبارەی قورئانەوە باسکردووە کە دەڵێن: قورئان بریتیە لە گێڕانەوەی(حیکایەت) کەلامی خودا ؛ چونکە خودا لەلای ئەوان: مانایەکی ڕاوەستاوە لەخودی خۆیدا ولازمی زاتی خۆیەتی هاوشێوەی لازمی ژیان و عیلم ، وە پەیوەست نییە بەویست و ئیرادەیەوە، ئەو مانا ڕاوەستاوە لەخودی خۆیدا مەخلوق نییە و، ئەو لەفزانەی کە پێکهاتووە لەپیت و دەنگ دروستکراون(مەخلوقن) و، ئەوە گێڕانەوەی(حیکایەت)کەلامی خودایە نەك خودی کەلامی خودا .

٣- پاشان بۆچوونی ئەشعەریەکانی - ئەوانەی شوێنکەوتەی ئەبو حەسەنی ئەشعەرین ـ هێناوە لەبارەی قورئانەوە و ئەوان پێیان وایە قورئان عیبارەت و گوزارشتە لەکەلامی خودا ؛ چونکە کەلامی خودا لای ئەوان مانایەکی ڕاوەستاوە بەخودی خۆی و، ئەو مانایە دروستکراو(مەخلوق) نییە، بەڵام ئەم لەفزانەی کە دەخوێندرێت گوزارشتە(عیبارەتە) لەو مانایەیی کە ڕاوەستاوە بەخودی خۆی و ئەوەش دروستکراو(مەخلوق) و، ناوترێت ئەو لەفزانە حیکایەت و گێڕانەوەی کەلامی خودایە .

**هەندێ لەزانایان دەڵێن:** جیاوازی نێوان کولابی و ئەشعەریەکان جیاوازیەکی لەفزیە نەك هەقیقی، ئەشعەری و کولابیەکان دەڵێن: قورئان دوو جۆرە: لەفز، ومانا، ئەلفازەکان دروستکراون (مەخلوقن)، وماناکان کۆنن و ڕاوەستاون بەخودی خۆیان و ئەمە یەک مانایە وپارچە و پارچە و بەش بەش نابێت، بەهەر حاڵ هەردوو بۆچوونەکە گەر یەکیش نەبن زۆر نزیکن لەیەکەوە .

شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئاماژەی بە نادرووستی ئەم دوو بۆچوونە داوە و دەڵێت : (ولا يجوز إطلاق القول بأنه حكاية عن كلام الله) واتە : درووست نییە بوترێت قورئان گێڕانەوەی (حیکایەتی) کەلامی خودایە) واتە : وەك ئەوەی کولابییەکان دەیڵێن (أو عبارة عنه) یاخود گوزارشتە لەکەلامی خودا، وەك ئەوەی

ئەشعەریەکان دەیڵێن، (بل إذا قرأه الناس أو كتبوه في المصاحف لم يخرج بذلك من أن يكون كلام الله حقيقة) واتە : قورئانی پیرۆز کەلامی خودایە بەلەفز و ماناوە لەهەرجێگەیەکدا بێت، جا لەسنگدا لەبەرکرابێت، یاخود بەزمان بخوێندرێتەوە، یاخود لەموسحەفەکاندا نوسرابێت ـ هیچ یەکێکە لەمانە وای لێناکات کەلامی خودا نەبێت بەهەقیقی .

پاشان شێخ بەڵگەی ئەمەی هێناوە و دەڵێت : ( فإن الكلام إنما يضاف حقيقة إلى من قاله مبتدئاً، لا إلى من قاله مبلغاً مؤدياً) ،واتە: کەلام دەدرێتە پاڵ ئەوەی کە یەکەم جار گوتوویەتی، نەك ئەوەی کە دەیگەیەنێت و ئەدای دەکات، کەسی گەیەنەر(موبەلیغ )تەنها پێی دەوترێت: واستە، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [التوبة : ٦] ، واتە: گەر یەکێک لەو موشریکانە پەنای بۆ هێنایت، پەنای بدە، داڵدەی بدە ، هەتا بەباشی فەرمایشتی خوا دەبیسێ و لێی حاڵی دەبێ، واتە: قورئانی بۆ دەخوێنیت و لێی تێدەگات. جا سەماع و گوێبیست بوونەکە کە باسکراوە لەم ئایەتەدا بەیارمەتی کەسی گەیەنەر(موبەلیغە) و، ناوی بیستراوەکە(مەسموع) نراوە کەلامی خودا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قسە و کەلام دەدرێتە پاڵ ئەوەی یەکەم جار گوتوویەتی و دەری بڕیوە .

٤- پاشان شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بۆچوونی موعتەزیلەکانی هێناوە، کە دەڵێن: کەلامی خودا بریتییە لەحەرف و پیت بەبێ بوونی هیچ مانایەك ودەڵێن: ناولێنراو و ناوەڕۆکی قسە و کەلام کاتێ بەڕەهایی هات ئەوا تەنها ناوە بۆ لەفزەکە و، مانا بەشێك نییە لەناولێنراوەکەی، بەڵکو دەلالەت دەکات لەسەر ناولێنراو وناوەڕۆکەکەی .

پاشان شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) مەزهەبی بەرانبەر ودژی ئەم بۆچوونەی هێناوە، ودەڵێت: (ولا المعاني دون الحروف)واتە: قورئان مانا نییە بەبێ حەرف

وپیت، وەك ئەوەی کۆلابی و ئەشعەریەکان دەیڵێن، هەروەک پێشتر شەرحەکەی ئاماژەی پێدراوە .

**جا مەزهەب و بۆچوونی هەق لەم بابەتەدا ئەوەیە:** قورئان کەلامی خودایە بەپیت و ماناکەشیەوە، وەک ئەوەی ئەهلی سوننەو جەماعە دەیڵێن و هەر ئەوەشە بەڵگەی قورئان و سوننەی لەسەرە. والحمد لله رب العالمين .



## واجبی باوەڕبوون بەوەی لەڕۆژی دواییدا باوەڕداران پەروەردگاریان دەبینن و، ئەو جێگایانەی کە خودای تێدا دەبینن

قال رحمه الله:

وَقَد دَّخَلَ أَيْضًا فِيمَا ذَكَرْنَاهُ مِنَ الإِيمَانِ بِهِ وَبِكُتُبِهِ وَبِمَلاَئِكَتِهِ وَبِرُسُلِهِ: الإِيمَانُ بِأَنَّ الْمُؤْمِنِينَ يَرَوْنَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِيَانًا بِأَبْصَارِهِمْ كَمَا يَرَوْنَ الشَّمْسَ صَحْوًا لَيْسَ بِهَا سَحَابٌ، وكَمَا يَرَوْنَ الْقَمَرَ لَيْلَةَ الْبَدْرِ لاَ يُضَامُونَ فِي رُؤْيَتِهِ. يَرَوْنَهُ سُبْحَانَهُ وَهُمْ فِي عَرَصَاتِ الْقِيَامَةِ، ثُمَّ يَرَوْنَهُ بَعْدَ دُخُولِ الْجَنَّةِ؛ كَمَا يَشَاءُ اللهُ تَعَالَى.

شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت:

هەروەها بەشێکی تر لەوەی باسمانکرد لەبەشەکانی باوەڕ/ باوەڕ هێنان بەخودا و کتێبەکانی و فریشتەکانی و پێغەمبەرانی: باوەڕبوونە بەوەی باوەڕداران لەڕۆژی دوایی دا پەروەردگاریان دەبینن بەچاوی سەر: هەروەکو چۆن خۆر دەبینن کاتێ ئاسمان ساماڵەو هەوری تێدا نییە و، هەروەک چۆن مانگ دەبینن لەشەوی چواردەدا و توشی هیچ کێشە و پاڵەپەستۆیەک نابن لەبینینی دا. پەروەردگار دەبینن کاتێ کە لەگۆڕەپانی مەحشەردان، پاشان دوای چوونە بەهەشتیش دەیبینن، بەو شێوەیەی کە خودا ویستی لەسەرە.

---

### شەرح

هۆی باوەڕبوون بەبینینی خودا بەبەشێك لەباوەڕهێنان بەخودا و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی خوای پەروەردگار لەقورئانەکەیدا هەواڵی لەبارەوە داوە، هەروەها پێغەمبەرەکەشی هەواڵی لەبارەوە داوە، جا بۆیە هەرکەسێك باوەڕی پێی نەبێت، ئەوا

خودا و قورئانەکەی وپێغەمبەرەکەی بەدرۆخستووەتەوە، چونکە بەڕاستی ئەوەی باوەڕی بەخوا و کتێبەکەی و پێغەمبەرەکەی هەبێت باوەڕی بەهەموو ئەو شتانەشە کە خودا و پێغەمبەرەکەی هەواڵیان لەبارەوە داوە.

ووتەکەی: (عیاناً) بەکەسر عەینەکە واتە: بینینێکی، هەقیقی کە هیچ نادیاریەکی تێدا نییە و مەجازیش نییە، وەکو ئەوەی موعەتیلەکان بانگەشەی بۆ دەکەن (کما یرون الشمس صحواً لیس دونها سحاب ، وکما یرون القمر لیلة البدر لا یضامون في رؤیته)هەروەک چۆن خۆر دەبینن لەئاسمانێکی ساف و سامالْدا و هەور بەرچاویانی نەگرتبێت و، هەروەک چۆن مانگ دەبینن لەشەوی چواردەدا و توشی هیچ کێشەو پاڵەپەستۆیەک نابن لەبینینیدا، واتە: بینینێکی هەقیقی و هیچ نارەحەتیەکی تێدا نییە، هەروەك لەو ئایەت و فەرموودانەی پێشوودا هاتبوو کەپێشتر شەرح کرا .

ووتەکەی : (یرونه سبحانه وهم في عرصات القیامة، ثم یرونه بعد دخول الجنة)واتە: خودا دەبینن کاتێ کە لەساحەی مەحشەردان لەڕۆژی دوایی دا، پاشان دوای چوونە بەهەشتیش خودا دەبینن، ئەم وتەیەی ئاماژەدانە بەوجێگایانەی کەبینین تێیدا ڕوو دەدات، ئەوەش لەدوو جێگادایە:

**جێگای یەکەم:** لەساحەی مەحشەری ڕۆژی دوایی دا[1] ، و(**العرصات**) : جەمعی (**عرصة**)، کە ئەویش جێگایەکی فراوانە و هیچ بینایەکی تێدا نییە، و (عرصات القیامة) : شوێنی لێپرسینەوەیە، وە ئایا لەم جێگایەدا تەنها باوەڕداران خودا دەیبینن ؟

**لەم بابەتەدا سێ بۆچوون هەیە :**

وتراوە : لەساحەی مەحشەری ڕۆژی دوایی دا باوەڕدار و مونافیق وکافر دەیبینن .

بۆچوونێکی تر دەڵێت : تەنها باوەڕداران و مونافیقان دەیبینن وکافرەکان نایبنن .

کۆمەڵێکی تر دەڵێن : تەنها باوەڕداران دەیبینن، والله أعلم .

---

(١) کما ثبت في البخاري (٨٠٦)، ومسلم (١٨٢).

**جێگای دووەم :** باوەڕداران خودا دەبینن دوای چوونە بەهەشت، هەروەک لەقورئان و سوننەدا سابت بووە و، پێشتر لەم بارەیەوە هەندێ بەڵگەمان خستە ڕوو و شەرحمان کرد، هەروەها پێشتر گومانی ئەوانەشمانیش باسکرد، کە نەفی بینین دەکەن لەگەڵ وەڵامی گومانەکەیان، و(**الجنة**) لەزمانی عەرەبی دا، واتە: باخ وبێستان[1]، وە لێرەدا مەبەست لێی: ئەو جێگایەیە کە خودا بۆ خۆشەویستانی خۆی ئامادەی کردووە و، بەهەشت جێگای ناز و نیعمەتێکی ڕەها و کامڵ و تەواوە .

ووتەی شێخ : (كما يشاء الله)بەو شێوەیەیی خودا دەیەوێت، واتە : بەبێ ئیحاتە وپەی پێبردن و بەبێ چۆنیەتی دانان بۆ بینینی خودا .



(١) النهاية لابن كثير (١٦٨).

## ئەوشتانەی پەیوەندیان بەباوەڕبوون بەڕۆژی دواییەوە هەیە:

## [١] ئەوەی لەناوگۆڕدا ڕوو دەدات:

قال رحمه الله:

فَصْلٌ: وَمِنَ الإِيمَانِ بِالْيَوْمِ الآخِرِ الإِيمَانُ بِكُلِّ مَا أَخْبَرَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ مِمَّا يَكُونُ بَعْدَ الْمَوْتِ، فَيُؤْمِنُونَ بِفِتْنَةِ الْقَبْرِ، وَبِعَذَابِ الْقَبْرِ وَنَعِيمِه. فَأَمَّا الْفِتْنَةُ؛ فَإِنَّ النَّاسَ يُمْتَحَنُونَ فِي قُبُورِهِمْ، فَيُقَالُ لِلرَّجُلِ: مَن رَّبُّكَ؟ وَمَا دِينُكَ؟ وَمَن نَّبِيُّك؟ فَيُثَبِّتُ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ، فَيَقُولُ الْمُؤْمِنُ: رَبِّيَ اللهُ، وَالإِسْلاَمُ دِينِي، وَمُحَمَّدٌ - ﷺ - نَبِيِّي. وَأَمَّا الْمُرْتَابُ؛ فَيَقُولُ: هَاه هَاه؛ لاَ أَدْرِي، سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ شَيْئًا فَقُلْتُهُ، فَيُضْرَبُ بِمِرْزَبَةٍ مِنْ حَدِيدٍ، فَيَصِيحُ صَيْحَةً يَسْمَعُهَا كُلُّ شَيْءٍ؛ إِلاَّ الإِنْسَانَ، وَلَوْ سَمِعَهَا الإِنْسَانُ؛ لَصَعِقَ. ثُمَّ بَعْدَ هذِهِ الْفِتْنَةِ إِمَّا نَعِيمٌ وَإِمَّا عَذَابٌ(١) .

شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: بەشێکی تر لەباوەڕبوون بەڕۆژی دوایی: باوەڕبوونە بەهەموو ئەو شتانەی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی لەبارەوە داوە لەوەی کە لەدوای مردن ڕوو دەدات، باوەڕداری ئەهلی سوننە باوەڕی بەفیتنە و تاقیکردنەوەی نێو گۆڕ هەیە و، بەسزاو خۆشیەکانیشی، بەنسبەت فیتنە وتاقیکردنەوەکانی:

خەڵک لەگۆڕەکانیاندا توشی فیتنە وتاقیکردنەوە و لێپرسینەوە دەبن و، پێیان دەوترێت: (خودات کێیە؟ چ جۆرە ئاینێکت هەیە؟ کێ پێغەمبەرتە؟) ئا لەو حاڵەتەدا (خودا کەسانی باوەڕدار جێگیرو دامەزراو دەکات بەو وتە جێگیر ودامەزراوەی کە

---

(١) صحيح: كما ثبت في حديث براء بن عازب رضي الله عنه الـذي أخرجـه أبـو دواود (٤٧٥٣)، وأحمد (١٨٧٣٣)، والحاكم (١/ ٣٧)وغيرهم، وقال الحـاكم: صـحيح علـى شرط الشـيخين، أنظر: أحكام الجنائز للألباني (١٥٩).

**لەدونیا و دواڕۆژدا لەسەری بوون کەئەویش وتەی تەوحید و تەنها الله پەرستییە) کەسی باوەڕدار دەڵێت: الله پەروەردگارمە، وئیسلام ئاینمە، وموحەممەد ﷺ پێغەمبەرمە. هەرچی کەسی گوماناویشە دەڵێت: ها ها! نازانم، گوێم لەخەڵکی بوو شتێکیان دەوت منیش دووبارەم دەکردەوە، بەچەکوشێکی ئاسنین لێی دەدرێت، هاوارکردنێك هاوار دەکات هەموو شتێك گوێبیستی دەبێت جگە لەمرۆڤ، خۆ ئەگەر مرۆڤ گوێبیستی بوایە؛ ئەوا توشی لەهۆشخۆچوون دەبوو، پاشان دوای ئەم تاقیکردنەوەیە یان خۆشی و ناز ونیعمەتە یاخود سزاو چەرمەسەری.**

---

## شەرح

(الیوم الآخر) : بریتیە لەڕۆژی دوایی و باوەڕبوون پێی یەکێکە لەپایەکانی باوەڕ، ئەقڵ وسروشت(فیترەت) بەڵگەن لەسەری، هەرچی کتێبی ئاسمانییە باسیان لێوە کردووە و، هەموو پێغەمبەرانیش ئاگاداریان لەبارەوە داوە، بۆیە ناوی نراوە **(الیوم الآخر)**؛ لەبەر تاخیربوون و دواکەوتنی لەدونیا، شێخ لێرەدا یاسایەکی گشتگیری بۆ مانای باوەڕبوون بەڕۆژی دوایی باسکردووە، کە بریتییە لە باوەڕبوون بەهەموو ئەو شتانەی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی لەبارەوە داوە لەو شتانەی کە دوای مردن دێنە دی و، باوەڕهێنان بەهەموو شتانەش دەگرێتەوە کە لەدەقەکاندا هاتوون لەباسی حاڵەتی سەرەمەرگ و حاڵی مردوو لەناوگۆڕدا و زیندوو بوونەوە و هاتنەدەرەوە لەگۆڕ و ئەوەی کە دواتر ڕوو دەدات، پاشان شێخ ئاماژەی بەچەند شتێکی تر داوە لەو شتانە.

لەوانە : ئەوەی کە لەناوگۆڕدا ڕوو دەدات و، دەڵێت: (فیؤمنون بفتنة القبر، وبعذاب القبر ونعیمە)واتە: باوەڕیان بەتاقیکردنەوەی نێوگۆڕ هەیە و، بەسزای نێو گۆڕ و خۆشیەکەشی و، ئاماژەی بەدوو شت داوە:

**یەکەم: فیتنەو تاقیکردنەوەی نێو گۆڕ، و(الفتنة)** : لەڕووی زمانەوانیەوە[١] واتە : ئیمتیحان و تاقیکردنەوە، لێرەدا مەبەست لێی: پرسیارکردنی دوو فریشتەکەیە لەمردوو؛ هەربۆیە گوتی: (فأما الفتنة: فإن الناس يفتنون في قبورهم فيقال للرجل)واتە: بەنیسبەت فیتنەوە بەڕاستی خەڵك توشی فیتنە دەبن لەنێوگۆڕەکانیاندا و پرسیار لەپیاوێك دەکرێت واتە : لەمردووەکە، جا پیاو بێت یاخود ئافرەت ، ڕەنگە ناوهێنانی پیاو لێرەدا لەبابی تەغلیب بێت، پاشان ئاماژەی بەو پرسیارانە داوە، کە ڕوو بەڕووی مردوو دەبنەوە و ئەو وەڵامەی کە باوەڕدار دەیداتەوە، هەروەها وەڵامی کەسانی بێباوەڕیش و ئەوەی دوای ئەو وەڵامەش، کە ڕوو دەدات لەخۆشی یاخود سزای سەخت .

باوەڕبوون بەپرسیاری دوو فریشتەکە واجبە؛ لەبەرئەوەی لەپێغەمبەرەوە ﷺ سابت بووە لەچەندان فەرموودەدا کە بەهەموویان دەگەنە حەدی تەواتور و، جگە لەفەرموودە بەڵگەی قورئانیش هەیە وەك ئەم فەرمایشتە : ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّـٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴾ [إبراهيم : ٢٧] ،واتە: خودا ئەوکەسانە جێگیر ودامەزراو دەکات لەسەر وشەی تەوحید ویەکخواپەرستی لەدونیا و دواڕۆژدا وکەسانی ستەمکار وبێباوەڕیش گومڕا وسەرلێشێواو دەکات وخودا ئەو شتەدەکات کە خۆی ویستی لەسەرە ودەیەوێت.

پێشەوا بوخاری و موسلیم [٢] لەبەڕائی کوڕی عازیبەوە (خودا لێیان ڕازی بێت) فەرموودەیەکیان گێڕاوەتەوە لەپێغەمبەرەوە ﷺ کە لەبارەی فەرمایشتی: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ ﴾ فەرموویەتی : «**نزلت في عذاب القبر**»،واتە: لەبارەی

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن للأصفاني (٦٢٣).

(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٣٦٩)، ومسلم (٢٨٧١).

سزای نێو گۆڕەوە دابەزیوە، لەڕیوایەتەکەی موسلیم دا ئەم زیادەشی تێدایە: «**فیقال له : من ربك؟ فیقول : ربي الله ونبيي محمد ﷺ**» ، **فذلك قوله عز وجل** : ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ ﴾ ،واتە: پێی دەوترێت: پەروەردگارت کێیە؟ ئەویش دەڵێت: پەروردگارم اللەیە، وپێغەمبەرەکەم موحەممەدە ﷺ، ئا ئەمەیە مەبەستی فەرمایشتی خوای تەعالا : (خودا باوەڕداران جێگیر و دامەزاو دەکات لەسەر وشە جێگیر ومەزراوەکە).

و«**القول الثابت**» بریتیە لە : کەلیمەی تەوحید کە لەدڵی باوەڕداردا دەچەسپێت بەبەڵگە و دەلیل و، جێگیر بوونی باوەڕدار لەسەری لەژیانی دونیادا: ئەوان دەستگرتوون پێوەی هەرچەند لەوپێناوەدا توشی سزاو ئازار ببن و، جێگیربوونیان لەڕۆژی دوایی دا : تەوفیقدان و یارمەتی دانیانە بۆ وەڵامی دوو فریشتەکە .

ووتەکەی : «وأما المرتاب» واتە : هەرچی کەسی دوو دڵ وگوماناویە «فیقول» لەکاتی پرسیارکردن لێی : «**هاه هاه!**» وشەیەکی دوو دڵی ودڵنیا نەبوونە «لا أدري، سمعت الناس يقولون شيئاً فقلته» واتە: نازانم، گوێم لەخەڵکی بوو شتێکیان دەگوت منیش لەگەڵیان وتمەوە؛ چونکە ئەم کەسە باوەڕدار نەبووە بەوەی پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی بۆیە وەڵامەکەی لێ تێکدەچێت، هەرچەند زاناترین کەس و زمانپاراوترین کەسێش بێت، هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ واتە: خودا کەسانی ستەمکار و بێباوەڕ بەهەڵەدا دەبات، بۆیە «فيضرب بمرزبة من حديد»واتە: بەچەکوشێکی ئاسنین لێی دەدرێت کە زۆر گەورەیە «فيصيح صيحة يسمعها كل شيء إلا الإنسان»واتە: هاوارکردنێك هاوار دەکات کە هەموو گیاندارێك دەیبیستێت جگە لەمرۆڤ. پاشان حیکمەتی نەبیستی مرۆڤ بۆ ئەو لێدانە ڕووندەکاتەوە و دەفەرموێت : «ولو سمعها الإنسان لصعق» واتە: گەر مرۆڤ بیبیستایە ئەوا بەردەبووەوە و دەمرد یاخود لەهۆش خۆی دەچوو، یەکێکی تر لەحیکمەتەکانی خودا لەگوێبیست نەبوونی مرۆڤی زیندوو لەوەی لەنێو گۆڕدا ڕوو

دەدات ؛ لەبەرئەوەیە خودا ئەم شتەی وەک بابەتێکی غەیبی ونادیار هێشتووەتەوە خۆ ئەگەر بەدیاری بخستایە ئەوا حیکمەت و ئامانجەکە لەدەست دەچوو کە ئەویش باوەڕبوونە بەغەیب و شتە نادیارەکان .

**دووەم :** ئەوەی بەسەر مردوودا دێت لەگۆڕەکەیدا ئەوەیە کە شێخ ئاماژەی پێدا بەم وتەیەی : (ثم بعد هذه الفتنة إما نعيم وإما عذاب إلى أن تقوم القيامة الكبرى)واتە: دواتر و دوای ئەم فیتنەو تاقیکردنەوەیە یان خۆشی و ناز و نیمعەتە یاخود سزاو و دەردەسەریە، تاوەکو ڕۆژی دوایی. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بوون و هەقیقەتی سزا و خۆشی ناوگۆڕ، مەزهەبی ئەهلی سوننە وجەماعە وایە: مرۆڤ کاتێ دەمرێت یان لەخۆشیدا دەبێت یاخود لەناخۆشیدا دەبێت و سزا دەدرێت، ئەو سزاو خۆشیە بۆ ڕوح و جەستەشیەتی، هەروەک بەموتەواتری لەچەندان فەرموودەدا لەپێغەمبەری خوداوە ﷺ هاتووە[1] ، بۆیە پێویستە باوەڕهێنان پێی و قسەنەکردن لەبارەی چۆنیەتی و سیفەتی ئەو خۆشی و سزایەوە؛ چونکە ئەو شتە لەدەرەوەی توانای ئەقڵی مرۆڤە و مرۆڤ توانای لێ تێگەیشن و پەی پێبردنی نییە؛ چونکە ئەوە یەکێکە لەبابەتەکانی تایبەت بەڕۆژی دوایی و، بابەتی تایبەت بەڕۆژی دواییش خودا نەبێت کەس نایزانێت جگە لەوانە نەبێت کە خودا هەندێ شتی پێ وتوون و پیشانی داون، کە ئەوانیش پێغەمبەرانن (صلوات الله وسلامه عليهم) .

موعتەزیلەکان نکۆڵی لەسزای نێو گۆڕ دەکەن و، گومان و شوبهەکەشیان ئەوەیە: ئەوان هەست بەو شتە ناکەن و نابینن مرۆڤ سزا بدرێت و پرسیاری لێبکرێت.

وەڵامی ئەم گومانە: پەی نەبردنی ئێمە بەو شتە و نەبینینی ئێمە بۆ شتێك بەڵگە نییە لەسەر نەبوونی و ڕوو نەدانی، چەندان شت هەن ئێمە نایبینین لەکاتێدا بوونیان هەیە و مەوجودن و سزا و خۆشی نێو گۆڕیش بەشێکە لەوشتانە . خوای پەروەردگار بابەتی ڕۆژی دوایی و ئەوەش پەیوەستە پێوەی کردووە بەشتێکی نادیار وغەیبی و

---

(١) بروانە: أهوال القبور لابن رجب الحنبلي (٨١).

شاردوویەتیەوە لەپەیبردنی ئەقڵ پێی لەم ژیانەی دونیادا ؛ ئەوەش لەپێناو ئەوەی دەربکەوێت بزان کێ باوەڕ بەغەیب دەکات و کێش باوەڕی پێناکات. جا بابەتی ڕۆژی دوایی قیاس ناکرێتە سەر بابەتە دونیایەکان . والله أعلم .

**وسزای نێو گۆڕ دوو جۆرە:**

**جۆری یەکەم:** سزایەکی بەردەوامە کە ئەویش سزای کەسی کافر و بێباوەڕە، هەروەک خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۖ ﴾ [غافر : ٤٦] ،واتە: لەبەیانیان و ئێواراندا ئاگریان پیێ پیشان دەدرێت و سزا دەدرێن.

**جۆری دووەم :** ماوەیەکە ودواتر کۆتایی دێت، ئەوەش سزای کەسانی تاوانباری باوەڕدارە، بەگوێرەی تاوان وجەریمەکەی سزا دەدرێت، پاشان سووک دەکرێت لەسەری. هەندێ جار سزاکەی لەسەر لادەچێت بەهۆی دوعا و پاڕانەوەوە یاخود بەهۆی خێر و چاکەوە یاخود بەهۆی داوای لێخۆش بوونەوە[1].

---

(١) كما ثبت في صحيح البخاري (٢١٨)، ومسلم (٢٩٢).

## [٢] قیامەتی گەورە و ئەوەی کە تێیدا ڕوو دەدات:

**إِلَى أَنْ تَقُومَ الْقِيَامَةُ الْكُبْرى، فَتُعَادُ الأَرْوَاحُ إِلَى الأجْسَادِ. وَتَقُومُ الْقِيَامَةُ الَّتِي أَخْبَرَ اللهُ بِهَا فِي كِتَابِه، وَعَلَى لِسَانِ رَسُوله، وَأَجْمَعَ عَلَيْهَا الْمُسْلِمُونَ. فَيَقُومُ النَّاسُ مِنْ قُبُورِهِمْ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً.**

**تاوەکو قیامەتی گەورە هەڵدەستێت، ئەوکات ڕوحەکان دەگەڕێندرێنەوە بۆ لاشەکان. ئەو قیامەتە هەڵدەستێت، کە خوای پەروەردگار هەواڵی لەبارەوە داوە لەقورئانەکەیدا و، لەسەر زاری پێغەمبەرەکەی و، موسوڵمانان کۆدەنگن لەسەری.**

**خەڵك هەڵدەستنەوە لەگۆڕەکانیان بۆلای پەروەردگاریان بەپێی پەتی و بە ڕووتی و خەتەنە نەکراوی.**



شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەم بەشە و ئەوەی دواتردا ئاماژەی بەوە داوە کە لەژیانی دواڕۆژدا (**الدار الآخرة**) ڕوو دەدات، کە ئەویش بەقیامەتی گەورە دەستپێدەکات، چونکە بەڕاستی ژیان (**الدور**) سێ جۆرە[1]:ژیانی دونیان (**دار الدنيا**)، و ژیانی بەرزەخ (**دار البرزخ**) ، و ژیانی دواڕۆژ (**الدار الآخرة**) ، هەریەك لەم سێ ژیانە حوكمی تایبەت بەخۆی هەیە و، چەندان ڕوداو هەیە تێیدا ڕوو دەدات و، شێخ باسی لەوە کردووە کە لە ژیانی بەرزەخ (**الدار البرزخ**)دا ڕوو دەدا .

جا لێرەدا دەستیکردووە بەقسەکردن لەبارەی ئەوەی کە لە ژیانی دواڕۆژدا (**الدار الآخرة**)ڕوو دەدات و، دەڵێت: (إلى أن تقوم القيامة الكبرى)واتە: تاوەکو قیامەتی گەورە ڕوو دەدات و، قیامەت دوو جۆرە :

(١) بروانه : شرح العقيدة الطحاوية (٤٥٢).

قیامەتی بچوك : کە ئەویش مردنە، ئەم قیامەتە بەسەر هەموو کەسێکدا بەتایبەت دێت کاتێ کە ڕوحی دەردەچێت و کار و کردەوەی بەکۆتا دێت، قیامەتی گەورە: ئەمەیان بەسەر هەمواندا دێت و هەموان بەیەکجار و پێکەوە دەگرێت و ڕاپێچیان دەکات، هۆکاری ناو نانی بەقیامەت؛ لەبەر هەستانەوەی(**قیام**) خەڵکە لەگۆڕەکانیان و چوونیان بۆلای پەروەردگاریان[1]؛ هەربۆیە گووتی : (فتعاد الأرواح إلى الأجساد)واتە: ڕوحەکان دەگەڕێندرێنەوە بۆ لاشەکان، ئەوەش کاتێ کە ئیسرافیل فوو دەکات بە کەڕەنادا (**الصور**) ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلۡأَجۡدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾ قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرۡقَدِنَاۜ﴾ [يس: ٥١، ٥٢] ، واتە:خەڵکی بە نەفخەی یەکەم هەموو دەمرن و پاشان بۆ جاری سێیەم فوو بە شەیپوردا دەکرێت، ئەوسا کتوپڕ بە پەلە لە گۆڕەکانیان هەموو دێنە دەرێ و دەبرێن بۆلای دادگای پەروەردگاریان بۆ پاداشت و تۆڵە. هەرکە زیندووشکرانەوە بەسەر سوڕمانێکەوە دەڵێن: تیاچوونی خۆمان! کێ لە گۆڕو خەوگاکەماندا زیندووی کردینەوەو هەڵیساندین؟! ،وفەرموویەتی : ﴿ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ﴾ [الزمر : ٦٨] ،واتە: لە پاشان بۆ جارێکی تر کە فوی پیاکرا، ئەوجا لە ناکاو تەواوی درووستکراوەکان لە گۆڕەکانیاندا هەڵدەسنەوەو چاوەڕوانن چییان پێبکرێ.

و(**الأرواح**) : جەمعی (**روح**)ـە، ئەوەش ئەوەیە کە مرۆڤ وجگە لەویش لەخاوەن ڕوحەکان پێی زیندوو دەبنەوە، هیچ کەسێك هەقیقەتی ڕوح نازانێت جگە لە الله جل جلالە. خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي ﴾ [الإسراء : ٨٥] واتە: وە لە بارەی (ڕۆح)ـەوە لێت دەپرسن و دەڵێن: باشە ئەو ڕۆحەی کە هۆی ژین و زیندوێتیی ئادەمیزادە چییە؟، ئایا شتێکی کۆنە؟، تازەیە؟،

---

(١) بروانە: التذكرة للقرطبي (٢/ ٢٦٨).

هەقیقەتی هەیە؟! پێیان بڵێ: ڕۆح، منیش هیچی لێ نازانم، چونکە لە فەرمانە نهێنییەکانی پەروەردگارمە، بە دەسەڵاتی خۆی بەدیهێناوەو مرۆڤ و گیانلەبەرانی پێ دەجوڵێ و دەژیی، ئەو هەر خۆی لێی بەئاگایە.

ووتەکەی : (وتقوم القيامة التي أخبر الله بها في كتابه وعلى لسان رسوله وأجمع عليها المسلمون)واتە: ئەو قیامەتە هەڵدەستێت، کە خوای پەروەردگار لەقورئانەکەیدا هەواڵی لەبارەوە داوە و لەسەر زاری پێغەمەرەکەشی و موسوڵمانان کۆدەنگن لەسەری. ئەم وتەیەیی شێخ ئەماژەیەکە بۆ بەڵگەکانی زیندوو بوونەوە، و ئەم بابەتە سابتە بەقورئان و سوننە و کۆدەنگی موسوڵمانان و ئەقڵ و سروشت(فیترەت)ی پاک وسەلامەت. خوای پەروەردگار لەقورئانەکەیدا هەواڵێ لەبارەوە داوە و بەڵگەی لەبارەوە خستووەتە ڕوو و لەزۆرێک لەسورەتەکانی قورئاندا وەڵامی ئەوانەی داوەتەوە کە نکۆڵی لە زیندوو بوونەوە دەکەن. لەبەرئەوەی پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ کۆتا پێغەمبەرە ژیانی دوارۆژی بەدوور و درێژی ڕوونکردووتەوە بەشێوەك کە هاوشێوەی نییە لەزۆرێك لەکتێبی پێغەمبەرانی تردا .

دواتر پاداشت دانەوە لەسەر کردەوەکان سابت بووە بەئەقڵ و، لەشەرعیشدا هاتووە (واریدە)، خوای پەروەردگار لەزۆر شوێنی قورئاندا ئاگاداری داوە بەئەقڵ لەو بارەیەوە هەروەك باسی لەوە کردووە: ناکرێ و لەگەڵ حیکمەت و دانایی خودادا ناگونجێ هەروا بەئاسانی واز لەخەڵکی بێنێت و بەکەیفی خۆیان چیان بوێت بیکەن و بیلێین بەبێ هیچ بەرنامە و پاداشت و سزایەك، یاخود هەروا بۆگاڵتە و بێ بوونی هیچ حیکمەتێك دروستی کردبن و فەرمانیان پێنەکرێت و ورێگریان لێنەکرێت و، پاداشت نەدرێنەوە لەسەر کارەچاکەکانیان و سزا نەدرێن لەسەر تاوان و خراپەکانیان.

کەسی چاکەکار هاوشێوەی خراپەکار بێت یاخود موسوڵمان یەکسان بێت لەگەڵ بێباوەڕ و کافردا. چونکە بەڕاستی هەندێ لەچاکەکاران دەمرن پێش ئەوەی پاداشتیان بدرێتەوە لەسەر چاکەکیان.

هەندێ خراپەکار و موجریم و تاوانباریش دەمرن پێش ئەوەی تۆڵەو سزای خراپەکانیان لێبکرێتەوە. بۆیە شتێکی حەتمیە و دەبێ جێگایەک هەبێت بۆ هەریەکەیان و پاداشت و سزای خۆیان وەرگرن تێیدا.

پاشان ئەوەی نکۆڵی لەزیندووبوونەوە بکات بێباوەڕ وکافرە، هەروەک خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ ﴾ [التغابن : ٧] ،واتە: ئەوانەی کافر و بێباوەڕن بانگەشەی ئەوە دەکەن گوایە زیندوو ناکرێنەوە! .

ووتەکەی: ( فیقوم الناس من قبورهم حفاةً)واتە: خەڵکی لەگۆڕەکانیان دێنە دەرەوە بەپێی پەتی، و(**حفاةً**)جەمعی (**حاف**)ـە، ئەوەش ئەوکەسەیە کە هیچ شتێك لەپێیەکانی دا نییە هاوشێوەی نەعل و قۆندەرە وخوف و گۆرەوی، (**عراةً**) : جەمعی (**عار**)ـە ، ئەوەش ئەوکەسەیە کە ڕووتە و هیچ پۆشاکێکی لەبەردا نییە، (**غرلا**) : جەمعی (**أغرل**)ـە، ئەمەش ئەوکەسەیە کە خەتەنە نەکراوە، خەڵك لەکاتی هەستانەوەیان لەنێو گۆڕ و زیندوو بوونەوەیان بەم سێ سیفەتە هەڵدەستنەوە و زیندوو دەبنەوە، ئەمەش لەفەرموودەی سەحیح دا لەپێغەمبەری خواوە ﷺ هاتووە، هەروەک لەصەحیحی بوخاری و موسلیم دا [١]هاتووە، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) گێراویەتیەوە ودەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : «**إنكم تحشرون إلى الله يوم القيامة حفاة عراةً غرلاً** . . .» الحديث . واتە: ئێوە زیندوو دەکرێنەوە بۆلای خودا و کۆ دەکرێنەوە بەپێی پەتی و ڕووت و قوتی وخەتەنە نەکراوی.

⁂

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٦٥٢٧)، ومسلم (٢٨٥٩).

## ئەوشتانەی کە لەڕۆژی دوایی دا ڕوو دەدەن :

وَتَدْنُو مِنْهُمُ الشَّمْسُ ، وَيُلْجِمُهُمُ الْعَرَقُ . فَتُنْصَبُ الْمَوَازِينُ ، فَتُوزَنُ بِهَا أَعْمَالُ الْعِبَاد، ﴿ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ فِى جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿١٠٣﴾ ﴾ [المؤمنون: ١٠٢: ١٠٣].

خۆر لێیانەوە نزیک دەبێتەوە و عەرەق دەگاتە چەناگەیان؛ وە ترازووەکان دادەنرێن و، کردەوەی بەندەکانی پێدەپێورێت، (هەرکەسێك کێشی تەرازووی چاکەی قورس بێت ئا ئەوانە سەرکەوتوو و سەرفرازن، ئەوەش کێشی تەرازووی چاکەی سوک بێت، ئا ئەوانە خەسارەومەند و دۆڕاون ولەدۆزەخ دا بەهەتا هەتایی دەمێننەوە.

وَتُنْشَرُ الدَّوَاوِينُ، وَهِيَ صَحَائِفُ الأَعْمَالِ، فَآخِذٌ كِتَابَهُ بِيَمِينِه، وآخِذٌ كِتَابَهُ بِشِمَالِه أَوْ مِنْ وَّرَاءِ ظَهْرِهِ؛ كَمَا قَالَ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى: ﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ وَنُخْرِجُ لَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ كِتَٰبًا يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ ﴾ [الإسراء: ١٣: ١٤].

نامەی کردەوەکان دابەش دەکرێت؛ هەیە نامەکەی بەدەستە ڕاستی وەردەگرێت و، هەشە بەدەستی چەپی یاخود لەپشتەوە: هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (ئیتر هەموو مرۆڤێک کردەوەکەیمان - خێرو شەڕ کە لە شەوو رۆژدا کردنی- ئاوێزانی ملی کرد، واتە: لە قیامەتدا نامەی هەموو کاروکردەوەی مرۆڤ وەک (تەوق)و ملوانکە دەکرێتە ملی و، هەر بەپێی ئەوەش لەقیامەتدا پاداش و تۆڵە وەردەگرێتەوە. پێی دەگوترێ: دەسا بۆ خۆت نامەی کردەوەکانت بخوێنەوە، ئەمرۆ ئیتر هەر تۆ خۆت حیساب لەگەڵ خۆت بکەو پێویست بەکەسی تر ناکات).

**وَيُحَاسِبُ اللهُ الخَلائِقَ، وَيَخْلُو بِعَبْدِهِ الْمُؤْمِنِ، فَيُقَرِّرُهُ بِذُنُوبِهِ؛ كَمَا وُصِفَ ذَلِكَ فِي الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ. وَأَمَّا الْكُفَّارُ؛ فَلا يُحَاسَبُونَ مُحَاسَبَةَ مَنْ تُوزَنُ حَسَنَاتُهُ وَسَيِّئَاتُهُ؛ فَإِنَّهُ لاَ حَسَنَاتَ لَهُمْ، وَلَكِنْ تُعَدُّ أَعْمَالُهُمْ، فَتُحْصَى، فَيُوقَفُونَ عَلَيْهَا وَيُقَرَّرُونَ بِهَا.**

**خوای پەروەردگار لێپرسینەوە لەگەڵ خەڵکی بەگشتی دەکات و، بەتەنها لەگەڵ بەندە باوەڕدارەکەیدا کۆ دەبێتەوە، و وای لێدەکات دان بنێت بەتاوانەکانی دا، هەروەك وەسفی ئەمە کراوە لەقورئان و سوننەدا، هەرچی بێباوەڕانە: لێپرسینەوەی کێشانی چاکە و خراپەکانیان لەگەڵ ناکرێت؛ چونکە ئەوان هیچ چاکەیەکیان نییە، بەڵکو تەنها کردەوەکانیان دەژمێردرێت و، پێیان پیشان دەدرێت و وایان لێدەکرێت دانی پێدا بنێن و سزایان دەدرێت لەسەری.**

---

## شەرح

شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لێرەدا هەندێ لەو شتانەی باسکردووە، کە لەڕۆژی دوایی دا ڕوو دەدات لەو شتانەی، کە لەقورئان و سوننەدا باسکراوە، بەڕاستی تەفاسیل و وردەکاری ئەوەی لەو ڕۆژەدا ڕوو دەدات بەئەقڵ پەی پێنابرێت، بەڵکو تەنها بەدەقی صەحیح لەپێغەمبەرەوە ﷺ دەزانرێت ئەوەی کەلەخۆیەوە هیچ شتێك ناڵێت: ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴾ واتە: بەڵکو ئەوەی دەیڵێت وەحیە و بۆی دادەبەزێت، یەکێک لەحیکمەتەکانی لێپرسینەوە لەگەڵ خەڵك لەسەر کردەوەکانیان و کێشانی و پیشاندانیان و نووسرانی لە نامەی کردەوەکاندا، لەکاتێکدا خودا زانایە پێی و ئاگاداریەتی ؛ لەبەرئەوەیە بەندەکانی کامڵی دادپەروەری و فراوانی ڕەحمەتەکەی و گەورەیی موڵکی خودا ببینن و بۆیان دەرکەوێت، شێخ باسی لەو شتانە کردووە کە لەو ڕۆژە گەورەدا ڕوو دەدەن و بەسەر بەندەکاندا دێت:

١- (وتدنو منهم الشمس) واتە : خۆر لێیان نزیك دەبێتەوە، هەروەك پێشەوا موسلیم[1] لەمیقدادەوە (خوا لێی ڕازی بێت) گێڕاویەتیەوە و دەڵێت : گوێم لەپێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی: «**إذا كان يوم القيامة أدنيت الشمس من العباد حتى تكون قدر ميل أو ميلين**»،واتە:کاتێ کە ڕۆژی دوایی دادێت خۆر لەبەندەکان نزیك دەبێتەوە، تاوەکو بەئەندازەی میلێك یاخود دوو میل لێیان نزیك دەبێتەوە، ووتەکەی : (ويلجمهم العرق) واتە : عەرەق دەگاتە ئاستی دەمیان، وەك ڕەشمەی لێدێت و ڕێگریان لێدەکات لەقسەکردن، ئەوەش لەئەنجامی نزیکبوونەوەی خۆر لێیان ئەمە بەنیسبەت زۆرینەی خەڵکەوە، بەڵام پێغەمبەران لەمە بەدەرن و ئەوانەش کە خودا ویستی لەسەر بێت.

٢- یەکێکی تر لەو شتانەی کە باسکراوە لەبارەی ئەم ڕۆژەوە، وتەکەیەتی، کە دەڵێت : (وتُنصَب الموازين، وتُوزَن بها الأعمال) ،واتە: تەرازووەکان دادەنرێن وکردەوەکانی پێدەکێشرێت، و (**الموازين**) جەمعی(**ميزان**)ـە، ئەوە ئەوشتەیە کە چاکە و خراپەی پێدەکێشرێت و، تەرازوویەکی هەقیقیە و زمانی هەیە، وەک تەرازووی ڕاستی دوو لاشی هەیە[2]، ئەمە یەکێکە لەو شتانەی، کە لەڕۆژی دوایی دا ڕوو دەدەن و باوەڕمان پێی هەیە، بەو شێوەیەی کە هاتووە، بەشوێن چۆنیەتیەکەیدا ناگەڕێین تەنها لەژێر ڕۆشنایی دەقەکاندا نەبێت و، حیکمەت لەکێشانی کردەوەکان پیشاندانی ئەندازەکەیەتی؛ بەڵکو پاداشت و سزا بەگوێرەی ئەوە بێت ﴿فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ﴾ ، واتە : ئەوەی لای تەرازووی چاکەکەی قورستر بێ لەخراپەکانی﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ ، واتە : براوە و سەرکەوتووە و ڕزگاری بووە لەدۆزەخ و شیاوی ئەوەیە بچێتە بەهەشتەوە . ﴿وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ﴾ ، واتە : هەرکەسێک خراپەکانی

---

(١) برقم (٢٨٦٤) .

(٢) شرح العقيدة الطحاوية (٤٧٢).

قورستر بێت لەچاکەکانی ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ﴾ ،واتە : ئائەوانە دۆڕاو وبەدبەخت بوون و خۆیان دۆڕاند. ﴿فِي جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ﴾ ، واتە : لەئاگردا دەمێننەوە.

**مەوزوعی شاهید لەئایەتە پیرۆزەکەدا :**

لەم ئایەتەدا ئیسپاتکردنی تەرازوو و وکێشانی کردەوە لەڕۆژی دوایی دا کراوە، وناوی کێشانە و تەرازوو (**الوزن والموازين**) لەچەندان ئایەتی قورئاندا هاتووە و، کۆی ئایەتەکان ئەوەیان لێ وەردەگیردرێت کە بکەر و کار و خودی نامەی کردەوەکانیش دەکێشرێت و، هیچ پێچەوانەو دژیەکیەک لەنێوانیاندا نییە، هەموویان دەکێشرێن، بەڵام ئەوەی گرنگ بێت لەقورسی و سوکی دا خودی کردەوەکەیە، نەک بکەر و نامەی کردەوەکان. والله أعلم.

بەڵام موعتەزیلەکان تەئویلی ئەم دەقانەیان کردووە بەوەی مەبەست لە کێشانە و تەرازوو(**الوزن والميزان**) عەدل و دادپەروەریە، ئەوەش تەئویل و لێکدانەوەیەکی نادروست و فاسدە و پێچەوانەی دەقەکان و کۆدەنگی سەلەف و پێشەوایانی ئەم ئوممەتەیە .

پێشەوا شەوکانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: «**وغاية ما تشبثوا به مجرد الاستبعادات العقلية، وليس في ذلك حجة على أحد. فهذا إذا لم تقبله عقولهم فقد قبلته عقول قوم هي أقوى من عقولهم من الصحابة والتابعين وتابعيهم حتى جاءت البدع كالليل المظلم وقال كل ما شاء وتركوا الشرع خلف ظهورهم**»[1] .

واتە: ئەوەی ئەوان دەستیان پێوە گرتووە و پشتیان پێ بەستووە تەنها کۆمەڵە شتێکە، کە بەپێی ئەقڵی ئەوان دوورەو ئەستەمە، ئەوەش نابێتە بەڵگە لەسەر هیچ کەسێک، چونکە گەر ئەقڵی ئەوان تەقەبوڵی نەکات و بەدووری بزانێت ئەوا ئەقڵی کەسانی تر تەقەبولی کردووە کە زۆر لەئەقڵی ئەوان بەهێزترە، کە ئەوانیش هاوەڵان و

---

(۱) فتح القدير (۲/ ۱۹۷).

تابیعینن تاوەکو بیدعە هاوشێوەی شەوی تاریک هات و هەرکەسە ئەوەی گوت، کە ویستی لێ بوو و وازیان لەشەرع هێنا و پشت گوێیان خست .

پاشان بابەتەکانی ڕۆژی دوایی لەو شتانە نییە کە ئەقڵ پەیپێببات و وەک پێویست لێی تێبگات . والله أعلم.

٣- یەکێك لەو ڕوداوانەی کە شێخ باسی لێوە کردووە لەو ڕۆژە گەورەیەدا وتەکەیەتی، کە دەڵێت: (وتنشر الدواوين ، وهي صحائف الأعمال) واتە: نامەی کردەوەکان دابەش دەکرێت ئەوەی، کە کردەوەی مرۆڤەکانی تێدا نوسراوە و تۆمار کراوە، ئەو کردەوانەی، کە لەژیانی دونیادا ئەنجامیان داوە و فریشتەکان تۆماریان کردووە لەسەریان؛ چونکە ئەم نامەیە لەکاتی مردندا دادەخرێت و لەکاتی لێپرسینەوەدا دەکرێتەوە و تەماشا دەکرێت؛ بۆ ئەوەی هەر مرۆڤێك چاوی بە نامەکەی خۆی بکەوێت و بزانێت چی تێدایە (فآخذ كتابه بيمينه وآخذ كتابه بشماله أو من وراء ظهره)واتە: هەیە نامەکەی بەدەستی ڕاستی وەردەگرێت وهەیشە بەدەستی چەپی ویاخود لەپشتەوەی، ئەمەش ڕونکردنەوەی چۆنیەتی وەرگرتنی نامەی کردەوەکانە لەلایەن خەڵکەوە، هەروەک لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە، ئەوەش دوو جۆرە: هەیە نامەکەی بەدەستی ڕاست وەردەگرێت، ئەوەش کەسی باوەڕدارە. وە هەشە بەدەستی چەپ و یاخود لەدواوەیی کە ئەویش کافر و بێباوەڕە ـ بەوەی دەستی چەپی درێژ دەکات و لەپشتەوە نامەکەی پێ بدرێت - هەروەك ئایەتەکان بە هەردوو شێوازەکە هاتووە و، هیچ دژیەکیەکیش لەنێوانیاندا نییە؛ چونکە کەسی کافر دەستی ڕاستی دەبەسترێت بەملیەوە و دەستی چەپیشی بەرەو دواوەیە و لەوێوە نامەی کردەوەکانی وەردەگرێت.

پاشان شێخ بۆ قسەکەی ئەم فەرمایشتەی خودا دەکاتە بەڵگە: ﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ ﴾واتە: هەموو مرۆڤێک کردەوەکەیمان - خێرو شەڕ کە لە شەوو ڕۆژدا کردنی- ئاوێزانی ملی کرد ، و(طيرة) : ئەو کردەوانەیە کەلێوەی دەرچووە

لەخێر و شەڕ ﴿فِي عُنُقِهِۦ﴾واتە : دەسەپێندرێت بەسەریدا و پاداشت و سزا دەدرێت لەسەری و هیچ مەجالی ڕاکردن و خۆ دزینەوەی نییە لێی، ئەو کردەوانە پێوەی دەلکێ و دەکرێتە ملی، هەروەک چۆن بازن یاخود تەوق و هاوشێوەکانی دەکرێنە مل . ﴿وَنُخْرِجُ لَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ كِتَـٰبًا يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا﴾ واتە : هەموو کردەوەکانی لەنامەیەکدا بۆ کۆ دەکەینەوە و لەڕۆژی قیامەتدا پێی دەدرێت؛ جا یان بەدەستی ڕاستی، گەر کەسێکی باوەڕدار وخۆشبەخت بێت ویاخود بەدەستی چەپی، گەر بێباوەڕ وبەدبەخت بێت ﴿مَنشُورًا﴾ واتە: کراوەیە بەشێوەک خۆی و کەسانی تریش دەیخوێننەوە. بۆیە خودا فەرمووی : ﴿يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا﴾ وەك زوو موژدەدان بەرانبەر چاکە و سەرزەنشت کردنیش بەرانبەر بەخراپە ﴿ٱقْرَأْ كِتَـٰبَكَ﴾ واتە : پێی دەڵێین نامەکەت بخوێنەوە، پێش ئەوەی ئەو کتێبە بخوێنێتەوە ئەوەی خوێنەوار بێت و ئەوەش کە نەخوێنەوارە ﴿كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا﴾ واتە: خودی نەفسی خۆت بەسە لێپیچینەوەت لەگەڵدا بکات، ئەمەش گەورەترین دادپەروەیە بەوەی خودی خۆی کردووە بەوەی لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکات؛ بۆ ئەوەی هەموو کردەوەکانی ببینێت و نکۆڵی لەهیچ یەکێکیان نەکات .

**✍ شایەتحاڵ لەئایەتە پیرۆزەکەدا:**

لەم ئایەتەدا ئیسپاتی ئەوە کراوە هەموو مرۆڤێك نامەی کردەوەکانی خۆی پێدەدرێت لەڕۆژی دوایی دا وخودی خۆی دەیخوێنێتەوە بێئەوەی کەس یارمەتی بدات یاخود بیخوێنێتەوە بۆی .

٤- پاشان شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) باسی حیساب و لێپرسینەوەی کردووە و دەڵێت: (ويحاسب الله الخلائق) واتە: خودا حیساب و لێپرسینەوە لەگەڵ خەڵکی دا دەکات، و(**الحساب**) : ناساندنی پاداشتی کردەوەکانە بەبەندەکان لەلایەن خوای پەروەردگارەوە و، بیرخستنەوەی ئەو کار و کردەوانەیە، کە ئەنجامیان داوە و لەبیریان

کردووە، یاخود وەستاندنی بەندەکانە و پیشاندانی کردەوەکانیانە لەلایەن خوداوە پێش بڵاوەکردنیان لە ساحەی مەحشەر، جا کردەوەی چاکە بێت یاخود خراپە[1].

**پاشان شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) باسی لەوە کردووە لێپرسینەوە و حیساب دوو جۆرە:**

**جۆری یەکەم:** لێپرسینەوە و حیساب لەگەڵ باوەڕداردا و لەو بارەیەوە دەڵێت: (ویخلو بعبده المؤمن فيقرره بذنوبه ، كما وصف ذلك بالكتاب والسنة) واتە: بەتەنها لەگەڵ بەندە باوەڕدارەکەیدا کۆدەبێتەوە و وای لێدەکات دان بەتاوانەکانی دا بنێت، هەروەك وەسفی ئەم حاڵە لەقورئان و سوننەتدا کراوە، هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴿٧﴾ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا﴾ [الانشقاق : ٧ - ٩] ،واتە: ئینجا ئەو کەسەی نامەو دۆسیەی کاروکردەوەکانی درایە دەستی ڕاستی، کە ئەوەش نیشانەی بەختیارییە . ئیتر پرسینەوەیەکی سووک و ئاسانی لەگەڵدا دەکرێت، پاشان پاداش وەردەگرێ، وە لە خراپەکانیشی ئەبووردرێ .و بەخۆشیی و شادییەوە ئەگەرێتەوە لای ژن و مناڵ و خزم و کەس و کاری خواناسی لە بەهەشتدا.

لە صەحیحی بوخاری و موسلیم دا هاتووە[2] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێت)گێڕاویەتیەوە و دەڵێت: گوێم لەپێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «**إِنَّ اللَّهَ يُدْنِي الْمُؤْمِنَ، فَيَضَعُ عليه كَنَفَهُ ويَسْتُرُهُ، فيَقولُ: أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا؟ أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا؟ فيَقولُ: نَعَمْ أَيْ رَبِّ، حتَّى إِذَا قَرَّرَهُ بذُنُوبِهِ، ورَأَى في نَفْسِهِ أنَّه هَلَكَ، قالَ: سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ في الدُّنْيَا، وأَنَا أَغْفِرُهَا لكَ اليَومَ، فيُعْطَى كِتَابَ حَسَنَاتِهِ**». واتە :لەڕۆژی دوایدا لەکاتی لێپرسینەوە لەگەڵ بەندەکانیدا خوای گەورە کەسێکی ئیماندار لەخۆی

---

(١) التنبيهات السنية (٢٣١).

(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢٤٤١)، ومسلم (٢٧٦٨).

کردووە، یاخود وەستاندنی بەندەکانە و پیشاندانی کردەوەکانیانە لەلایەن خوداوە پێش بڵاوەکردنیان لە ساحەی مەحشەر، جا کردەوەی چاکە بێت یاخود خراپە[1].

**پاشان شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) باسی لەوە کردووە لێپرسینەوە و حیساب دوو جۆرە:**

**جۆری یەکەم:** لێپرسینەوە و حیساب لەگەڵ باوەڕداردا و لەو بارەیەوە دەڵێت: (ویخلو بعبده المؤمن فيقرره بذنوبه ، كما وصف ذلك بالكتاب والسنة) واتە: بەتەنها لەگەڵ بەندە باوەڕدارەکەیدا کۆدەبێتەوە و وای لێدەکات دان بەتاوانەکانی دا بنێت، هەروەك وەسفی ئەم حاڵە لەقورئان و سونەتدا کراوە، هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴿٧﴾ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا﴾ [الانشقاق : ٧ - ٩] ،واتە: ئینجا ئەو کەسەی نامەو دۆسیەی کاروکردەوەکانی درایە دەستی ڕاستی، کە ئەوەش نیشانەی بەختیارییە . ئیتر پرسینەوەیەکی سووک و ئاسانی لەگەڵدا دەکرێت، پاشان پاداش وەردەگرێ، وە لە خراپەکانیشی ئەبووردرێ .و بەخۆشیی و شادیەوە ئەگەڕێتەوە لای ژن و مناڵ و خزم و کەس و کاری خواناسی لە بەهەشتدا.

لە صەحیحی بوخاری و موسلیم دا هاتووە[2] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێت)گێڕاویەتیەوە و دەڵێت: گوێم لەپێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: **«إِنَّ اللَّهَ يُدْنِي المُؤْمِنَ، فَيَضَعُ عليه كَنَفَهُ ويَسْتُرُهُ، فيَقولُ: أتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا؟ أتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا؟ فيَقولُ: نَعَمْ أيْ رَبِّ، حتَّى إذَا قَرَّرَهُ بذُنُوبِهِ، ورَأَى في نَفْسِهِ أنَّه هَلَكَ، قالَ: سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ في الدُّنْيَا، وأَنَا أغْفِرُهَا لكَ اليَومَ، فيُعْطَى كِتَابَ حَسَنَاتِهِ»**. واتە :لەڕۆژی دوایدا لەکاتی لێپرسینەوە لەگەڵ بەندەکانیدا خوای گەورە کەسێکی ئیماندار لەخۆی

(١) التنبيهات السنية (٢٣١).

(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢٤٤١)، ومسلم (٢٧٦٨).

نزیک دەکاتەوەو دەیخاتە ژێر پارێزگاری و خۆیەوەو لە خەڵکەکەی دەشارێتەوە و بەنهێنی پرسیاری لێدەکات: ئایا دەزانی فڵان و فیسار تاوانت کردووە؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ ئەی پەروەردگارم ، هەتا دان دەنێت بەهەموو تاوانەکانیدا و خۆی بە تیاچوو دەزانێت ، لەو کاتەدا پەروەردگار پێی دەفەرموێت: ئەو تاوانانەم لە دونیادا بۆ داپۆشیت وە ئەمڕۆش لێت خۆش دەبم ، پاشان پەرتووکی کارەچاکەکانی دەدرێتە دەستی.

مانای «**یقرره بذنوبه**» واتە: وای لێدەکات دانی پێدا بنێت و ئیعتراف بکات، هەروەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە : «**أتعرف ذنب كذا، أتعرف ذنب كذا**»واتە: ئایا فڵانە تاوانت لەبیرە کە کردتت؟، ئایا فڵانە تاوانت لەبیرە کە کردتت؟. وە هەندێ لەباوەڕداران هەن کە دەچنە بەهەشتەوە بەبێ هیچ لێپرسینەوە و سزایەك[1].

جا لێپرسینەوە جیاوازە؛ هەیەتی ئاسانە کە ئەویش تەنها پیشاندان و خستنە بەرچاوە و، هەشە موناقەشەیە، لەصەحیحی بوخاری و موسلیم دا[2] هاتووە عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : «**ليس أحد يُحاسَب يوم القيامة إلا هلك**» **فقلتُ: يا رسولَ الله، أليس قد قال الله تعالى : فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَبَه يَمِينِه الله فَسَوفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيراً ، فقال رسولُ الله: «إنما ذلك العرض وليس أحد يُناقَش الحساب يوم القيامة إلا عُذِّب»**.

واتە: هیچ کەسێك نییە لەڕۆژی دواییدا لێپرسینەوەی لەگەڵ بکرێت ئیللا بەهیلاک دەچێت. گوتم ئەی خودا نەیفەرمووە: (ئەوەی نامەی کردەوەکانی بەدەستی ڕاستی بدرێتێ، ئەوا لێپرسینەوەیەکی ئاسانی لەگەڵ دەکرێت؟)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە تەنها پیشاندان و خستنە ڕووە و، هیچ کەسێك نییە موناقەشە و دەمە دەمێی لەگەڵ بکرێت لەڕۆژی دوایی دا ئیللا سزا دەدرێت.

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٥٨١١)، ومسلم (٢١٦).

(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (٦٥٣٧)، ومسلم (٢٨٧٦).

**جۆری دووەم** : لێپرسینەوە لەگەڵ کافر و بێباوەڕدا، وە شێخ بەم وتەیەیی ڕوونی کردووەتەوە : (وأما الكفار فلا يحاسبون محاسبة من توزن حسناته وسيئاته فإنه لا حسنات لهم) واتە : سەبارەت بەکافران، ئەوان لێپرسینەوەی ئەوەیان لەگەڵ ناکرێت ئەو لێپرسینەوەی کە کردەوەی چاکە و خراپە دەپێورێت؛ کردەوەی چاکەیان نییە لەگەڵ خراپەکانیاندا بکێشرێت؛ چونکە هەرچی کردەوەیان هەیە بەهۆی کوفرەوە بەتاڵ بووەتەوە و لەڕۆژی دوایی دا هیچیان بۆ نەماوەتەوە جگە لە خراپە، ولێپرسینەوەیان واتە: ئەوان (تعد أعمالهم فتحصى، فيوقفون عليها، ويقررون بها، ويجزون بها) واتە : هەواڵیان دەدرێتێ لەبارەی کردەوەکانیانەوە و دانی پێدا دەنێن، پاشان سزایان دەدرێت لەسەری ، هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِمَا عَمِلُواْ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ [فصلت : ٥٠] ،واتە: جا خوا هۆشیاریان دەکاتەوەو دەفەرموێ: جا بێگومان ئەوانەی وا بێ بڕوان و ئەو جۆرە قسانەش دەکەن، ئێمە کردارو ڕەفتارە ناشیرینەکانیان لێ ئاگادار دەکەین و بێگومان سزایەک، لە جۆری سزایەکی دژواریان پێ دەچێژین ، وفەرموویەتی: ﴿وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُواْ كَٰفِرِينَ﴾ [الأعراف: ٣٧]واتە: لە دژی خۆیشیان شایەتی دەدەن و دەڵێن: بەڵێ.. لە دونیادا کافرو خوا نەناسبووین ، وفەرموویەتی: ﴿فَٱعْتَرَفُواْ بِذَنۢبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾ [الملك : ١١] واتە: جا بە خەجاڵەتییەوە دانیان بە گوناح و تاوانی خۆیاندا نا ، دەسا دووری لە ڕەحمەتی خوا بۆ دۆزەخییەکان.

## حەوزی پێغەمبەر ﷺ وشێوە و جێگاکەیی

**وَفِي عَرَصَاتِ الْقِيَامَةِ الْحَوضُ الْمَوْرُودُ لِلنَّبِيِّ - ﷺ - ماؤُه أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ، وَأَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ، آنِيَتُهُ عَدَدُ نُجُومِ السَّمَاءِ، طُولُهُ شَهْرٌ، وَعَرْضُهُ شَهْرٌ، مَن يَشْرَبُ مِنْهُ شَرْبَةً؛ لاَ يَظْمَأُ بَعْدَهَا أَبَدًا .**

**لەگۆڕەپانی مەحشەردا حەوزی پێغەمبەر ﷺ هەیە و خەڵك دەچنە سەری: ئاوەكەی لەشیر سپی ترە و، لەهەنگوین شیرین ترە، پەرداخەكانی بەئەندازەی ئەستێرەكانی ئاسمانە، درێژییەكەی مانگە ڕێیەكە و، پانیەكەشی مانگە ڕێیەكە، هەركەسێك یەك جار لێی بخواتەوە؛ هەرگیز دوای ئەوە تینووی نابێت.**

---

### شەرح

٥- یەكێک لەو شتانەی كە لەڕۆژی دوایی دا هەیە حەوزی پێغەمبەرە ﷺ ، شێخ لێرەدا باسی كردووەو شێوەو سیفەتەكەی خستووەتە ڕوو و دەڵێت: (وفي عرصات القيامة الحوض المورود النبي) هەروەك لەپێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە، پێشەوا ئیبنولقەیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت[1]: «**وقد روى أحاديث الحوض أربعون صحابياً وكثير منها أو أكثرها في الصحيح**». واتە: چل هاوەڵ فەرموودەی تایبەت بەحەوزیان گێڕاوەتەوە وزۆرێك یاخود زۆربەیان لەسەحیحن.

پێشتر مانای (**العرصات**)ـمان ڕوونكردەوە.

(الحوض) : لەڕووی زمانەوانیەوە : جێگای كۆبوونەوەی ئاوە ، ئەهلی سوننە و جەماعە كۆدەنگن لەسەر ئیسپاتكرنی حەوز، موعتەزیلە لەمەدا ناكۆكن و دان بەبوونی حەوزدا نانێن و، ئەو دەقانەی كە لەم بارەیەوە هاتوون تەئویل دەكەن و لەمانا

---

(١) بڕوانە: التنبيهات السنية (٢٣٤).

دیارەکەی لایدەدەن، پاشان شێخ باسی شێوەو سیفەتی حەوزەکە دەکات و دەڵێت: (ماؤه أشد بياضاً من اللبن ... )هتد.. واتە: ئاوەکەی لەشیر سپی ترە ، ئەم سیفەتانە لەفەرموودەکاندا سابت بوون، لەوانە فەرموودەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەمر، کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : «**حَوْضِي مَسِيرَةُ شَهْرٍ، وَزَوَايَاهُ سَوَاءٌ، وَمَاؤُهُ أَبْيَضُ مِنَ الوَرَقِ، وَرِيحُهُ أَطْيَبُ مِنَ المِسْكِ، وكِيزَانُهُ كَنُجُومِ السَّمَاءِ، فمَن شَرِبَ منه فلا يَظْمَأُ بَعْدَهُ أَبَدًا**»[١] ، واتە: حەوزەکەم بەئەندازەی مانگە ڕێیە دوور و درێژە، درێژ و پانییەکەی یەکسانە، ئاوەکەی لەشیر سپی ترە و، بۆنەکەی لەمیسك خۆشترە و، پەرداخەکانی بەئەندازەی ئەستێرەکانی ئاسمانە، هەرکەسێك لێی بخواتەوە هەرگیز تینووی نابێت.



(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٦٥٧٩)، ومسلم (٢٢٩٢).

## پردی سیرات و جێگاکەیی و چۆنیەتی تێپەڕبوونی خەڵک بەسەریدا

**وَالصِّرَاطُ مَنْصُوبٌ عَلَى مَتْنِ جَهَنَّمَ، وَهُوَ الْجِسْرُ الَّذِي بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، يَمُرُّ النَّاسُ عَلَيْهِ عَلَى قَدْرِ أَعْمَالِهِمْ، فَمِنْهُمْ مَنْ يَمُرُّ كَلَمْحِ الْبَصَرِ، وَمِنْهُم مَن يَمُرُّ كَالْبَرْقِ، وَمِنْهُم مَن يَمُرُّ كَالرِّيحِ، ومِنْهُم مَن يَمُرُّ كَالْفَرَسِ الْجَوَادِ، وَمِنْهُم مَن يَمُرُّ كَرِكَابِ الإِبِلِ، ومِنْهُم مَن يَعْدُو عَدْوًا، وَمِنْهُم مَن يَمْشِي مَشْيًا، وَمِنْهُم مَن يَزْحَفُ زَحْفًا، وَمَنْهُم مَن يُخْطَفُ خَطْفًا وَيُلْقَى فِي جَهَنَّمَ؛ فَإِنَّ الْجِسرَ عَلَيْهِ كَلاَلِيبُ تَخْطِفُ النَّاسَ بِأَعْمَالِهِم.**

پردی سیرات لەسەر ڕۆخی دۆزەخ دانراوە، ئەو پردەیە، کە لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدایە ، خەڵك بەپێی کردەوەکانیان بەسەریدا تێپەڕ دەبن: هەیان وەك چاوتروکان بەسەریدا تێپەڕ دەبێت و، هەیانە وەك تیشك بەسەریدا تێپەڕ دەبێت و، هەیانە وەك با بەسەریدا تێپەڕ دەبێت و، هەیانە وەك ئەسپێکی تیژڕەو بەسەریدا تێپەڕ دەبێت و، هەیانە وەك وشترسوار بەسەریدا تێپەڕ دەبێت و، هەیانە بەڕاکردن و هەڵبەز ودابەز بەسەریدا تێپەڕ دەبێت و، هەیانە بەقنەخشکێ بەسەریدا تێپەڕ دەبێت و، هەیانە بەهەستان و کەوتن بەسەریدا تێپەڕ دەبێت و، هەیانە ڕادەکێشرێت وفڕێ دەدرێتە نێو دۆزەخەوە، پردەکە چەندان قولابی هەیە بەهۆی کردەوەکانیانەوە خەڵکی دەگرێت و ڕایدەکێشێت.

---

### شەرح

٦- شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەم بەشەدا باس لەو حاڵەتەی ڕۆژی دوایی دەکات کە خەڵك بەسەر پردی سیراتدا تێپەڕ دەبن، و(الصراط) : لەڕووی زمانەوانیەوە : بریتییە لەڕێگایەکی ڕوون و دیار. ولەڕووی شەرعەوە : ئەوەیە کە شێخ

ڕوونی کردووەتەوە بەوتەکەی (وهو الجسر الذي بين الجنة والنار)واتە: بریتییە لەو پردەی کە لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدایە و، جێگای پردەکەی دیاری کردووە بەوەی: (على متن جهنم) واتە: لەسەر پشتی دۆزەخە. پاشان باسی سیفەتی تێپەڕبوونی خەڵك دەکات بەسەریدا بەوەی : (يمر الناس عليه على قدر أعمالهم)واتە: خەڵك بەگوێرەی کردەوەکانیان بەسەریدا تێپەڕ دەبن. کاتی تێپەڕبوونی خەڵك بەسەریدا دوای بەجێهێشتنی گۆڕەپانی مەحشەر و لێپرسینەوەیە، باوەڕداران ڕزگاریان دەبێت لەپردی سیرات و دەچن بەرەو بەهەشت و، کەسانی دۆزەخیش دەکەونە ناویەوە، هەروەکو لەفەرموودەکاندا هاتووە[١].

پاشان شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بەدرێژی باسی لەحاڵی خەڵک لەچۆنیەتی تێپەڕ بوون بەسەر پردی سیراتدا کردووە و، دەڵێت: (فمنهم من يمر كلمح البصر) هتد ، واتە : ئەوان لەسەریعی و لەسەرخۆ تێپەڕ بوون بەسەر پردی سیراتدا بەپێی باوەڕ و کردەوە چاکەکانیانە، ئەوەی پێشتر لەژیانی دونیادا ئەنجامیان داوە، جا بەگوێرەی ئیستیقامەی مرۆڤ لەسەر دینی ئیسلام و جێگیربوونی لەسەری بەسەر پردی سیراتدا تێپەڕ دەبێت، هەرکەسێك جێگیر ودامەزراو بووبێت لەسەر سیراتی مەعنەوی، کە ئیسلامە ئەوا دامەزراو دەبێت لەسەر سیراتی حیسسی ئەوەی کە لەسەر پشتی دۆزەخ دانراوە، ئەوەش لەسیراتی مەعنەوی لایدابێت و پێی خلسکابێ، ئەوا توشی پێ خلسکان و بەربوونەوە دەبێت لەسەر سراتی حیسی.

ووتەکەی کە دەڵێت: (يعدو عدواً) واتە : بەڕاکردن و هەڵبەز و دابەز. ووتەکەی : (يزحف زحفاً) واتە: ڕێدەکات لەسەر سمتەکانی لەبری هەردوو پێیەکانی . ووتەکەی: (عليه كلاليب): جەمعی (کلوب) بەفەتحی کاف و لامی شەددەداری زەممە لەسەر، کە بریتییە لە ئاسنێکی نوک تیژ.

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٧٤٣٩)، ومسلم (١٨٣).

ووتەکەی : (تخطف) بەفەتحی **(الطاء)** و بەکەسریش درووستە و لە**(الخطف)**ـەوە هاتووە، کە بریتییە لە: گرتنی شتێك بەخێرایی.

ووتەکەی : (بأعمالهم) واتە : بەهۆی کردەوەکانیانەوە، جا ڕاکێشانیان لەسەر پردی سیرات بەپێی ڕاکێشانیانە بەهۆی هەواو و ئارەزووەوە و لادانیان لەڕێگای ڕاست .

ئەهلی سوننە و جەماعە باوەڕیان بەپردی سرات هەیە ئەوەی لەسەر پشتی ئاگاری دۆزەخ دانراوە بەپێی ئەو فەرموودە سەحیحانەی کە لەپێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە، وە لەم بابەتەدا قازی عەبدولجەباری موعتەزیلی و زۆربەی شوێنکەوتوانی موخالەفەی ئەهلی سوننەن و دەڵێن: مەبەست لەو سیراتەی باسکراوە: ڕێگای بەهەشتە، ئەوەی کە لەم ئایەتەدا ئاماژەی پێکراوە : ﴿سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ﴾[محمد : ٥] ، واتە: لە دونیاشدا ڕێنماییان دەکات بۆ کاری چاک و هۆکارەکانی بردنە بەهەشت، و کاروباریان بۆ ئاسان دەکاو، حاڵیشیان چاک دەکات. وڕێگای دۆزەخ ، ئەوەی کە لەم ئایەتەدا ئاماژەی پێکراوە : ﴿ فَٱهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْجَحِيمِ ﴾ [الصافات : ٢٣] ، واتە: بەرەو ڕێی دۆزەخ بیانبەن و پێیان پیشان بدەن .

ئەمەش بۆچوونێکی باتڵە و ڕەتکردنەوەی چەندان دەقی صەحیحە بەبێ بەڵگە. وە لێرەدا پێویستە دەقەکان بەپێی ڕووکەشیان مانا بکرێن .

## پردی نێوان بەهەشت و دۆزەخ

**فَمَنْ مَرَّ عَلَى الصِّرَاطِ؛ دَخَلَ الْجَنَّةَ. فَإِذَا عَبَرُوا عَلَيْهِ؛ وَقَفُوا عَلَى قَنْطَرَةٍ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، فَيُقْتَصُّ لِبَعْضِهِم مِن بَعْضٍ، فَإِذَا هُذِّبُوا وَنُقُّوا؛ أُذِنَ لَهُمْ فِي دُخُولِ الْجَنَّةِ.**

**هەرکەسێك بەسەر پردی سیراتدا تێپەڕ ببێت دەچێتە بەهەشتەوە. جا کاتێ کە تێیدەپەڕێنن؛ لەسەر پردێکی نێوان بەهەشت و دۆزەخ ڕادەوەستن، تۆڵە لەهەندێ کەس بۆ هەندێ کەسی تر وەردەگیردرێتەوە، جا کە پاکبوونەوە و پاڵفتەکران؛ ئەوکات ڕێیان پێدەدرێت بەوەی بچنە بەهەشتەوە.**

---

### شەرح

٧- شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)باسی لەشتێک کردووە کە لەڕۆژی دوایی دا ڕوو دەدات، کە ئەویش ڕاگرتن و ڕاوەستانە لەسەر پردی سیرات و دەڵێت: (فمن مر على الصراط) واتە: ئەوەی پردی سیرات تێپەڕێنێت و ڕزگاری بێت لەکەوتنە نێو دۆزەخەوە (دخل الجنة)واتە: دەچێتە بەهەشتەوە؛ چونکە بەڕاستی ئەوەی ڕزگاری بێت لەئاگر جێگای بەهەشتە، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ﴾ [آل عمران: ١٨٥] ، واتە: جا هەرکەسێك ڕزگاری بێت لەئاگر و بخرێتە بەهەشتەوە ئەوا بەدڵنیاییەوە براوەیە، وفەرموویەتی: ﴿فَرِيقٌ فِى ٱلْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِى ٱلسَّعِيرِ ﴾[الشورى : ٧] ، واتە: تاقمێك لەبەهەشتن و تاقمێکیش لەدۆزەخ .

بەڵام پێش چوونە بەهەشت حەتمەن پێویستە ئەو هەق و مافەی، کە لەنێوان باوەڕداراندا هەیە ساف بکرێت و تۆڵەی ماف خوراو بکرێتەوە و کەسی ماف خۆر و

ستەمکار پاکبرێتەوە لەو ستەمانەی کردوونی بەڵکو لەکاتی چوونە بەهەشت لەتەواوترین حاڵ و باردا بن و پاك و دوور بن لەهەر جۆرە ماف و هەقێکی کەسانی تر لەسەریان، ئەمەش ئەوەیە، کە شێخ ئاماژەی پێداوە بەوتەکەی: (فإذا عبروا) واتە: جا کاتێ پردی سیراتیان تێپەڕاند و ڕزگاریان بوو لەکەوتنە نێو دۆزەخ (وقفوا علی قنطرة)واتە: ئەوکات لەسەر قەنتەرەیەك ڕادەوەستێندرێن ، جا (**قنطرة**) : بریتیە لە پرد و هەر جێگا و خانوویەکی بەرز ، و(**القنطرة**) وتراوە : بریتییە لەلێواری سیرات ئەوەی بەلای بەهەشتدایە، و وتراوە: بریتییە لە سیراتێکی تری تایبەت بەباوەڕداران .

(فيُقتَصُّ لبعضهم من بعض) واتە : تۆڵەو قیساس لەنێوانیاندا جێ بەجێ دەکرێت ومافی ماف خوار دەگەڕێندرێتەوە و تۆڵەی بۆ دەکرێتەوە لەو کەسەی کە ستەمی لێکردووە (فإذا هُذِّبوا ونُقُّوا) واتە : کاتێ پاکبوونەوە لەهەق و مافی کەسانی تر و هیچیان لەسەر نەما ئەوکات(أُذِن لهم في دخول الجنة)واتە: ڕێگایان دەدرێت بچنە بەهەشتەوە لەکاتێکدا کە بەتەواوی دڵیان لەئاست یەك پاک بووەتەوە و هیچ ڕق و قینێکیان بەرانبەر یەک نەماوە، هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِى صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ﴾ [الحجر:٤٧] ، واتە: وە هەر قین و قارو دژایەتییەک هەبێت، کە بەهۆی ژیان و ژیواری دونیاوە پەیدا بووبێ لەوێ لە سنگیانی لا دەبەین، واتە: بەسنگێکی پاک و سافەوە، بەدڵێکی خاوێنەوە ، لەبەرامبەر یەکتر بە برایانە لەسەر تەخت دادەنیشن، کە شێوەی دانیشتنی ئاوا باشترین ڕێزو حورمەتە بۆ یەکتر[١] .

---

(١) پێشەوا (بوخاری) ئەم فەرموودەیە دەهێنێت و دەڵێت: «**يَخْلُصُ المُؤْمِنُونَ مِنَ النَّار، فيُحْبَسُونَ علَى قَنْطَرَةٍ بيْنَ الجَنَّةِ والنَّار، فيُقَصُّ لِبَعْضِهِمْ مِن بَعْضٍ مَظالِمُ كانَتْ بيْنَهُمْ في الدُّنْيا، حتَّى إذا هُذِّبُوا ونُقُّوا أُذِنَ لهمْ في دُخُولِ الجَنَّةِ..** » صحيح البخاري، كتاب الرقاق، باب القصاص يوم القيامة، حديث: ٦١٧٩. واتە: موسڵمانەکان لە ئاگر رزگاریان دەبێ، ئینجا لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا ڕادەگیردرێن، هەر هەقێکیان بەسەر یەکترەوە هەبێت بۆیان جێبەجێ دەکرێت، =

## یەکەم کەس کە دەرگای بەهەشت دەکاتەوە و، یەکەم کەس کە دەچێتە ناوی و، تکاو شەفاعەتەکانی پێغەمبەر ﷺ

أَوَّلُ مَن يَسْتَفْتِحُ بَابَ الْجَنَّةِ النبيُّ مُحَمَّدٌ ـ ﷺ ـ وَأَوَّلُ مَن يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنَ الأُمَمِ أُمَّتُهُ.

وَلَه ـ ﷺ ـ في الْقِيَامَةِ ثَلاثُ شَفَاعَاتٍ: أَمَّا الشَّفَاعَةُ الأُولَى؛ فَيَشفَعُ فِيَ أَهْلِ الْمَوْقِفِ حَتَّى يُقْضَى بَيْنَهُمْ بَعْدَ أَنْ يَتَرَاجَعَ الأَنْبِيَاءُ؛ آدَمُ، وَنُوحٌ، وَإِبْرَاهِيمُ، وَمُوسَى، وَعِيسى ابْنُ مَرْيَمَ عَنِ الشَّفَاعَةِ حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَيْه. وَأَمَّا الشَّفَاعَةُ الثَّانِيَةُ؛ فَيَشْفَعُ فِي أَهْلِ الْجَنَّةِ أَن يَدْخُلُوا الْجَنَّةَ. وَهَاتَانَ الشَّفَاعَتَان خَاصَّتَانِ لَهُ. وَأَمَّا الشَّفَاعَةُ الثَّالِثَةُ؛ فَيَشْفَعُ فِيمَنِ اسْتَحَقَّ النَّارَ، وَهَذه الشَّفَاعَةُ لَهُ وَلِسَائِرِ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَغَيْرِهِمْ، فَيَشْفَعُ فِيمَنِ اسْتَحَقَّ النَّارَ أَن لاَّ يَدْخُلَهَا، وَيَشْفَعُ فِيمَنْ دَخَلَهَا أَن يَخْرُجَ مِنْهَا[1] .

یەکەم کەس کە دەرگای بەهەشت دەکاتەوە موحەممەدە ﷺ ویەکەم گەل و ئوممەت کە دەچێتە بەهەشتەوە ئومەتەکەیەتی، پێغەمبەر ﷺ لەڕۆژی دوایی دا سێ جۆر تکا و شەفاعەتی هەیە:

هەرچی تکا و شەفاعەتی یەکەمە: شەفاعەت دەکات بۆ خەڵک لەساحەی مەحشەردا بۆ ئەوەی دادوەری لەنێوانیاندا بکرێت ئەمە دوای ئەوەی، کە هەموو پێغەمبەرانی تر باشکە دەکەن لەم شەفاعەتە و توانای کردنیان نابێت کە ئەوانیش: (ئادەم، ونوح، وئیبراهیم، وموسا، وعیسای کوڕی مەریەم)، جا کاتێ کە هیچ یەکێك لەمانە شەفاعەت ناکەن، خەڵکەکە دەچنە لای پێغەمبەر موحەممەد ﷺ.

---

= ئەوسا بەپاک و خاوێنی و بێ ڕک و کینە گشت دەچنە بەهەشتەوە دوای ئیزندان پێیان. (تەفسیری ڕامان).

(١) كما ورد في حديثالشفاعة عند البخاري (٣٣٤٠) ومسلم (١٩٤).

**هەرچی شەفاعەتی دووەمیشە: شەفاعەت دەکات بۆ بەهەشتیەکان بۆ ئەوەی بچنە بەهەشتەوە، ئا ئەم دوو جۆرە لەشەفاعەت تایبەتن بە پێغەمبەر موحەممەد ﷺ.**

**هەرچی شەفاعەتی سێیەمیشە:**

**شەفاعەت دەکات بۆ ئەو کەسانەی کە موستەهەقی چوونە دۆزەخن، ئەم جۆرە لەشەفاعەت بۆ ئەو و گشت پێغەمبەرانی تر و ڕاستگۆیان و کەسانی تریشە: شەفاعەت دەکات بۆ ئەو کەسانەی، کە موستەهەقی چوونە دۆزەخن بۆ ئەوەی نەچنە دۆزەخ و ڕزگاریان بێت لێی، هەروەها شەفاعەت دەکات بۆ ئەو کەسانەی، کە چوونەتە دۆزەخ بەڵکو ڕزگاریان بێت لێی و دەربهێندرێن.**

---

## شەرح

٨- لێرەدا شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) باس لەسەرەنجامی باوەڕداران دەکات لەڕۆژی دواییدا دوای ئەوەی ئەو حاڵەتانە تێپەڕ دەکەن کە پێشتر باسی گرنگترینیانمان کرد و، دەڵێت: (**فإذا هُذِّبوا ونُقُّوا أُذن لهم في دخول الجنة**)واتە: دوای ئەوەی پاك و پاڵفتەکران ڕێگەیان دەدرێت بۆ چوونە بەهەشت، چونکە ناتوانن بچنە بەهەشتەوە مەگەر دوای مۆڵەتی خودا نەبێت و داوا کردن بۆ کردنەوەی دەرگاکانی (**وأول من يستفتح باب الجنة محمد**)واتە: یەکەم کەس کە دەرگای بەهەشت دەکاتەوە موحەممەدە ﷺ، هەروەکو لەفەرموودە سەحیحەکەدا هاتووە [١] ، ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : «**آتي بابَ الجَنَّة يَومَ القِيامَة فأسْتفْتِحُ، فيَقولُ الخازِنُ: مَن أنْتَ؟ فأقُولُ: مُحَمَّدٌ، فيَقولُ: بكَ أُمِرْتُ لا أفْتَحُ لأَحَدٍ قَبْلَكَ**»،واتە: لەڕۆژی دوایی دا دەچمە بەر دەرگای بەهەشت و

---

(١) صحيح مسلم (١٩٧).

داوای کردنەوەی دەکەم، دەرگاوانەکە دەڵێت: تۆ کێیت؟ دەڵێم: موحەممەد، دەڵێت: فەرمانم پێکراوە بۆ تۆی بکەمەوە و پێش تۆ بۆ هیچ کەسێکی نەکەمەوە. و(**الاستفتاح**) : داوای کردنەوەیە، ئەمەش بەدیارخستنی ڕێز و فەزڵ و پێگەی پێغەمبەرە ﷺ .

(وأول من يدخلها من الأمم أمته)واتە: ویەکەم گەل لەناو گەلاندا، کە دەچێتە بەهەشتەوە گەلەکەی پێغەمبەرە ﷺ؛ ئەوەش لەبەر ڕێز و فەزڵی بەسەر هەموو گەلاندا.

**بەڵگەی ئەوەش:**

فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە، کە پێشەوا موسلیم ڕیوایەتی کردووە و دەفەرموێت : «**ونحن أول من يدخل الجنة**»واتە: وئێمە یەکەم کەسین کە دەچینە بەهەشتەوە.

ووتەکەی: (وله ﷺ في القيامة ثلاث شفاعات) ،واتە: لەڕۆژی دوایی دا سێ شەفاعەتی هەیە، و(**الشفاعات**): جەمعی(**شفاعة**) ، و(**الشفاعة**) : لەڕووی زمانەوانیەوە: ئامراز و وەسیلە و هۆکارە. وە لە ڕووی عورفیشەوە: (**سؤال الخير للغير**)واتە: داواکرنی خێر و شتی باشە بۆ کەسانی تر، وە لە جووت(**الشفع**)ـەوە وەرگیراوە کە پێچەوانەی تاك (**الوتر**)ـە . کەسی تکاکار (**الشافع**) تکا و داوای خۆی دەخاتە پاڵ کەسی تکا بۆکراو (**المشفوع له**) دوای ئەوەی کە تەنهایە.

ووتەکەی شێخ(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) : (وله ﷺ في القيامة ثلاث شفاعات) واتە: لەڕۆژی دوایی دا سێ شەفاعەتی هەیە، ئەمەش ڕوونکردنەوەی ئەو شەفاعەتانەیە کە پێغەمبەر ﷺ لەڕۆژی دوایی دا لەسەر ئیزن و مۆڵەتدانی خودا دەیکات. بەم شێوەیە لێرەدا شێخ بەکورتی باسی لەجۆری شەفاعەتەکان کرد، بەڵام گەر وردی بکەینەوە لەڕاستی دا شەفاعەت هەشت جۆری هەیە[١] :

---

(١) بروانە: مجموع الفتـاوى (٣/ ١٣٢)، وشرح العقيـدة الطحاويـة (٢٥٣)، والتنبيهـات السـنية (٢٣٨).

هەیەتی تایبەتە بە پێغەمبەر ﷺ ، وهەشە بۆ پێغەمبەر ﷺ وجگە لەویشە.

**تکاو شەفاعەتی یەکەم:** شەفاعەتە گەورەکە ـ کە ئەویش: **(المقام المحمود)**ـە ـ ئەمە ئەو شەفاعەتەیە، کە پێغەمبەر ﷺ دەیکات بۆ ئەوەی خەڵکی مەحشەر ڕزگاریان بێت لەناخۆشی و ناڕەحەتی وەستان لەساحەی مەحشەر و لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکرێت، دوای ڕاوەستان بۆ ماوەیەکی زۆر و داوا کردنیان لەپێغەمبەران، بەڵکو لای خودا تکایان بۆ بکەن و لەو مەوقیف و بارودۆخە ناڕەحەتە ڕزگاریان ببێت، جا دوای ئەوەی کە هەموو پێغەمبەران ئەو داوایە ڕەتدەکەنەوە پێغەمبەری خۆمان ﷺ لەسەر ئیزن و ڕێپێدانی خودا بەو کارە گەورەیە هەڵدەستێت .

**تکاو شەفاعەتی دووەم:** تکاو شەفاعەتەکەی بۆ چوونە بەهەشتی بەهەشتیەکان دوای تەواوبوونی هەق و حیساب و لێپرسینەوە لێیان.

**تکاو شەفاعەتی سێیەم:** تکاو شەفاعەتەکەی بۆ مامی ئەبو طالیب، بەوەی خودا سزای لەسەر سوك بکات، ئەمەشیان تایبەتە بەوەوە؛ چونکە خودا ڕایگەیاندووە، کە کەسی کافر و بێباوەڕ تکاو شەفاعەتی شەفاعەت کاران سوودی پێناگەیەنێت، پێغەمبەرمان هەواڵی داوە بەوەی شەفاعەتەکەی ئەو تایبەتە بەئەهلی تەوحید و، شەفاعەت کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مامی تایبەتە بەو و تایبەتیشە بەئەبو تالیب ، جا ئەم سێ جۆرە لەشەفاعەت تایبەتە بە پێغەمبەری خۆمان ﷺ .

**تکاو شەفاعەتی چوارەم:** تکاو شەفاعەتی بۆ ئەو کەسە تاوانبارە موحیدانەیە کە شایستەی چوونە دۆزەخن لەپێناو ئەوەی نەچنە دۆزەخ .

**تکاو شەفاعەتی پێنجەم:** تکاو شەفاعەتی بۆ ئەو کەسە تاوانبارە موحیدانەیە، کە چوونەتە دۆزەخ، لەپێناو ئەوەی دەربهێنرێن لەدۆزەخ .

**تکاو شەفاعەتی شەشەم:** تکاو شەفاعەتی بۆ بەرزکردنەوەی پلەی هەندێ لەئەهلی بەهەشت.

**تکاو شەفاعەتی حەوتەم:** تکاو شەفاعەتی بۆ ئەو کەسانەی کە چاکە و خراپەیان بەرانبەرە، لەپێناو ئەوەی بخرێنە بەهەشتەوە، ئەوانیش ئەو کەسانەن کە پێیان دەوترێت ئەهلی ئەعراف.

**تکاو شەفاعەتی هەشتەم:** تکاو شەفاعەتی بۆ هەندێ لەباوەڕداران بۆ چوونە بەهەشت بەبێ هیچ لێپرسینەوە و سزایەك، وەکو شەفاعەتەکەی بۆ عوکاشەی کوڕی میحصەن (خوا لێی ڕازی بێت)، ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ بۆی پاڕایەوە بەڵکو لەو حەفتا هەزار کەسە بێت کە دەچنە بەهەشتەوە بەبێ هیچ لێپرسینەوە و سزایەك .

ئا ئەم پێنج جۆرە شەفاعەتەی ترە کەسانی تریش لەپێغەمبەران وفریشتە و ڕاستگۆیان وشەهیدان لەگەڵ پێغەمبەری خۆماندا ﷺ دەیکەن و هاوبەشن تێیدا.

ئەهلی سوننە و جەماعە باوەڕیان بەهەموو ئەم جۆرە لەشەفاعەتانە هەیە لەبەر صەحیحی و سابت بوونی بەڵگەکانیان، شایەنی باسە ئەم شەفاعەتانەش نایەنە دی بەدوو مەرج نەبێت :

**مەرجی یەکەم :** مۆڵەتدانی خودا بە تکاکار و شافیع بەوەی تکا و شەفاعەت بکات، هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ٱلۡأَرۡضِۗ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦ﴾ [البقرة : ٢٥٥] ، واتە: ئەوە کێیە تکاو شەفاعەت دەکات لەلای خودا ئیللا بەمۆڵەت و ئیزنی خودا خۆی نەبێت ، وفەرموویەتی: ﴿مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ إِذۡنِهِۦۚ﴾ [یونس : ٣] ، واتە: هیچ تکاکار و شافیعێك نییە ئیللا دوای مۆڵەتدانی خودا نەبێت .

**مەرجی دووەم:** ڕازی بوون خودا لە کەسی تکا بۆکراو(**المشفوع له**)هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ﴾ [الأنبياء : ٢٨] ، واتە: تکاو شەفاعەت ناکەن مەگەر بۆ ئەوە نەبێت، کە خودا لێی ڕازییە.

ئەم فەرمایشتەی خودا هەردوو مەرجەکەی لەخۆ گرتووە: ﴿ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِي شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ ﴾ [النجم:٢٦] ، واتە: چەندان فریشتە هەن لەئاسمانەکاندا تکاکەیان هیچ سوودێکی نییە تەنها دوای ئەوە نەبێت، کە خودا مۆڵەت بدات بۆ ئەوەی، کە خۆی ئەیەوێت و لێی ڕازییە.

بەڵام موعتەزیلەکان بۆچوونی جیاوازیان هەیە و پێچەوانەی ئەهلی سوننەن لەبارەی تکاو شەفاعەت کردن بۆ کەسێکی باوەڕدار، کە تاوانی گەورەی ئەنجام دابێت و شایستەی دۆزەخ بێت، بەوەی نەچێتە دۆزەخ و بۆ ئەوانەش، کە چوونەتە دۆزەخ بۆ ئەوەی دەربهێندرێن، واتە: لەجۆری پێنجەم و شەشەم دا موخالەفەی ئەهلی سوننەیان کردووە و، بیانوویانیش ئەم فەرمایشتەی خودایە: ﴿ فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴾ [المدثر : ٤٨] ، واتە: تکاو شەفاعەتی شەفاعەت کاران سوودیان پێ ناگەیەنێت .

وەڵامی ئەوەش ئەوەیە ئەو ئایەتە باسی کافران دەکات و ئەوە کافرە تکاو شەفاعەتی هیچ کەسێك سوودی پێناگەیەنێت. بەڵام باوەڕداران تکاو شەفاعەت سوودیان پێدەگەیەنێت بە شەرت و مەرجی خۆی .

دواتر تاقم و گروپەکان لەبابەتی شەفاعەتدا بوونەتە سێ تاقم و گروپەوە:

**تاقمی یەکەم** : زێدەڕۆییان کردووە لەئیسپاتکردنی شەفاعەتدا، کە ئەوانیش نەسرانی و سۆفیە زێدەڕەو و گۆڕپەرستەکانن، بەشێوەیەك شەفاعەتی ئەو کەسانەی، کە خۆیان بەگەورەی دەزانن قیاس کردووەتە سەر ئەو تکاو شەفاعەت و واستەیەیی، کە لەدونیادا هەیە و لەلای دەسەڵات و مەلیکەکان دەکرێن، ئەمان داوای شەفاعەت لەغەیری خودا دەکەن، هەروەکو خوای پەروەردگار باسی لێوە کردووە لەبارەی هاوبەشدانەرەکانەوە .

**تاقمی دووەم :** موعتەزیلە و خەواریجەکانە، ئەم دوو تاقمە بەپێچەوانەی تاقمی یەکەم زێدەڕۆییان کردووە لەنەفی شەفاعەتدا بەشێوەیەک شەفاعەتی پێغەمبەر و جگە لەویش ڕەتدەکەنەوە بۆ ئەوانەی، کە تاوانی گەورەیان ئەنجام داوە و پێیان وایە کەس ناتوانێت شەفاعەتیان بۆ بکات.

**تاقمی سێیەم:** ئەهلی سوننەو جەماعەیە ئەم تاقمە دان بە هەموو ئەو شەفاعەتانەدا دەنێن کە بەبەڵگەی قورئان و فەرموودە سابت بووە و، شەفاعەت ئیسپات دەکەن بەو شەرت و مەرجانەی، کە هەیەتی و لەدەقەکاندا باسکراوە.



## دەرکردنی هەندێ لەتاوانباران لەدۆزەخ بەڕەحم و بەزەیی خودا بەبێ هیچ تکاو شەفاعەتێک و فراوانی بەهەشت

وَيُخْرِجُ اللهُ مِنَ النَّارِ أَقْوَامًا بِغَيْرِ شَفَاعَةٍ؛ بَلْ بِفَضْلِهِ وَرَحْمَتِهِ، وَيَبْقَى فِي الْجَنَّةِ فَضْلٌ عَمَّنْ دَخَلَهَا مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا، فَيُنْشِئُ اللهُ لَهَا أَقْوَامًا فَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ.

وَأَصْنَافُ مَا تَضَمَّنَتْهُ الدَّارُ الآخِرَةُ مِنَ الْحِسَابِ وَالثَّوَابِ وَالْعِقَابِ وَالْجَنَّةِ وَالنَّارِ وَتَفَاصِيلُ ذَلِكَ مَذْكُورَةٌ فِي الْكُتُبِ الْمُنَزَّلَةِ مِنَ السَّمَاءِ، وَالآثَارِ مِنَ الْعِلْمِ الْمَأْثُورِ عَنِ الأَنْبِيَاءِ، وَفِي الْعِلْمِ الْمَوْرُوثِ عَنْ مُحَمَّدٍ ـ ﷺ ـ مِنْ ذَلِكَ مَا يَشْفِي وَيَكْفِي، فَمَنِ ابْتَغَاهُ وَجَدَهُ.

خوای پەروەردگار کۆمەڵە کەسانێك لەئاگری دۆزەخ دەردێنێت بەبێ هیچ تکاو شەفاعەتێك؛ بەڵکو تەنها بەڕەحم و فەزڵ وبەزەیی خۆی، لەبەهەشتدا هەندێ جێگا دەمێنێتەوە دوای چوونە بەهەشتی خەڵکانی دونیا، خوای پەروەردگار کۆمەڵە کەسانێکی بۆ درووست دەکات و دەیانکاتە بەهەشتەوە.

جۆری ئەو شتانەی کە ژیانی دواڕۆژلەخۆی گرتووە وەك لێپرسینەوە و سزا و پاداشت و بەهەشت و دۆزەخ و درێژەی ئەمانە لەو کتێبانەدا باسکراوە، کە لەئاسمانەوە دابەزیوە، ئەو ئەسەرانەش، کە لەپێغەمبەرانەوە هاتوون لە عیلم وزانیاری لەم بارەیەوە، ئەو زانست وزانیارانەی کە لە پێغەمبەر موحەممەدەوە ﷺ بەجێماوە کە کافی و بەسە، جا بۆیە هەرکەسێك بەشوێنیدا بگەڕێت دەستی دەکەوێت.




٩ـ دوای ئەوەی شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) باسی جۆرەکانی شەفاعەتی کرد ئەوەی، کە مۆڵەتی دەدرێت بەدەرهێنانی هەندێ لەوانەی چوونەتە نێو دۆزەخەوە ـ

لێرەدا باسی لەوە کردووە : دەرچوون لەناو ئاگر هۆکاری تریشی هەیە جگە لەشەفاعەت، کە ئەویش: ڕەحم و بەزەیی و فەزڵ وچاکەی خودایە بەشێوەیەك کەسانی موحید و یەکخوا پەرست لەئاگر دەردێنێت ئەوەی کە بەئەندازەی دەنکە خەرتەلەیەك باوەڕ لەدڵی دا هەبێت .

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾[النساء :٤٨] ، واتە: بەهیچ شێوەیەك خودا خۆش نابێت لەوەی هاوبەشی بۆ دابنرێت و جگە لەوە لەهەر تاوانێك ویستی لەسەر بێت خۆش دەبێت بۆ کەسێك کە ویستی لەسەرە.

هەروەها لەفەرموودەیەکی صەحیح دا هاتووە[1]: «**يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ : شَفَعَتْ الْمَلَائِكَةُ وَشَفَعَ النَّبِيُّونَ ، وَشَفَعَ الْمُؤْمِنُونَ وَلَمْ يَبْقَ إِلَّا أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ، فَيَقْبِضُ قَبْضَةً مِنْ النَّارِ فَيُخْرِجُ مِنْهَا قَوْمًا لَمْ يَعْمَلُوا خَيْرًا قَطُّ...**» الحديث .واتە: خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: فریشتەکان شەفاعەتیان کرد و پێغەمبەران شەفاعەتیان کرد و، کەس نەماوە جگە لەبەبەزەییترین کەسەکان، چنگێك دەکات بەدۆزەخ دا و کەسانێکی لێ دەردێنێت، کە هیچ خێر و چاکەیەکیان نەکردووە .

ووتەکەی : (ويبقى في الجنة فضل) واتە : جێگایەك لەبەهەشتدا دەمێنێتەوە (عمن دخلها من أهل الدنيا) واتە: دوای ئەوەی خەڵکانی دونیا تێی چوون و چوونە جێگاکانی خۆیان؛ لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار وەسفی بەهەشتی بەفراوان کردووە و فەرموویەتی : ﴿ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ ﴾ [آل عمران : ١٣٣] واتە: بەهەشتێکە پانتاییەکەی بەئەندازەی فراوانی ئاسمانەکان و زەویە. (فينشيء الله) واتە: درووستی دەکات و بەدیدەهێنێت (أقواماً) واتە : کۆمەڵە کەسانێك (فيدخلهم الجنة) بەفەزڵ و ڕەحمی خۆی دەیانخاتە بەهەشتەوە؛ چونکە بەهەشت گوازرشتە

(١) متفق عليه : أخرجه البخاري (٧٤٣٩) ، ومسلم (١٨٣) .

لەڕەحمەت و بەزەیی خودا وبەبەهەشت ڕەحم بەهەرکەسێك دەکات، کە بیەوێت، بەڵام دۆزەخ سزای هیچ کەسێکی تێدا نادرێت، مەگەر کەسانێك، کە ئیقامە حوججە کراون و بەڵگەکانیان بۆ ڕوونکراوەتەوە بەو حاڵەشەوە پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستووەتەوە.

ووتەکەی : (وأصناف ما تضمنته الدار الآخرة . . .) هتد..واتە: جۆری ئەو شتانەی، کە ڕۆژی دوایی لەخۆی گرتووە و تێیدا ڕوو دەدا . . دوای ئەوەی شێخ باسی حاڵ و باری ڕۆژی دوایی کرد و ئەوەش کە تێیدا ڕوو دەدات، پاشان ئاماژە بەوە دەکات، بۆ زانیای زیاتر بچن تەماشای قورئان و سوننە بکەن؛ چونکە ئەم شتانە پەیوەستن بەعیلم و زانستی غەیب ونادیار، ئەوەی کە ناتوانرێت پەی پێببرێت مەگەر لەڕێگەی نیگا (وەحیە)وە نەبێت.



## باوەڕبوون بەقەزاو قەدەر و ڕوونکردنەوەی بابەتە پەیوەستدارەکان پێی

**وَتُؤْمِنُ الْفِرْقَةُ النَّاجِيَةُ مِنْ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ. وَالإِيمَانُ بِالْقَدَرِ عَلَى دَرَجَتَينِ؛ كُلُّ دَرَجَةٍ تَتَضَمَّنُ شَيْئَيْنِ.**

**کۆمەڵەی ڕزگاربوو لە ئەهلی سوننە وجەماعە باوەڕیان بەقەدەر هەیە بەخێر و شەڕیەوە. وە باوەڕبوون بەقەدەر دوو پلە وبەشە، هەریەك لەو دوو پلەیەش دوو شتی لەخۆگرتووە.**

---

شەرح

(القدر) : مەصدەری (قَدَرْتُ الشيء إذا أحطت بمقداره)واتە: ئەندازەگیری شتەکەم کرد کاتێ کەپەیم برد بەئەندازە و بڕەکەی و، لێرەدا مەبەست لێی: پەیوەست بوونی عیلم و زانستی خودایە بە کائینات و بوونەوەرە و ویست و ئیرادەی لەمێژینەی بۆ شتەکان پێش هاتنە بوونیان. هیچ ڕوداوێك نییە ئیللا خودا تەقدیری کردووە ، واتە : پێشتر زانیاری لەبارەوە هەبووە و ویستی لەسەر بووە ، و(الإيمان بالقدر)واتە: باوەڕهێنان بەقەدەر، یەکێکە لەشەش پایەکەی باوەڕ، کە ئەویش باوەڕبوونە بەقەدەر بەخێر و شەڕیەوە .

هەروەها وتەکەی شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) : (وتؤمن الفرقة الناجية - أهل السنة والجماعة - بالقدر خيره وشره) واتە: کۆمەڵەی ڕزگار بوو ـ ئەهلی سوننەت و جەماعەت ـ باوەڕیان بەقەدەر هێناوە بەخێرو شەڕیەوە ، ئاماژەیە بەوەی هەرکەسێك باوەڕی بەقەدەر نەبێت ئەوا ئەهلی سوننە وجەماعە نییە، ئەوەش موقتەزاو خوازەری

دەقەکانە، هەروەك لەفەرموودەکەی جبریل دا هاتووە[١] کاتێ پرسیاری لەپێغەمبەر ﷺ کرد لەبارەی ئیمانەوە : فەرمووی «**الإيمانُ أن تُؤمِنَ باللهِ وملائكتِه وكتبِه ورسلِه واليوم الآخر والقدرِ خيرِه وشرِّه**»،واتە: باوەڕ بریتییە لەوەی باوەڕ بێنی بەخودا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی، وبەڕۆژی دوایی ، وبەقەزاو قەدەر بەخێر وشەڕیەوە. وەک دیارە باوەڕبوون بەقەدەر پایەیی شەشەمی باوەڕە، بۆیە هەرکەسێك نکۆڵی لێبکات ئەوا باوەڕدار نییە، هەروەکو چۆن باوەڕی بەهەر پایەیەکی تریش نەبێت لەپایەکانی باوەڕ .

هەروەها ووتەکەی : (والإيمان بالقدر على درجتين ...) هتد ، لێرەدا شێخ باسی لەوە کردووە باوەڕبوون بەقەدەر چوار پلە لەخۆ دەگرێت، بەکورتی بریتییە لە[٢] :

**یەکەم :** عیلم وزانستی ئەزەلی و لەمێژینەی خودا بەهەموو شتێك و، لەوانە عیلم و زانستی خودا بەکار و کردەوەی بەندەکان پێش ئەوەی ئەنجامی بدەن .

**دووەم :** نووسینی ئەوە لە لەوحولمەحفوزدا .

**سێیەم :** ویستە گشتگیرەکەی خودا و توانا تەواوەکەی بەسەر هەموو ڕووداوێکدا .

**چوارەم:** هێنانەبوونی هەموو بەدیهێنراوەکان لەلایەن خوداوە، ئەو دروستکار(خالیق) و بەدیهێنەری هەموو دروستکراوەکانە و، هەر ئەو دروستکار(خالیق) و بەدیهێنەرە و جگە لەو دروستکراو(مەخلوق) و بەدیهێنراوە، ئا ئەمە پوختەی پلەو مەرتەبەی قەدەرە، فەرموو با بەدوور درێژی بێینە سەری:

⊶ ❦❦❦ ⊷

---

(١) أخرجه مسلم (٩).
(٢) معارج القبول (١٠٨٦).

## درێژەی پلەو مەرتەبەکانی قەدەر

## [ئـ] پلەی یەکەم و ئەوەی لەخۆی گرتووە

فَالدَّرَجَةُ الأُولَى: الإيمَانُ بِأَنَّ اللهَ تَعَالَى عَلِيمٌ بِالْخَلْقِ، وَهُمْ عَامِلُونَ بِعِلْمِهِ الْقَدِيمِ الَّذِي هُوَ مَوْصُوفٌ بِهِ أَزَلاً وَأَبَدًا، وَعَلِمَ جَمِيعَ أَحْوَالِهِم مِّنَ الطَّاعَاتِ وَالْمَعَاصِي وَالأَرْزَاقِ وَالآجَالِ، ثُمَّ كَتَبَ اللهُ فِي اللَّوْحِ الْمَحْفُوظِ مَقَادِيرَ الْخَلْقِ. فَأَوَّلُ مَا خَلَقَ اللهُ الْقَلَمَ قَالَ لَهُ: اكْتُبْ. قَالَ: مَا أَكْتُبُ؟ قَالَ: اكْتُبْ مَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. فَمَا أَصَابَ الإِنْسَانَ لَمْ يَكُن لِّيُخْطِئَهُ، وَمَا أَخْطَأَهُ لَمْ يَكُن لِّيُصِيبَهُ، جَفَّتِ الأَقْلاَمُ، وَطُوِيَتِ الصُّحُفُ؛ كَمَا قَالَ تَعَالَى: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِۗ إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَٰبٍۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ٧٠﴾ [الحج: ٧٠]،

پلەی یەکەم: باوەڕبوون بەوەی خودا زانایە بەوەی خەڵك ئەنجامی دەدەن بەزانستە قەدیم و لەمێژینەکەی، کە وەسفکراوە پێی لە ئەزەل و بۆ هەتا هەتایە، هەموو حاڵ و بارەکانیان دەزانێت لەتاعەت و تاوان و ڕۆزی و ئەجەل، پاشان خوای پەروەردگار لەلەوحولمەحفوزدا ئەندازەی هەموو درووستکراوەکانی نووسیووە.

یەکەم شتێك، کە خودا درووستی کرد: قەڵەم بوو و، پێی فەرموو: (بنووسە) ، گوتی : (چی بنووسم؟) فەرمووی: (هەموو ئەو شتانە بنووسە، کە ڕوو دەدەن، تاوەکو ڕۆژی دوایی). ئەوەی توشی مرۆڤ دەبێت نەدەبوو توشی نەبێت و بەهەڵەدا بچێت و توشی کەسێکی تر بێت و، ئەوەش کە توشی نەبووە نەدەبوو بەهەڵەدا بچێت و توشی ببێت، مەرکەبی قەڵەمەکان وشك بوونەتەوە و، نامەکەش پێچراوەتەوە، هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (مەگەر تۆ نەتزانیوە ئەی مرۆڤی ژیر! کە هەرچی لەئاسمان و زەوییدایە خوا ئاگای لێیەتیی و دەیزانێ؟ جا کەواتە هەر ئەویش بەتەنها خۆی بەئاگایە لەوشتانەدا ئێوە ئیختیلاف وڕاجیاییتان تان تێیدا هەیە. چونکە

بەڕاستیی هەموو ئەو شتانە لە نامەی (لوح المحفوظ)دا تۆمار کراوەو «هیچی لێ زایە نابێت» ، بێگومان ئەو کارەش بۆ خوا زۆر ئاسانە) [١] .

وقَالَ ﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴾ [الحديد:٢٢]، وَهَذَا التَّقْدِيرُ التَّابِعُ لِعِلْمِهِ سُبْحَانَهُ يَكُونُ فِي مَوَاضِعَ جُمْلَةً وَتَفْصِيلاً: فَقَدْ كَتَبَ فِي اللَّوْحِ الْمَحْفُوظِ مَا شَاءَ. وَإِذَا خَلَقَ جَسَدَ الْجَنِينِ قَبْلَ نَفْخِ الرُّوحِ فِيهِ؛ بَعَثَ إِلَيْهِ مَلَكًا، فَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ، فَيُقَالُ لَهُ: اكْتُبْ: رِزْقَهُ، وَأَجَلَهُ، وَعَمَلَهُ، وَشَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ.. وَنَحْوَ ذَلِكَ.فَهَذَا التَّقْدِيرُ قَدْ كَانَ يُنْكِرُهُ غُلاةُ الْقَدَرِيَّةِ قَدِيمًا، وَمُنْكِرُهُ الْيَوْمَ قَلِيلٌ.

هەروەها فەرموویەتی: ( هیچ بەڵاو نەهامەتیەکتان تووش نابێت نە لەزەویدا - وەک قات و قڕیی.. هتد - وە نە لە خۆشتاندا - وەک نەخۆشیی و مردن- مەگەر پێش ئەوە بەدی بێنین لە (لوح المحفوظ)دا تۆمار کراوە، واتە: هەرچی ڕوویداو پێش بێت، ئێمە پێش ئەوە تۆمارمانکردووەو ئاگادارین لیی، بەڕاستی ئەوەش بۆ خوا شتێکی ئاسانە) .

جا ئەم ئەندازەگیریەیی، کە تابیعی عیلم و زانستەکەیەتی ـ سبحانە وتعالی ـ لەهەندێ شوێندا بەکورتی و گشتی هاتووە و لەهەندێ جێگەی تردا بەتایبەت و دوور ودرێژی هاتووە: لەلەوحولمەحفوزدا ئەوەی ویستی لەسەر بووبێت نووسیویەتی و، کاتێ کە لاشەی کۆرپە درووستدەکات، پێش ئەوەی ڕوح بکرێت بەبەریدا؛ فریشتەیەك دەنێرێت بۆلای، فەرمانی پێدەکرێت بەچوار وشە، دەوترێت: (ڕۆزی و، ئەجەل و، کردەوەکەی بنووسە و ئایا خراپ وبەدبەختە یاخود چاک و

---

(١) ئەم فەرموودەیەش دەسەڵاتی فراوانی خوا ڕادەگەیەنێ: «كَتَبَ اللهُ مَقَادِيرَ الخَلائِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَوَاتِ وَالأرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، قالَ: وَعَرْشُهُ علَى المَاءِ» صحيح مسلم، كتاب القدر، باب حجاج آدم وموسى عليهما السلام، حديث: ٤٩٠٣. واتە: بێگومان خوا پێش دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویی بە پەنجا هەزار ساڵ، ئەندازەگیری هەموو دروستکراوەکانی نووسی و، عەرشەکەشی بەسەر ئاوەوە بوو.

**خۆشبەخت)وهاوشێوەی ئەمانە. وە غولاتی قەدەرییەکان لەکۆندا نکۆڵیان لەم قەدەرە دەکرد، بەڵام لەمڕۆدا ئەوانەی نکۆڵی لێ دەکەن کەمن.**

---

## شەرح

ووتەکەی : (أزلا) وشەی(**الأزل**) لەپێشینەییەك، کە هیچ سەرەتایەکی نییە. وتەکەی : (أبدأ) وشەی(**الأبد**) بریتیە: لەبەردەوام بوونێك لەداهاتوودا، کە هیچ نیهایەت و کۆتاییەکی نییە .

و(الطاعات) : جەمعی (**طاعة**)یە و، بریتیە لەفەرمانبەرداری . و(المعاصي) : جەمعی(**معصية**)، کە بریتیە لە لەفەرمان دەرچوون، و(الأرزاق) : جەمعی(**رزق**)ـە و، ئەوەیە کە سوود بەخشە. و(الآجال) : جەمعی (**أجل**)ـە و، بریتییە لەماوە ومووددەی شتەکان و، ئەجەلی مرۆڤ کۆتایی کاتەکەیەتی لەدونیادا بەمردن . و(اللوح المحفوظ)بریتیە لەتۆمارە گەورەکە کە بە(**أم الكتاب**)ناسراوە، و پارێزراوە (محفوظ) لەبۆ زیادکردن ولێکەمکردن .

شێخ لێرەدا باسی ئەوەی کردووە، کە پلەی یەکەم لەئیمان لەخۆی گرتووە لەدوو پلەکە باوەڕبوون بەقەدەر و ئەم پلەی یەکەمە دووشتی، واتە: دوو پلەی لەخۆگرتووە.

**پلەی یەکەم:** ئیمان بوون بەعیلم و زانستی خودا ئەوەی کە دەوری هەموو شتێکی داوە لەو شتانەی کە بوویان هەیە و ئەوەش کە نییە ومەعدومە، ئەم زانستە سیفەتێکە لەسیفاتە زاتیەکانی خودا کە بەردەوام خودا لەئەزەل و ئەبەددا وەسفکراوە پێی. یەکێک لەوانە عیلم و زانستی خودا بەکار و کردەوەی دروستکراوەکان بەچاکە و خراپەوە و زانستی خودا، بەڕزق و ئەجەل و جگە لەمانەش .

**پلەی دووەم:** پلە و مەرتەبەی نووسین، کە ئەویش ئەوەیە، کە خودا لە (**اللوح المحفوظ**)ـدا ئەندازەگیری هەموو دروستکراوەکانی نووسیوە، هیچ شتێك نییە لە گەردوندا ئیللا خودا دەیزانێت و نووسیویەتی پێش ڕوودانی.

پاشان شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کۆمەڵە بەڵگەیەکی لەقورئان و سوننەت بۆ ئەوە هێناوەتەوەو، یەکێك لەبەڵگەکانی سوننەت ئەو فەرموودەیەیە کە شێخ لێرەدا ماناکەی باسکردووە؛ لەفزەکەی پێشەوا ئەبو داود لەسوننەنەکەیدا لەعوبادەی کوڕی سامتەوە گێڕاویەتیەوە[1] ودەڵێت : گوێم لەپێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو : «**أولُ ما خلق اللهُ القلمَ فقال له اكتُبْ قال وما أكتبُ يا ربِّ ؟ ... قال : اكتُبْ مقادِيرَ كلِّ شيءٍ حتى تقومَ الساعةُ**» واتە: یەکەم شتێك، کە خودا درووستی کرد قەڵەم بوو و پێی فەرموو: بنووسە، گوتی: چی بنووسم ئەی پەروەردگار؟ فەرمووی: ئەندازەگیری هەموو شتەکان بنووسە، تاوەکو ڕۆژی دوایی. ئا ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر پلەو مەرتەبەی نووسین، وئەندازەگیری هەموو شتەکان نوسراوە .

هەروەها فەرمایشتەکەی : «أول ما خلق الله القلم، قال له : اكتب» بەنەصبی وشەی (أولَ) و(القلمَ) هاتووە بەو پێیەیی کەلامەکە یەك ڕستە و بەشە ، ماناکەی ئەوەیە لەکاتی دروستکردنی یەکەم درووستکراویدا، کە قەڵەم بوو پێی فەرموو: بنووسە .

وە بەڕەفعی هەردوو وشەی (**أولُ**) و(**القلمُ**)یش هاتووە، بەحسابی ئەوەی کەلامەکە دوو ڕستەیە: یەکەمیان: (**أول ما خلق الله القلم**)ـە، و(**قال له : اكتب**) ڕستەی دووەمە، وماناکەشی بەم شێوەیەیە: یەکەم شتێك، کە بەدیهێنرابێت لەم جیهانەدا قەڵەم بووە .

هەروەها فەرمایشتەکەی : «ما أصاب الإنسان لم يكن ليخطئه ...» هتد، قسەی عوبادەی کوڕی سامتە کە ڕاوی فەرموودەکەیە، واتە: ئەوەی توشی مرۆڤ دەبێت لەو

---

(١) برقم (٤٧٠٠).

شتانەی کە سوودی پێدەگەیەنێت یاخود زیانی پێدەگەیەنێت، هەمووی لەسەر نوسراوە و ئەندازەگیری بۆ کراوە و دەبێ هەر بێتە دی و پێچەوانەکەی هەگیز ڕوو نادات .

هەروەها فەرمایشتەکەی : «جفت الأقلام وطويت الصحف» واتە: قەڵەمەکان وشك بوونەتەوە و پەرتوکەکان پێچراونەتەوە، ئەمە کینایەت و گوازرشتە لەوەی هەموو شتەکان پێشتر نوسراون و لێبوونەتەوە و ئەوەش مانای ئەوەیە، کە لەفەرموودەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەباسدا هاتووە : «**رفعت الأقلام وجفت الصحف**» رواه الترمذي[1] واتە: قەڵەمەکان لێبوونەتەوە لەنووسین و مەرەکەبی قەد پەرتووکەکان وشک بوونەتەوە. پاشان شێخ یەکێك لەبەڵگەکانی قورئانی هێناوەتەوە کە ئەویش فەرمایشتی: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ إِنَّ ذَٰلِكَ فِى كِتَٰبٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾واتە: ئایا نازانیت خودا ئاگاداری هەموو ئەو شتانەیە، کە لەئاسمان و زەویدا ڕوو دەدات، هەموو ئەوە لە کتێبەکەدایە، ئا ئەوەش لەسەر خودا ئاسانە. وفەرمایشتی﴿ أَلَمْ تَعْلَمْ ﴾پرسیارە و بۆ چەسپاندنی بابەتەکەیە لای بەرانبەر، واتە: ئەی موحەمەد تۆ زانیوتە و دڵنیایی لەوەی ﴿ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾ خودا هەموو ئەو شتانە دەزانێت کە لەئاسمانەکان و زەویدایە. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی عیلم و زانستی خودا دەورەی هەموو جیهانی داوە بەبەرز و نزمەوە و ئەمەش پلەو مەرتەبەی زانستە ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ﴾ واتە : ئەوەی لەئاسمان و زەویدا هەیە لە زانیاریەکانی خوا هەمووی نوسراوە لە (**أم الكتاب**)ـدا وئەمەش پلەو مەرتەبەی نووسینە. ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ واتە: دەورەدانی عیلم

---

(١) برقم (٢٥١٦) وقال: هذا حديث حسن صحيح.

و زانستی خودا بەهەموو شتەکان بەوەی لەئاسمان و زەویدایە و نووسینیشی ئاسانە بەنیسبەت خوداوە .

✍ **مەوزوعی شاهید لەئایەتە پیرۆزەکەدا:**

لەم ئایەتەدا ئیسپاتی عیلم و زانستی خودا کراوە بەشتەکان و نووسینی لە (**اللوح المحفوظ**)ـدا و، ئائەمەیان ئەوەیە، کە پلەی یەکەم لەخۆی گرتووە .

هەروەها شێخ ئایەتێکی تری کردووەتە بەڵگە: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ [الحديد:٢٢] ، بڕگەی ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي ٱلْأَرْضِ﴾واتە: توشی هیچ بەڵایەک نابن لەزەویدا هاوشێوەی بێبارانی و سست بوونی سەوز بوونی و گژ و گیا و کەمبوونی بەر و بووم ﴿وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ﴾ ولەخودی خۆشتاندا هاوشێوەی ئازار و نەخۆشی و نەبوونی﴿إِلَّا فِي كِتَٰبٍ﴾ واتە : ئیللا هەموو نوسراوە لە (**اللوح المحفوظ**)ـدا،﴿مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ﴾ واتە: پێش ئەوەی درووستی بکەین و بیهێنینە بوون﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ ، واتە : تۆمارکردنی لەکتێبێکدا هەرچەند زۆرە ئاسانە بەلای خوداوە.

✍ **مەوزوعی شاهید لەم ئایەتەدا:**

ئەم ئایەتە بەڵگەی تێدایە لەسەر ئەوەی هەموو ڕوداوەکان لە (**اللوح المحفوظ**)ـدا تۆمار کراوە پێش ڕوودانیان . ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت خودا عیلم و زانیاری پێی هەبووە پێش ئەوەی بینووسێت و، بەڵگەشە لەسەر پلەو مەرتەبەی عیلم و نووسین .

پاشان دوای ئەوە شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئاماژەی بەوە کردووە، کە تەقدیر وئەندازەگیری دوو جۆرە:

ئەندازەگیرییەکی گشتی (تەقدرێکی عام): ئەمەیان گشتگیر و عامە و هەموو کائینات بوونەوەر دەگرێتەوە وپێشتر بەبەڵگەوە قسەمان لەسەر کرد وئەمە لە(**اللوح المحفوظ**)ـدا نووسراوە .

هەروەها ئەندازەگیرییەکی تایبەت(تەقدرێکی خاص): ئەمەیان درێژەو تەفاسیلی قەدەرە عام و گشتگیرەکەیە و، دەبێتە سێ جۆرەوە:

تەقدیر و ئەندازەگیری بۆ هەموو تەمەن، تەقدیر و ئەندازەگیری ساڵانە، تەقدیر و ئەندازەگیری ڕۆژانە، ئا ئەمە مانای وتەکەی شێخە، کە دەڵێت : (وهذا التقدير التابع لعلمه سبحانه يكون في مواضع جملة) واتە : تەقدرێکی عام وگشتگیر، وئەوەش ئەوەیە کە لە(**اللوح المحفوظ**)ـدا نووسراوە وهەموو دروستکراوەکان دەگرێتەوە (وتفصيلاً) واتە : تەقدیرێکی تایبەت و خاس و ڕوونکەرەوەی وردەکاری تەقدیرە عام و گشتگیرەکەیە وئەمە [1]:

١- تەقدیر وئەندازەگیری هەموو تەمەنە: هەروەك لەفەرمودەکەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودا هاتووە لەبارەی ئەو چوار وشەیەیی، کە لەسەر کۆرپە دەنووسرێت لەسکی دایکیدا، کە بریتییە لە : ڕزق و ئەجەل و چاکی یاخود خراپی کۆرپەکە .

٢- تەقدیر و ئەندازەگیری ساڵانە وئەمەش ئەوەیە کە لەشەوی قەدردا بڕیاری لەبارەوە دەدرێت لەڕوداو پێشهاتەکانی ساڵانە، هەروەك لەم فەرمایشتەی خودادا هاتووە : ﴿ فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ ﴾ [الدخان : ٤] واتە: لەو شەوەدا - قورئانی تێدا هات- هەموو بەرنامەو ئیشوکارێکی گرنگ بڕیار لەبارەوە دەدرێ و جیا دەکرێتەوە .

٣- تەقدیری ڕۆژانە: ئەمەش ئەوەیە کە تێیدا هەموو ئەو شتانەی ڕۆژانە ڕوو دەدەن تێیدا تەقدیر کراوە، هاوشێوەی ژیان و مردن و بەهێز بوون و زەلیل بوون وجگە

---

(١) معارج القبول (١١٠٤).

لەمانەش، هەروەك لەم ئایەتەدا هاتووە : ﴿كُلَّ يَوۡمٍ هُوَ فِي شَأۡنٍ﴾ [الرحمن : ٢٩][١]، واتە: هەموو رۆژێک و کاتێک، وا لە کارێک لە کارەکاندایە: یەکێک دەمرێنێ و یەکێک لە دایک دەبێ، یەکێک سەر دەکەوێ و یەکێک دەشکێ.. هتد. لەعەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێت) هاتووە : «**إِنَّ اللهَ خَلَقَ لَوْحًا مَحْفُوظاً مِنْ دُرَّةٍ بَيْضَاءَ دَفَّتَاهُ مِنْ يَاقُوتَةٍ حَمْرَاءَ، قَلَمُهُ نُورٌ، وكِتَابُهُ نُورٌ، عَرْضُهُ مَا بَيْنَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ يَنْظُرُ فِيهِ كُلَّ يَوْمٍ نَظَرَةً وَيُحْيِي وَيُمِيتُ، وَيُعِزُّ وَيُذِلُّ وَيَفْعَلُ مَا يَشَاءُ**». **فذلك قوله سبحانه: ﴿كُلَّ يَوۡمٍ هُوَ فِي شَأۡنٍ﴾** رواه عبد الرزاق وابن المنذر والطبراني والحاكم[٢] واتە: خودا (لەوحولمەحفوزی) درووستکرد لە لوئلوئێکی سپی، کە دوو توێی لاپەڕەکانی یاقوتێکی سورە، قەڵەمەکەی نوورە، نووسینەکەشی نوورە، درێژیەکەی بەئەندازەی نێوان ئاسمان و زەوییە، هەر ڕۆژێك سێ سەد شەست جار تەماشای دەکات، زیند و دەکاتەوە ودەشمرێنێ و بەعیززەت و دەکات و زەلیلیش دەکات وئەوەی بیەوێ ئەنجامی دەدات، ئا ئەوە مەبەستی فەرمایشتی خوای پەروەردگارە: (هەر ڕۆژەو لەکار و بارێکدایە).

ووتەکەی : (فهذا القدَر) واتە: ئەم قەدەرە کە ئاماژەمان پێدا و ڕوونمان کردەوە بەهەردوو جۆرە عام و خاسەکەیەوە (قد كان ينكره غلاة القدرية) واتە : زێدەڕۆیانی قەدەریەکان نکۆڵی لێدەکەن، نکۆڵی لەوە دەکەن خودا عیلم و زانیاری لەبارەی

---

(١) (**ئیبن جەریر**) دەڵێ: لە مانای [ كل يوم هو في شأن ] پرسیار لە پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- کرا؟ ئەویش فەرمووی: «**أنْ يغفرَ ذَنْبًا ويُفَرِّجَ كربًا ويرفَعَ قومًا ويضَعَ آخَرينَ**». (صحيح ابن حبان، كتاب الرقائق، باب الفقر، ذكر الإخبار بأن أسباب هذه الفانية الزائلة يجري عليها التغير والانتقال، حديث: ٦٩٠، وحسنه الألباني في سنن إبن ماجة بهذا اللفظ، برقم: ٢٠٢).
واتە: هەردەم خەریکە لەتاوان خۆشدەبێ، وناخۆشیەك لادەبات، هۆزێك بڵند دەكات، هۆزێکی دیکە نەویی.
(٢) أخرجه الطبراني في الكبير (١٢/ ٧٢)، والحاكم (٢/ ٥١٩)، وأبو نعيم في الحلية (٤/ ٣٠٥)، والبيهقي في الأسماء والصفات (٢/ ١٣٠)، ورواه ابن جرير الطبري في تفسيره (١٣/ ١٧٦).

شتەکانەوە هەبێت پێش ڕوودانیان، هەروەها نوسرابێتن لە (**اللوح المحفوظ**)ـدا و، دەڵێن: خودا فەرمان دەکات و ڕێگری دەکات و نازانێ کێ بەگوێی دەکات و کێش سەرپێچی دەکات. بابەتەکە(**أنف**)ـە واتە(**مستأنف**) واتە سەرەتایە وپێشتر لەعیلم و تەقدیری خوادا نەبووە، ئائەمانە لەلایەن پێشەوایانەوە تەکفیر کراون، بەڵام ئەم تاقمە کۆتاییان هاتووە و دوا بڕاوبوون و نەماون، هەربۆیە شێخ وتی: (ومنكروه اليوم قليل)واتە: نکۆڵیکاران لێی ئەمڕۆ کەمن و، تاقمێکیان ماون دان دەنێن بەعیلم وزانستی خودادا بەڵام نەفی ئەوە دەکەن کردەوەی بەندەکان داخلی قەدەر بێت و پێیان وایە درووستکراوی سەربەخۆی بەندەکانە و خودا درووستی نەکردووە و نەیویستووە، هەروەک دواتر زیاتر ڕوونی دەکەینەوە .



## [ب] پلەی دووەم و ئەوەش کە لەخۆی گرتووە:

**وَأَمَّا الدَّرَجَةُ الثَّانِيَةُ؛ فَهِيَ مَشِيئَةُ اللهِ النَّافِذَةُ، وَقُدْرَتُهُ الشَّامِلَةُ، وَهُوَ: الإِيمَانُ بِأَنَّ مَا شَاءَ اللهُ كَانَ، وَمَا لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ، وَأَنَّهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مِنْ حَرَكَةٍ وَلاَ سُكُونٍ؛ إِلاَّ بِمَشِيئَةِ اللهِ سُبْحَانَهُ، لاَ يَكُونُ فِي مُلْكِهِ مَا لاَ يُرِيدُ، وَأَنَّهُ سُبْحَانَهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ مِنَ الْمَوْجُودَاتِ وَالْمَعْدُومَاتِ، مَا مِنْ مَخْلُوقٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاءِ إِلاَّ اللهُ خَالِقُهُ سُبْحَانَهُ، لا خَالِقَ غَيْرُهُ، وَلاَ رَبَّ سِوَاهُ.**

**بەنیسبەن پلەی دووەمەوە: بریتیە لەویست وخواستە بەجێهاتووەکەی خودا، وهێز و توانا گشتگیرەکەی، کە ئەویش: باوەڕبوونە بەوەی ئەوەی خودا بیەوێت دێتە بوون و، ئەوەش ویستی خودای لەسەر نەبێت نایەتە بوون، هیچ جموجوڵ وحەرەکەیەك لەئاسمانەکان و زەویدا نییە ئیللا بەویستی خودایە، هیچ شتێك لەمەملەکەتی ئەودا ڕوو نادات مەگەر ئەوە نەبێت، کە ویستی ئەوی لەسەرە و، خودا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە جا هەبوو (مەوجود) بێت یاخود نەبوو (مەعدوم)، هیچ دروستکراوێك نییە لەزەوی و ئاسماندا ئیللا بەدیهێنەر و دروستکارەکەی خودایە، هیچ دروستکار و بەدیهێنەرێك نییە جگە لەو، وهیچ پەروەردگارێك نییە جگە لەو.**

---

### شەرح

ئەمە ڕونکردنەوەی پلەو مەرتەبەی سێیەمە[1]، وپلەو مەرتەبەی چوارەم لەمەرتەبەکانی قەدەر. ئاماژەی داوە بەپلەی سێیەم بەوتەکەی، کە دەڵێت: (فهي مشيئة الله النافذة وقدرته الشاملة) ،واتە: ویست وخواستی بەجێهاتووی خودا وهێز و توانا

---

(١) نووسەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بە (دووەم)ـی داناوە؛ چونکە عیلم و نووسینی بەیەك پـلە ئەژمار کردووە .

گشتگیرەکەیەتی، و(النافذة) : ئەوەیە کە ڕابردووە و کەس ناتوانێت ڕێگری لێبکات، و(الشاملة) عام وگشتیرە و هەموو شتێك دەگرێتەوە جا ئێستا بوونی هەبێت یاخود نا.

ووتەکەی : (وهو الإيمان) واتە : مانای باوەڕبوون بەم پلەو مەرتەبەیە: (اعتقاد أن ما شاء الله كان) : ئەوەی خودا ویستی لەسەر بێت دێتە بوون (وما لم يشأ لم يكن) واتە : ئەوەی خودا ویستی لەسەر نەبێت نایەتە بوون (وأنه ما في السموات من حركة ولا سكون إلا بمشيئة الله) واتە : هیچ یەکێك لەوانە ڕوو نادات ئیللا ویستی خودای لەسەر بووە (لا يكون في ملكه ما لا يريد)واتە: هیچ شتێك لەژێردەسەڵاتی خودادا بوونی نییە، گەر خودا ویستی لەسەر نەبووبێت بێتە بوون (وأنه سبحانه على كل شيء قدير من الموجودات والمعدومات) واتە: خودا بەسەر هەموو شتێدا زاڵە جا شتەکە لەواقع دا هەبێت یاخود نا؛ چونکە شتی نەبووش دەچێتە ژێر گشتگیری وشەی (**كل شيء**) هەموو شتێك، خوای پەروەردگار لەچەندان ئایەتدا هەواڵی داوە: بەوەی بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە.

ووتەکەی : (فما من مخلوق في الأرض ولا في السماء إلا الله خالقه سبحانه) واتە: هیچ دروستکراوێك نییە لەزەوی و ئاسماندا ئیللا خودا بەدیهێنەریەتی، ئەمەش ئاماژەیە بە پلەو مەرتەبەی چوارەم، کە ئەویشت بریتییە لە پلەو مەرتەبەی دروستکردن و هێنانەبوون، هەموو شتێك جگە لەخودا مەخلوق و درووستکراوە وهەموو کارو کردەوەیەك بەخێر و شەڕیەوە سەرچاوەکەی خودایە و، خودا هێناویەتیە بوون (لا خالق غيره ولا رب سواه) ،واتە: هیچ بەدیهێنەرێك نییە جگە لەخوا و، هیچ پەروەردگارێك نییە جگە لەو .

**✍دوای ئەوەی شێخ لەباسکردنی پلەو مەرتەبەکانی قەدەر بوویەوە ئاماژەیدا بەچەند بابەتێك کە پەیوەندی هەیە بەم بابەتەوە:**

**بابەتی یەکەم :** هیچ دژ یەکییەك نییە لەنێوان قەدەر و شەرع دا .

**بابەتی دووەم:** هیچ دژ یەکیەك نییە لەنێوان ئەندازەگیر و تەقدیر کردنی تاوان لەلایەن خوداوە لەگەڵ ڕقبوونی خوا لێی .

**بابەتی سێیەم:** هیچ دژ یەکیەك نییە لەنێوان ئەندازەگیر و تەقدیر کردنی کردەوەی بەندەکان لەلایەن خوداوە لەگەڵ ئەنجامدانی لەلایەن بەندەکانەوە بەویست و ئارەزووی خۆیان .



## بابەتی یەکەم و دووەم

## هیچ دژ یەکییەک نییە لەنێوان قەدەر و شەرع دا لەلایەک و، تەقدیر کردنی تاوان لەلایەن خوداوە و ڕق لێبوونەوەی لەتاوان لەلایەکی ترەوە:

وَمَعَ ذَلِكَ؛ فَقَدْ أَمَرَ الْعِبَادَ بِطَاعَتِه وَطَاعَةِ رُسُلِه، وَنَهَاهُمْ عَنْ مَعْصِيَتِه. وَهُوَ سُبْحَانَهُ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ وَالْمُحْسِنِينَ وَالْمُقْسِطِينَ، وَيَرْضَى عَنِ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ، وَلا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ، وَلاَ يَرْضَى عَنِ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ، وَلاَ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ، وَلاَ يَرْضَى لِعِبَادِهُ الْكُفْرَ، وَلاَ يُحِبُّ الْفَسَادَ .

لەگەڵ ئەوەشدا؛ خودا فەرمانی کردووە بەبەندەکانی بەگوێی خۆی و پێغەمبەرەکەی بکەن و ڕێگری لێکردوون لەسەرپێچی کردنی ، خوای پەروەردگار کەسانی بەتەقوا و چاکەکار و دادپەروەری خۆشدەوێت و، ڕازیە لەوانەی باوەڕیان هێناوە و کردەوەی چاکە ئەنجام دەدەن و، کەسانی بێباوەڕی خۆشناوێت و، ڕازی نییە لەگەڵی فاسق و، فەرمان بەفاحیشەو کاری نابەجێ ناکات و، ڕازی نابێت بەندەکانی کوفر هەڵبژێرن و فەسادیشی خۆشناوێت.

---

**شەرح**

دوای ئەوەی شێخ هەر چوار پلەو مەرتەبەکەی قەدەری ڕوونکردەوە: عیلم و، نووسین و، ئیرادەو ویست ودرووستکردن و هێنانە بوون، هیچ شتێك نییە لەو شتانەی، کە ڕوو دەدات ئیللا خودا زانیویەتی و نووسیویەتی و ویست و ئیرادەی لەسەر بووە و هێناویەتیە بوون ـ لێرەدا ئەوەی ڕوونکردووەتەوە کە هیچ دژ یەکیەک نییە لەنێوان ئەوەی خودا فەرمانی بەندەکانی کردووە گوێڕایەڵی بکەن و ڕێگری

لێکردوون سەرپێچی بکەن لەگەڵ تەقدیری کردنی ڕوودانی تاوانەکە، ورقبوونی لێی؛ ووتەکەی : (ومع ذلك) واتە : لەگەڵ ئەوەی خودا هەر ئەوە شتەکانی فێرکردووە وتەقدیری کردووە و نووسیویەتی و ویستی لەسەر بووەو هێناویەتیە بوون (فقد أمر العباد بطاعته وطاعة رسوله ونهاهم عن معصيته)واتە: فرمانی بەبەندەکان کردووە گوێڕایەڵی خۆی وپێغەمبەرەکەی بکەن و ڕێگری کردووە لەسەرپێچی کردنی، هەروەك لەچەندان بەڵگەی قورئان و سوننەدا هاتووە و تێیدا فرمانی کردووە بەگوێڕایەڵی و ڕێگری کردووە لەسەرپێچی، ئا لەوەدا هیچ دژیەکیەکیش نییە لەنێوان شەرعەکەی و قەدەرەکەیدا. هەروەکو هەندێ کەسی گومڕا وا گومان دەبەن، ئەوانەی کە پێیان وایە دژ یەکی هەیە لەنێوان شەرع و قەدەردا.

شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەبارەی ئەم بابەتەوە لەکتێبەکەیدا بەناوی [التدمرية] [1]دەڵێت: **کەسانی گومڕا ئەوانەی کە ڕۆچوون لەبابەتی قەدەردا بوونەتە سێ تاقمەوە : مەجوسیەکان و، هاوبەشدانەرەکان و، شەیتانیەکان.**

**تاقمی یەکەم:** مەجوسیەکان ئەوانەی قەدەر بەدرۆ دەخەنەوە هەرچەند باوەڕیان بەفرمان و ڕێگریەکانی خودایە، توندڕەوەکانیان نکۆڵی لەعیلم وزانستی خودا و نووسینی کردەوەکان دەکەن و، مامناوەندەکانیان بەگشتی نکۆڵی ویست و درووستکردن و قودرەتی خودا دەکەن، ئەوانە بریتین لە موعتەزیلەکان و ئەوانەش کە هاوڕایانن .

**تاقمی دووەم:** : هاوبەشدانەرەکان: ئەوانەی کە دان دەنێن بەقەزاو قەدەردا و، نکۆڵی لەفرمان و ڕێگری دەکەن، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلَا آبَاؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ﴾ [الأنعام : ١٤٨] ، واتە: ئەوکەسانەی هاوەڵیان بۆ خوا دانا، بێگومان بۆخۆ ڕزگارکردنی خۆیان دەڵێن:

---

(١) مجموع الفتاوى (٣/ ١٠١).

ئەگەر خوا ویستبای کەخۆمان و، باوو باپیرانمان هاوبەشی بۆ دانەنێین، هەرگیز هاوبەشمان بۆ دا نەدەنا، و هیچ شتێکیشمان لە خۆ یاساغ نەدەکرد.

هەرکەسێك بەڵگەو بیانو بێنێتەوە بۆ نەهێشتنی فرمان و ڕێگری ئەوا لەو کەسانەیە. ئەمەش زۆرە لەناو سۆفیەکاندا، ئەوانەی کە بانگەشەی هەقیقەت دەکەن .

**تاقمی سێیەم** : شەیتانیەکان: ئەوانەی دان بەهەردوو شتەکەدا دەنێت، بەڵام بە دژ یەکی دەزانن و دەڵێت خودا لەمەدا توشی تەناقوزات بووە و، تانە دەدەن لە حیکمەت و دادپەروەری خودا، هەروەك لەپێش هەموویانەوە ئەوە باسدەکرێت لەشەیتانەوە، هەروەك نووسەران گێڕاویانەتەوە و، لەئەهلی کیتابیشەوە گێڕدراوەتەوە . جا مەبەستەکە ئەوەیە: ئەمە یەکێکە لەو بانگەشانەی کە کەسانی گومڕا دەیڵێن، بەڵام ئەهلی هیدایەت باوەڕیان بەوە وبەوەی تریش هەیە، واتە: باوەڕیان بەوە هەیە خودا بەدیهێنەری هەموو شتێکە و پەروەردگار خاوەنیەتی، ئەوەی ویستی لەسەر بێت دێتە بوون، ئەوەش ویستی لەسەر نەبێت ڕوو نادات و، بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە و، عیلم و زانیاریەکەی دەوری هەموو شتێکی داوە، هەموو شتێکی لە لەوحولمەفوزدا ژماردووە وهەڵگردووە .

ووتەکەی : (وهو سبحانه یحب المتقین والمحسنین والمقسطین) واتە : ئەوانەی خۆش دەوێت، کە سیفەتی جوانیان تێدایە، وەک تەقوا و چاکە و دادپەروەری (ویرضی عن الذین آمنوا وعملوا الصالحات) ،واتە: لەوانە ڕازیە، کە باوەڕیان هێناوە و کردەوەی چاکە دەکەن، هەروەك لەچەندان ئایەتدا ئاماژەی پێکردووە ؛ لەبەر ئەوەی سیفەتی باوەڕ و کردەوەی چاکیان تێدایە (ولا یحب الکافرین، ولا یرضی عن القوم الفاسقین) واتە : ڕازی نییە لەوانەی کە ئەو سیفاتانەیان تێدایە کە خودا ڕقی لێیەتی ؛ وەک کوفر و فیسق و گشت سیفەتە ناشرینەکانی تر (ولا یأمر بالفحشاء) ،واتە: فرمان بەفاحیشەو کاری خراپە ناکات، جا فاحیشە بریتییە: لەو شتەی، کە زۆر ناشیرینە لەقسە و کردار (ولا یرضی لعبادە الکفر ولا یحب الفساد) ،واتە: ڕازی نییە

بەندەکانی کوفر بکەن و فەسادیشی خۆش ناوێت؛ لەبەر ناشیرینی، ولەبەر ئەو زیان و خراپەیەش، کە هەیەتی بۆ بەندەکانی خودا و وڵاتیش .

شێخ (ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت) بەم قسەیە مەبەستیەتی وەڵامی ئەوانە بداتەوە، کە پێیان وایە: ویست و خۆشویستن پێکەوە گرێدراون ، بۆیە هەرکات خودا ئیرادەی لەسەر شتێك بێت ئەوا خۆشی دەوێت . بەڵام ئەم بۆچوونە ناڕاست و باتڵە، وبۆچوونی ڕاست و هەق ئەوەیە: هیچ تەلازم و پێکەوە گرێدانێك لەنێوان ئیرادەو خۆشویستن، یاخود ویست و خۆشویستندا نییە، واتە: ویست و ئیرادەی گەردوونی(کەونی) هەندیٚ جار خودا ویستی لەسەر شتێکە بەڵام خۆشی ناوێت و، هەندیٚ جار شتێکی خۆش دەوێت بەڵام نایەوێت بێتە بوون، نموونەی یەکەم: ویستی هەبوونی شەیتان و جوندی و دارو دەستەکەی و ویستە عام و گشتگیرەکەی لەوەی کە لە گەردووندا (کەوندا) هەیە، لەگەڵ ڕق لێبوونی لەهەندێکی، نموونەی دووەم : خۆشویستنی بۆ باوەڕهێنانی بێباوەڕان و، گوێڕایەڵی کردنی بێباوەڕان، لەگەڵ ئەوەشدا ویستی نەبووە ئەوە بێتە دی، خۆ ئەگەر ویستی لەسەر بوایە دەهاتە دی .



## بابەتی سێیەم:

## هیچ دژیەکییەک نییە لەنێوان ئیسپاتکردنی قەدەر لەگەڵ دانەپاڵی کردەوەی بەندەکان بۆلای خۆیان بەهەقیقی و، ئەوان بە ویست و ئیختیاری خۆیان ئەنجامی دەدەن:

وَالْعِبَادُ فَاعِلُونَ حَقِيقَةً، وَاللهُ خَلَقَ أفْعَالَهُم. وَالْعَبْدُ هُوَ: الْمُؤْمِنُ، وَالْكَافِرُ، وَالْبَرُّ، وَالْفَاجِرُ، وَالْمُصَلِّي، وَالصَّائِمُ. وَلِلْعِبَادِ قُدْرَةٌ عَلَى أَعْمَالِهِمْ، وَلَهُمْ إِرَادَةٌ، وَاللهُ خَالِقُهُمْ وَقُدْرَتَهُمْ وَإِرَادَتَهُمْ؛ كَمَا قَالَ تَعَالَى: ﴿ لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ [التكوير:٢٨، ٢٩].

بەندەکان بکەری کارەکانی خۆیانن بەهەقیقی و، خودا خالیق و بەدیهێنەری کردەوەکانیانە. وە بەندە بریتییە لە: باوەڕدار، بێباوەڕ، وچاک، وخراپ، ونوێژ خوێن، وڕۆژووگر. وبەندەکان توانایان بەسەر ئەنجامدانی کردەوەکانیان هەیە و ویست و ئیرادەشیان هەیە، وخودا بەدیهێنەری خۆیان و کردەوەکانیانیشە، هەروەك فەرموویەتی: (یادخەرەوەیە بۆ ئەو کەسەتان بیەوێ لەسەر ڕێی ڕاست و ئیستیقامەی بێت، واتە: قورئان تەنها کەڵکی بۆ ئەو جۆرە کەسانە دەبێت . وە ئێوە ئارەزووی ئیستیقامە ناکەن، مەگەر خوای خاوەنی جیهانەکان ئارەزووی بکات، جا کەوابوو داوای یارمەتی هەر لەو بکەن و، خۆشتانی بە تەواوی بۆ ڕێک بخەن، تا خوایش پشتیوانتان بێ و ڕێنماییتان بکا، ئەگینا خوا بە زۆر هیچ کەسێک ناهێنێتە ژێر بار).

وَهَذِهِ الدَّرَجَةُ مِنَ الْقَدَرِ يُكَذِّبُ بِهَا عَامَّةُ الْقَدَرِيَّةِ الَّذِينَ سَمَّاهُمُ النَّبِيُّ: (مَجُوس هَذِهِ الأُمَّة)، وَيَغْلُو فِيهَا قَومٌ مِنْ أَهْلِ الإثْبَاتِ، حَتَّى سَلَبُوا الْعَبْدَ قُدْرَتَهُ وَاخْتِيَارَهُ، وَيُخرِجُونَ عَنْ أَفْعَالِ اللهِ وَأَحْكَامِهِ حُكْمَهَا وَمَصَالِحَهَا.

**ئەم بەشە لەقەدەر کۆی قەدەریەکان ڕەتی دەکەنەوە و بەدرۆی دەخەنەوە ئەوانەی کە پێغەمبەر ﷺ لەبارەیانەوە فەرموویەتی:«مەجوسی ئەم ئومەتەن»، وهەندێ لەوان ئیسپاتی دەکەن و دانی پێدا دەنێن و زێدەڕۆیی تێدا دەکەن، بەشێوەیەك قودرەت و تواناو ئیختیاریان لەمرۆڤ داڕنیوە ، بەم کارەشیان حیکمەت و مەسڵەحەت لەکارەکانی خودادا ناهێڵن.**

---

## شەرح

**شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) مەبەستی لەم قسەیە :** ئەوەیە ڕوونی بکاتەوە کە هیچ دژ یەکیەك نییە لە نێوان ئیسپاتکردنی قەدەر بەهەموو پلەو مەرتەبەکانی پێشووەوە، لەگەڵ ئەوەی بەندەکان کارەکانیان بەویست و ئیختیاری خۆیان ئەنجام دەدەن، ومەبەستی بەمە: وەڵامدانەوەی ئەوانەیە، کە پێیان وایە: ئیسپاتکردنی ئەوە دژیەکی دەخوازێت، بۆیە لێرەوە کۆمەڵێك لەوان توشی زێدەڕۆیی بوون لەئیسپاتکردنی قەدەردا بەشێوەیەك هیچ ویست و ئیختیارێکیان بۆ بەندە نەهێشتووەتەوە.

تاقمی دووەم لەئیسپاتکردنی دانەپاڵی کردار بۆلای بەندەکاندا زێدەڕۆیی و غولویان کردووە، بەشێوەیەك پێیان وایە ئەوە بەندەکانن بەدیهێنەری کارەکانی خۆیانن و، هیچ پەیوەندی بەویستی خوداوە نییە و لەژێر قودرەت و توانای خودادا نییە .

جا بەکۆمەڵی یەکەم دەوترێت: جەبری؛ چونکە ئەوان دەڵێن: مرۆڤ ناچار و مەجبورە لەسەر ئەوەی لێوەی دەردەچێت و هیچ ویست و ئیختیارێکی نییە و، بەکۆمەڵی دووەمیش دەوترێت: قەدەریەیی نوفات؛ چونکە ئەوان نەفی قەدەر دەکەن.

ووتەکەی شێخ(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) : (والعباد فاعلون حقيقة) ،واتە: بەندەکان بکەری کارەکانی خۆیانن بەهەقیقی، ڕەد و وەڵامی تاقمی یەکەمە، کە

جەبریەکانە؛ چونکە ئەوان دەڵێن: بەندەکان بکەری هەقیقی کارەکانی خۆیان نین ودانەپاڵی کار بۆلایان لەبابی مەجازە. ووتەکەی: (والله خالقهم وخالق أفعالهم) ،واتە: خودا بەدیهێنەری خۆیان وکارەکانیانە، ڕەدو وڵامی تاقمی دووەمە، کە ئەوانیش قەدەرییەکانن؛ لەبەرئەوەی ئەوان دەڵێن: خودا کار و کردەوەی بەندەکانی بەدینەهێناوە بەڵکو خۆیان سەربەخۆ بەدییانهێناوە، بەبێ ئەوەی ویستی خوای لەسەر بێت و تەقدیری کردبێت!.

ووتەکەی : (والعبد هو المؤمن والكافر والبر والفاجر والمصلي والصائم والعباد قدرة على أعمالهم ولهم إرادة) ،واتە: بەندە بریتییە لە باوەڕدار و بێباوەڕ و چاک و خراپ ونوێژ خوێن و ڕۆژووگر ..هتد ، ئەم وتەیەیی ڕەد و وڵامی جەبرییەکانە، واتە: دەیەوێت بڵێت: بەندەکان ناچار و مەجبور و زۆرلێکراو نین لەئەنجامدانی ئەو کارانەدا؛ لەبەرئەوەی گەر ئاوها بوایە، نەدەبوو وەسفیان بکرێت پێی؛ چونکە کاری کەسی مەجبور و زۆر لێکراو نادرێتە پاڵی و، وەسفی پێناکرێت و شایستەی پاداشت یاخود سزا نابێت لەسەری .

هەروەها بڕگەی : (والله خالقهم وخالق قدرتهم) ،واتە: خودا بەدیهێنەریانە و بەدیهێنەری هێز و تواناکەشیانە، ئا ئەم وتەیە ڕەد و وڵامە بۆ قەدەریە نوفاتەکان ئەوانەی، کە بانگەشەی ئەوە دەکەن گوایە: بەندەکان کارەکانی خۆیان بەدیدەهێنن بەبێ ویست و ئیرادەی خودا، هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێدا.

پاشان شێخ لەڕەد و وڵامی هەردوو تاقمەکەدا ئەم ئایەتە دێنێتەوە : ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ ٢٨ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ ، واتە: یاداوەرییە بۆ ئەو کەسەتان بیەوێ لەسەر ڕێی ڕاست ئیستیقامەی ببێ، واتە: قورئان تەنها کەڵکی بۆ ئەو جۆرە کەسانە دەبێت . وە ئێوە ئارەزووی ئیستیقامە ناکەن، مەگەر خوای خاوەنی جیهانەکان ئارەزووی بکات.

جا فەرمایشتی: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ﴾ وڵامە بۆ جەبریەکان؛ چونکە ئایەتەکە ویست و ئیرادەی بۆ بەندەکان ئیسپاتکردووە و ئەوان دەڵێن بەندەکان ویست و مەشیئەتیان نییە، و فەرمایشتی: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾وڵامە بۆ قەدەریەکان ئەوانەی دەڵێن: ویست و مەشیئەت بەندە سەربەخۆیە لەهێنانەبوونی کرداردا، بەبێ ئەوەی لەسەر ویست و مەشیئەتی خودا وەستابێت، ئەوەش ناڕاست وباتڵە ؛ لەبەرئەوەی خودا ویستی بەندەکانی بەستووەتەوە بەویستی خۆیەوە و پەیوەستی کردووە پێی.

ووتەکەی : (وهذه الدرجة من القدر) ،واتە: ئەم بەشە لەقەدەر، کە بریتییە لە گشتگیری ویست و ئیرادەی خودا بۆ هەموو شتێك و، گشتگیری بەدیهێنانی خودا بۆ هەموو شتێك و بەندەکان بکەری هەقیقی کارەکانیانن، و خودا بەدیهێنەری خۆیان و کردەوەکانیانە (یکذب بها عامة القدریة) ،واتە: کۆی قەدەریەکان ڕەتی دەکەنەوە و بەدرۆی دەخەنەوە، بەشێوەیەك پێیان وایە بەندە خۆی بەدیهێنەری کارەکانی خۆیەتی، بێئەوەی ویست و ئیرادەی خودای لەسەر بێت (الذین سماهم النبي ﷺ مجوس هذه الأمة) [١] ،واتە: ئەوانەی کە پێغەمبەر ﷺ ناوی ناون مەجوسی ئەم ئومەتە؛ لەبەر لێکچوونیان لەگەڵ مەجوسییەکاندا، ئەوانەی پێیان وایە دوو درووستکار(خالیق) و بەدیهێنەر هەیە، کە ئەوانیش: نور و تاریکیە، ودەڵێن: خێر کاری نورە، وشەڕیش کاری تاریکیە، وشوبهاون بە سەنەوییەکان، واتە: ئەوانەی دوو خودا ئیسپات دەکەن. هەروەها ئەو قەدەرییانەش کە لەگەڵ خودادا بەدیهێنەرێکی تریشیان زیاد کردووە بەشێوەیەك پێیان وایە بەندەکان تەنها خۆیان کار و کردەوەکانی خۆیان بەدیدەهێنن بێئەوەی ویست و ئیرادەی خوای لەسەر بێت.

---

(١) أخرجه أبو داود (٤٦٩١)، والحاکم (١/ ٨٥)، أنظر : شرح العقيدة الطحاوية (٣٠٤).

**تێبینی:** لەپێغەمبەرەوە ﷺ سابت نەبووە ناویان بنێت مەجوسی ئەم ئوممەتە ؛ لەبەرئەوەی دەرکەوتنیان ماوەیەك دوای سەردەمی پێغەمبەر بوو ﷺ وزۆربەی ئەو زەم و بەخراپە باسکردنەیان مەوقوفە و لەهاوەڵانەوە هاتووە .

وبڕگەی : (ويغلو فيها) واتە: ئەم پلەیە لەقەدەر ، و(**الغلو**): بریتیە لە زێدەڕۆی لەشتێکدا کە سنووری پێویست ببەزێنێت، (قوم من أهل الإثبات) کومەڵێك لەوانەی ئیسپاتی قەدەر دەکەن و، مەبەست لێیان جەبرییەکانە، ئەوانەی کە دەڵێن: بەندە مەجبوور و ناچار و زۆرلێکراوە لەکارەکانی دا (حتى سلبوا العبد قدرته واختياره) ،واتە: تاوەکو توانا و ویست و ئیختیاریان لەبەندە داماڵی .

**تاقمی یەکەم** زێدڕۆییان کرد لەئیسپاتکردنی کردار بۆ بەندەکان تا ڕادەیەك، کە لەژێر ویست و ئیرادەی خودا دەریان هێنا و هەموویان دایە پاڵ بەندە و، **تاقمەکەی تر** زێدەڕۆییان کرد لەنەفی و ڕەتکردنەوەی کرداری بەندە، تاوەکو دایانماڵی لە هەموو توانا و ویست و ئارەزوویەك .

هەروەها بڕگەی: (ويخرجون عن أفعال الله وأحكامه حكمها ومصالحها)،واتە: جەبریەکان لەم مەزهەبەیاندا، کاتێ کە نەفی کرداری بەندە دەکەن و ڕەتیدەکەنەوە و دایانماڵین لە توانا و ویست و ئارەزووی ئەنجامدان، بەم کارەشیان نەفی حیکمەت و دانایی خودایان کرد لە ئەمر و نەهی و پاداشت وسزاکانی دا، وگوتیان : خودا پاداشت یاخود سزای بەندەکان دەداتەوە لەسەر شتێك، کە کردەوەی ئەوان نییە و فرمانیان پێدەکات بە شتێک، کە لەتوانایاندا نییە، بەم شێوەیە تۆمەتی ستەم و گاڵتەجاڕیان دایە پاڵ خودا، تعالى الله عما يقولون علواً كبيراً.

⁂

## هەقیقەتی ئیمان و حوکمی ئەوانەی تاوانی گەورە ئەنجام دەدەن

وَمِنْ أُصُولِ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ أَنَّ الدِّينَ وَالإِيمَانَ قَوْلٌ وَعَمَلٌ، قَوْلُ الْقَلْبِ وَاللِّسَانِ، وَعَمَلُ الْقَلْبِ وَاللِّسَانِ وَالْجَوَارِحِ. وَأَنَّ الإِيمَانَ يَزِيدُ بِالطَّاعَةِ، وَيَنْقُصُ بِالْمَعْصِيَةِ.

وَهُمْ مَعَ ذَلِكَ لا يُكَفِّرُونَ أَهْلَ الْقِبْلَةِ بِمُطْلَقِ الْمَعَاصِي وَالْكَبَائِرِ ؛ كَمَا يَفْعَلُهُ الْخَوَارِجُ ؛ بَلِ الأُخُوَّةُ الإِيمَانِيَّةُ ثَابِتَةٌ مَعَ الْمَعَاصِي ؛ كَمَا قَالَ سُبْحَانَهُ : ﴿ فَمَنْ عُفِيَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴿١٧٨﴾ ﴾ [البقرة: ١٧٨] ، وَقَالَ: ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٩﴾ ﴾ [الحجرات: ٩]. ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾ ﴾ [الحجرات: ١٠].

یەکێك لەئەسڵ و بنەماکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، ئەوەیە دین و ئیمان بریتییە لەقسەو کردار: قسەی دڵ و زمان و، کرداری دڵ و زمان و لاشە و، ئیمان بەتاعەت و عیبادەت زیاد دەکات و بەتاوان و سەرپێچی کەم دەکات و لاواز دەبێت، وئەوان ـ ئەهلی سوننە ـ لەگەڵ ئەوەشدا کەس تەکفیر ناکەن بەخودی گوناهـ و تاوانی گەورە، وەك ئەوەی خەواریجەکان دەیکەن، بەڵکو برایەتی ئیمان هەر دەمێنێ لەگەڵ بوونی تاوان و سەرپێچیشدا، هەروەك خوای پەروەردگار لەئایەتی قیساس و تۆڵەکردنەوەدا فەرموویەتی: (ئینجا هەرکەسیش لەلایەن برای هاو دینی خۆیەوە، واتە: لە لایەن کەس و کاری کوژراوەوە عەفوو چاوپۆشی لێکرا (لە کوشتنەوە)و، بە خوێن رازیی بوو ، دەبا خوێن وەرگرەکە رێی چاک بگرێتە بەرو، بە پیاوانەو بەپێی باوو نەریتی ناوچەکە ڕەفتار بکاو بجوڵێتەوە)، وفەرموویەتی: (ئەگەر دوو دەستە لە

**باوەڕداران پێکەوە بە جەنگ هاتن، جا هەرچی تواناتان هەیە بەکاری بێنن و ئاشتیان بکەنەوەو بانگیان بکەن بۆلای بڕیارەکانی، جا ئەگەر دەستەیەکیان دەست درێژیی کردە سەر دەستەکەی تر، واتە: ملی ڕانەکێشا بۆ ئاشتیی و یەککەوتن ، ئەوا ئێوەش لەگەڵ ئەو کۆمەڵەیاندا بجەنگێن، کە دەستدرێژی دەکات، تا ناچار دەبێ و دەگەڕێتەوە بۆ بڕیارو حوکمی خوا، ئینجا ئەگەر کۆمەڵە ستەمکارەکە گەڕایەوە بۆ حوکمی خوا، جا ئێوەیش بەئینصاف ناوبژییان بکەن ، وە دادپەروەر بن و بەلای هیچ کەسێکیاندا دامەبڕن، چونکە بێگومان خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێت).**

**هەروەها فەرموویەتی: (بەڕاستی هەر بڕواداران برای یەکن ، جا ئەگەر لە نێوان دوو براتاندا، ناکۆکی پەیدا بوو ئێوەش بەزوویی نێوانیان چاک بکەن و ئاشتیان بکەنەوە ، هەمیشە لە خوا بترسن لە هەموو گوتارو کردارێکتاندا، بەڵکو خوا ڕەحمتان پێبکات)[١].**

---

(١) پێشەوا (بوخاریی و، موسلیم) لە ئەنەسەوە -خوا لێی ڕازی بێت- دەگێرنەوە: پەیامبەر - ﷺ بەسواری گوێدرێژێک لەگەڵ کۆمەڵێ لە موسڵمانەکان دێت بۆلای، جا کاتێ گەیشت، عەبدوڵلا پێی وت: لێم وە دووربە، سوێند بەخوا بۆگەنی گوێدرێژەکەت نارەحەتی کردم، لەولایشەوە پیاوێکی یارمەتیدەر وەڵامی دایەوەو وتی: «**واللهِ لَحِمَارُ رَسولِ اللهِ - ﷺ - أطْيَبُ رِيحًا مِنْكَ!!**»سوێند بەخوا بۆنی گوێدرێژەکەی پێغەمبەر لە بۆنی تۆ خۆشترە، لەولایشەوە پیاوێکی خزمی عەبدوڵلا لە پیاوە یارمەتیدەرەکە توڕە بوو، دەرەنجام بە پێڵاوو تاکە نەعل و مشتەکۆڵە هاتن بە یەکداو خەریکبوو شتەکە گەورە ببێت! ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی: [ وإن طائفتان.. ]ـی نارد. (صحيح البخاري، كتاب الصلح، باب ما جاء في الإصلاح بين الناس، حديث: ٢٥٦٦، صحيح مسلم،كتاب الجهاد والسير، باب في دعاء النبي ﷺ إلى الله، حديث: ٣٤٤٥). ریوایەتێکی تر دەڵێت: ئەوئایەتە سەبارەت بە جەنگ و ئاژاوەی نێوان ئەوس و خەزرەج هاتووە. شیاوی باسە ئەوەیش دەگەیەنێت کە دەستەو تاقمی (بوغات) (وەک ئیمامی بوخاریی دەڵێت: لە چوارچێوەی ئیسلامەتی دەر ناچن، بۆیە هەرکات دەستیان لە جەنگ هەڵگرت، ئیتر وازیان لێ دەهێنرێ. ئیمامی بوخاری لە (ئەبی بەکرە)وە دەڵێت: ڕۆژێک پێغەمبەر - ﷺ - لەسەر مینبەر فەرمووی: «..**إنَّ ابْنِي هذا سَيِّدٌ ولَعَلَّ اللهَ أنْ يُصْلِحَ بهِ بينَ فِئَتَيْنِ عَظِيمَتَيْنِ مِنَ المُسْلِمينَ**». واتە: ئەم کوڕەم – حەسەنی کچەزای- پیاوێکی بەڕێزو شەریفە،

=

وَلاَ يَسْلُبُونَ الْفَاسِقَ الْمِلِّيَّ اسْمَ الإيمَانِ بِالْكُلِّيَّةِ، وَلاَ يُخَلِّدُونَهُ فِي النَّارِ؛ كَمَا تَقُولُ الْمُعْتَزِلَةُ. بَلِ الْفَاسِقُ يَدْخُلُ فِي اسْمِ الإيمَانِ؛ كَمَا فِي قَوْلِهِ: ﴿ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ﴿٩٢﴾ ﴾ [النساء: ٩٢] ، وَقَدْ لاَ يَدْخُلُ فِي اسْمِ الإيمَانِ الْمُطْلَقِ؛ كَمَا فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا ﴿٢﴾ ﴾ [الأنفال:٢] .

ناوی ئیسلامەتی لەفاسقێکی موسوڵمان بەتەواوی وەرناگرنەوە و، پێیان وانییە بەهەتا هەتایی لەدۆزەخ دا دەمێنتەوە، وەك ئەوەی موعتەزیلەکان دەیڵێن، بەڵکو کەسی فاسق هەندێ جار داخلی ناوی ئیمانی موتڵەق دەبێت، هەروەك لەم ئایەتەدا هاتووە: (با کۆیلەیەکی باوەڕدار ئازاد بکات)، و هەندێ جاریش داخلی ناوی ئیمانی ڕەها(موتڵەق) نابێت و لەئیمانی ڕەها(موتڵەق) بەدەر دەبێت و نایگرێتەوە، هەروەك لەم ئایەتەدا هاتووە: (باوەڕدارانی ڕاستەقینەو دڵسۆز هەر ئەوانەن، کە هەرناوی خوا هێنرا، دڵیان لەبەر گەورەیی ئەو دەکەوێتە لەرزەو، ترسی لێدەنیشێت، هەر کە ئایەتەکانیشی دەخوێنرێنەوە بەسەریاندا. باوەڕیان زیادو بەهێز دەبێ).

وَقَوْلُهُ ﷺ : «لاَ يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلا يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَنْتَهِبُ نَهْبَةً

---

ئومێدەوارم لە ئایندەدا خوای گەورە ئاگری دوو دەستەو تاقمی گەورەی موسڵمانانی پێ بکوژێنێتەوە. صحيح البخاري، كتاب الصلح، باب قول النبي، للحسن بن علي رضي، حديث: ٢٥٧٧ .وەک دەفەرموێ - ﷺ -: «..أُنْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا.. ». صحيح البخاري، كتاب المظالم والغصب، باب: أعن أخاك ظالما أو مظلوما، حديث: ٢٣٣١. واتە: هاوکاری و کۆمەکی براکەت بکە، چ لەکاتی ستەمکردن، وە چ لە کاتی ستەملێکراویش. مەبەست پێی ئەوەبوو کە: باهەموو کەسێک یارمەتی براکەی بدات جا ستەمکاربێت یا ستەم لێکراو، ئەگەر ستەمکار بوو با ڕێگری لێ بکات، ئەوە یارمەتییە بۆی، ئەگەر ستەملێکراویش بوو ئەوە یارمەتی بدات. سەرچاوە (تەفسیری ڕامان).

**ذَاتَ شَرَفٍ يَرْفَعُ النَّاسُ إِلَيْهِ فِيهَا أَبْصَارَهُمْ حِينَ يَنْتَهِبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ»[1]. وَيَقُولُونَ: هُوَ مُؤْمِنٌ نَاقِصُ الإِيمَانِ، أَوْ مُؤْمِنٌ بِإِيمَانِهِ فَاسِقٌ بِكَبِيرَتِهِ، فَلاَ يُعْطَى الاسْمَ الْمُطْلَقَ، وَلاَ يُسْلَبُ مُطْلَقَ الاسْمِ.**

**هەروەها فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ: «زیناکەر لە کاتی زینا کردنەکەدا باوەڕدار نابێت، مەیخۆر لە کاتی مەیخواردنەوەکەیدا باوەڕدار نابێت، دز لە کاتی دزیکردنەکەیدا باوەڕدار نابێت، وە کەسێک، کە خەڵک بۆی بڕوانن لە کاتی تاڵانکردنەکەیدا باوەڕدار نابێت».**

**هەروەها دەڵێین: ئەو باوەڕدارە، بەڵام باوەڕەکەی ناتەواوە، یاخود باوەڕدارە، بەهۆی باوەڕەکەیەوە و فاسیقە، بەهۆی تاوانە گەورەکەیەوە، بۆیە ناوەکەی ـ ناوی ئیمان ـ بەڕەهایی پێنادرێت، وبەڕەهایش ئەو ناوەی لێ وەرناگیردرێتەوە.**

---

## شەرح

ووتەکەی : (ومن أصول أهل السنة والجماعة) واتە : یەکێک لەو قەواعید و بنەمایانەی، کە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەی لەسەری بونیات نراوە (أنَّ الدين) لەڕوی زمانەوانیەوە بریتییە لە : ملکەچ بوون و خۆ زەلیل کردن، ولەڕووی شەرعەوە: ئەوەیە کە خودا فرمانی پێکردووە .

(والإيمان) لەڕوی زمانەوانیەوە بریتییە لە : تەسدیق و بەڕاست دانان، ولەڕووی شەرعەوە: ئەوەیە کە شێخ ئاماژەی پێداوە بەوتەکەی کە دەڵێت : (قول وعمل : قول القلب واللسان وعمل القلب واللسان والجوارح) واتە: پێکهاتووە لەقسەو کردار: قسەی دڵ و زمان، وکرداری دڵ و زمان و لاشە و، ئەمە پێناسەی ئیمانە لەلای ئەهلی

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢٤٧٥)، ومسلم (٥٧).

سوننە و جەماعە: واتە: ئیمان پێك دێت لەقسەو کردار، وقسە دوو بەشە: قسەی دڵ: کە بریتییە لە ئیعتیقاد و بیروباوەڕ و، قسەی زمان: کە بریتییە لە قسەکردن و دەربڕینی وشەیەک کەپێی دێتە نێو ئیسلامەوە، وکردار دوو بەشە: کرداری دڵ: کە ئەویش بوونی نیەت و ئیخلاسە و، کرداری لاشە، واتە: ئەندامەکانی لاشە؛ وەك نوێژ و حەج و جیهاد و تێکۆشان.. هتد.

**جا جیاوازی نێوان وتەی دڵ و کردارەکانی:**

**وتەی دڵ** بریتییە لەو عەقیدە و بیروباوەڕەی، کە کەسەکە لەناخی دا دانی پێدا دەنێت و باوەڕی لەسەر دامەزراوە. بەنیسبەت **کردارەکانی دڵەوە**: بریتییە لەو جوڵە و حەرەکانەی، کە خودا و پێغەمبەرەکەی دەیانەوێت و خۆشیان دەوێت، کە ئەویش خۆشویستنی خێرە و بوونی ویستێکی چەسپاوە لەسەری و، ڕق بوونەوەیە لەخراپە و شەڕ وپێداگری لەسەر وازلێهێنانی . لەڕاستیدا کرداری دڵ و وتەی زمان سەرچاوەی کرداری دڵە. هەربۆیەشە وتەکانی زمان و کردارەکانی لاشە بەشێکن لە ئیمان.

**بۆچوونی تاقم و گروپەکان لەبارەی پێناسەی ئیمانەوە** [1]:

١- لەلای ئەهلی سوننە و جەماعە: بریتییە لە باوەڕی دڵ و دەربڕین بەزمان وکارکردن بەلاشە .

٢- لەلای موڕجیئەکان: تەنها بریتییە لە باوەڕی دڵ و دەربڕین بەزمان.

٣- لەلای کەڕامیەکان: تەنها بریتییە لە دەربڕین بەزمان.

٤- لەلای جەبریەکان: داننانی دڵە یاخود تەنها ناسین و زانینە بەدڵ .

٥- لەلای موعتەزیلەکان:بریتییە لە باوەڕی دڵ و دەربڕین بەزمان وکارکردن بەلاشە.

---

(١) بڕوانە: أقوال أهل السنة في الإيمان، وأقوال من غايرهم من الفرق الضالة في شرح أصول أهـل السنة للالكائي (٨٨٥) والسنة لعبدالله بن أحمد بن حنبل (٣٠٧)، والشريعة للآجري (١٠٨)، وكتاب الإيمان لابن تيمية، والتوسط والاقتصاد لعلوي السقاف.

**جا جیاوازی نێوانیان:** واتە: (جیاوازی نێوان موعتەزیلە و ئەهلی سوننە) : لای موعتەزیلەکان ئەوەی تاوانی گەورە ئەنجام بدات ناوی ئیمانی لێ دادەماڵرێت و بەهەتا هەتایی لەدۆزەخ دا دەمێنێتەوە، بەڵام لای ئەهلی سوننە ئیمانی بەتەوای لێداناماڵرێت، بەڵکو باوەڕداره بەڵام باوەڕەکەی ناتەواوە وگەر چووە دۆزەخەوە بەهەتا هەتایی تێیدا نامێنێتەوە .

هەموو ئەو بۆچوونانەی کە هەیە ناڕاست و باتڵە و تەنها ئەوەی ئەهلی سوننە و جەماعە هەقە؛ لەبەر بوونی چەندان بەڵگە لەسەری.

بڕگەی: (وأن الإيمان يزيد بالطاعة وينقص بالمعصية) واتە: یەکێك لەئەسڵ و بنەماکانی ئەهلی سوننە و جەماعە ئیمانی هەمووان وەك یەك نییە، بەڵکو ئیمانی هەندێك لەئیمانی هەندێکی تر زیاترە و، ئیمان زیاد و کەم دەکات ، بەتاعەت و عیبادەت و خێر و چاکە زیاد دەکات و، بەتاوان و سەرپێچی و خراپە کەم دەکات و، چەندان بەڵگە هەیە لەسەر ئەمە ، لەوانە: فەرمایشتەکەی خودا: ﴿ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا ﴾ [الأنفال : ٢] ، واتە: باوەڕدارانی ڕاستەقینەو دڵسۆز هەر ئەوانەن، کە هەرناوی خوا هێنرا، دڵیان لەبەر گەورەیی ئەو دەکەوێتە لەرزەو، ترسی لێدەنیشێت، هەر کە ئایەتەکانیشی دەخوێنرێنەوە بەسەریاندا، باوەڕیان زیادو بەهێز دەبێ. ئیمامی (بوخاری) و چەندان زانای تر ئەم جۆرە ئایەتانە دەکەنە بەڵگە لەسەر زیادبوونی ئیمان و باوەڕ، هەر وەکو جەماوەری ئەم ئوممەتەیش هەر ڕایان وایە، تەنانەتی پێشەوا (شافعی) و، ئیمامی (ئەحمەد) و هەندێکی دی باسی (ئیجماع)ی لەسەر دەکەن.

هەروەها فەرمایشتی : ﴿ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِيمَٰنٗا مَّعَ إِيمَٰنِهِمۡۗ ﴾ [الفتح : ٤] ، واتە: بۆ ئەوەی بڕوایان زیاد بکات لەگەڵ بڕواکەیاندا، تا تەنها پشت بەخوا ببەستن و دڵیان تەنها یادی ئەوی تیا بەدی بکرێ. وجگە لەم بەڵگانەش بەڵگەی تریش هەن .

هەروەها بڕگەی : (وهم مع ذلك لا يكفرون أهل القبلة بمطلق المعاصي والكبائر كما يفعله الخوارج) واتە : ئەهلی سوننە و جەماعە لەگەڵ ئەوەی پێیان وایە کردار بەشێکە لەئیمان و ئیمان زیاد وکەم دەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەکفیری ئەو کەسە ناکەن بانگەشەی ئیسلامەتی دەکات و ئەهلی قیبلەیە تەنها بەهۆی ئەنجامدانی تاوانەوە هەڵبەت ئەو تاوانانەی کە نەگەشتبێتە ئاستی هاوبەشدانان و کوفر (كما يفعله الخوارج) وەك خەواریجەکان دەیکەن، هەروەك دەڵێن: هەرکەسێك تاوانێکی گەورە لەدونیادا ئەنجام بدات ئەوا کافرە و، لەڕۆژی دوایشدا بەهەتا هەتایی لەدۆزەخ دا دەمێنێتەوە و ڕزگاری نابێت لێی .

بەڵام ئەهلی سوننە پێیان وایە (أن الأخوة الإيمانية ثابتة مع المعاصي) ،واتە: برایەتی ئیمانی لەگەڵ بوونی تاوانیشدا هەر دەمێنێ، کەسی سەرپێچی کار و تاوانبار برامانە، وە شێخ بۆ ئەمە ئایەتەکە، کە باس لەتۆڵەکردنەوە و قیساس دەکات دەکاتە بەڵگە: ﴿فَمَنْ عُفِيَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ ماناکەی ئەوەیە : کەسی سنوور بەزێن و تاوانکار گەر کەسی تاوانلێکراو یاخود کەس و کارەکەی لێی خۆش بوون لەوەی تۆڵەی لێبکرێتەوە و ڕازی بوون بە وەرگرتنی خوێن و قەرەبوو، ئەوا پێویستە ئەوەی خوێنەکەی بەردەکەوێت، بەشێوەیەکی جوان داوای بکات، بەبێ هیچ توند و تیژیەك و، پێویستیشە لەسەر ئەوەی خوێن و قەرەبووەکەی لەسەرە بەجوانی و لەکاتی خۆیدا بیدات بەبێ دواخستن و خۆ دزینەوە لەو ماف و هەقەی کە لە سەریەتی.

**وەك دیارە لێرەدا ئایەتەکە:** کەسی بکوژی بە برای کوژراوەکە ناوەزد کردووە لەکاتێکدا کوشتن یەکێکە لەتاوانە گەورەکان، بۆیە برایەتی ئیمان هەر دەمێنێت.

هەروەها شێخ ئەم فەرمایشتەی تری خودای کردووەتە بەبەڵگە کە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا﴾ ،واتە: گەر دوو کۆمەڵ دژی یەک جەنگان ئەوا ئێوە ئاشتەوایی و سوڵح بکەن لەنێوانیاندا. لەم ئایەتەشدا ناوی

هەردوو تاقمەکەی ناوە باوەڕدار، لەگەڵ بوونی کوشتار و سنوور بەزاندن بەرانبەر بەیەک هەروەك فەرموویەتی: ﴿فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَ أَخَوَيۡكُمۡۚ﴾ واتە: ئاشتەوایی و سوڵح بکەن لەنێوان براکانتاندا.

**جا مانای ئایەتەکە بەکورتی:** کاتێ دوو کۆمەڵ لەموسوڵمان کوشتاریان کرد پێویستە، لەسەر موسوڵمانی تر هەوڵی ئاشتەوایی و سوڵح بدەن لەنێوانیاندا و بانگیان بکەن بۆلای حوکمی خودا، خۆ ئەگەر دوای ئەوە هەر دەستدرێژیەک ڕوویدا لەلایە یەکێک لەدوو کۆمەڵەکەوە وڕازی نەبوو بەئاشتەوایی و سوڵحەکە ئەوا پێویستە لەسەر موسوڵمانان کوشتاری ئەو تاقمە لەفەرمان دەرچووە بکەن تاوەکو دەگەڕێنەوە بۆلای حوکمی خودا و پێی ڕازی دەبن و مل کەچ دەکەن بۆی، خۆ ئەگەر ئەو تاقمە گەڕایەوە و وازی لەدەستدرێژیەکەی هێنا و وەڵامی بانگەوازی کردنی بۆلای حوکمی خودا دایەوە، ئەوا پێویستە لەسەر موسوڵمانان دادپەرور بن لەنێوان ئەو دوو تاقمەدا لەحوکم کردن لەنێوانیاندا و هەوڵی دادپەروەی و جێبەجێ کردنی حوکمی خودا بدەن لەنێوانیاندا بەشێوەیەکی دادپەروەرانە و بێلایەنانە و هەوڵی ڕێگری کردن بدەن لەتاقمی ستەمکار، تاوەکو واز لەستەمەکەی بێنێت و ئەو مافەی کە لە سەریەتی بیگێڕێتەوە بۆ تاقمی بەرانبەر .

پاشان خوای پەروەردگار فرمان بەموسوڵمانان دەکات دادپەروەر بن لەهەموو کایەکانی تری ژیانیاندا، دوای فرمان کردن پێیان بەدادپەروەر بوون بەتایبەت لەنێوان ئەو دوو تاقمەدا کە کوشتاری یەک دەکەن و، فەرمووی: ﴿وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾ واتە : دادپەروەر بن؛ چونکە بەڕاستی خودا کەسانی دادپەروەری خۆشدەوێت. جا فەرمایشتی: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٌ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾ڕستەیەکی تازەیە و جەخت لەپێش خۆی دەکاتەوە، کە ئەویش فرمان کردنە بە ئیسڵاح و چاکەخوازی. **وە ماناکەی ئەوەیە:** ئەوان هەموان دەگەڕێنەوە بۆ یەك شت، کە ئەویش ئیمانە و ئەوان

برای دینین، ﴿فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَ أَخَوَيۡكُمۡۚ﴾ واتە : هەردوو موسوڵمانێك كە توشی كێشە بوون و شەڕ و كوشتاری یەكیان كرد ئەوا ئاشتەوایی و سوڵح بكەن لەنێوانیاندا و هەوڵی چارەسەركردنی كێشەكەیان بدەن، جا باسكردنی دوو كەس بەتایبەت بەوەی پێویستە سوڵح بكرێت لەنێوانیاندا بێگومان گەر زیاتر و زۆرتر بن ئەوا لەپێشترە بۆ ئیسلاح كردن لەنێوانیاندا﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ ، تەقوا و لەخوا ترسانتان هەبێت لەهەموو كار و بارێكتاندا ﴿لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾ بەڵكو ڕەحمتان پێبكرێت بەهۆی تەقواكەوە .

ووتەكەی كەدەڵێت : (ولا يسلبون الفاسق الملّي الإسلام بالكلية ولا يخلدونه في النار كما تقوله المعتزلة) واتە : ویەكێك لە ئەسڵ و بنەماكانی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوەیە ئەوان (لا يسلبون) واتە : نەفی ئیمان ناكە لە كەسی (الفاسق) و(**الفسق**) :بریتییە لە دەرچوون لەتاعەتی خود و بەگوێنەكردنی، وە مەبەست لە (**الفاسق**) لێرەدا : ئەو كەسەیە كە هەندێ تاوانی گەورە ئەنجام دەدات؛ وەك خواردنەوەی مەی و زیناكردن و دزیكردن، لەگەڵ باوەڕبوون بەحەرامیەتی ئەم شتانە (المِلِّي) واتە : ئەوەی لەسەر ئاینی ئیسلامە و تاوانێكی ئەنجام نەداوە كافری بكات، جا ئەهلی سوننە و جەماعە بەتەواوی ئیسلامەتی لێ داناڕنن و حوكمی كوفر بدەن بەسەریدا، وەك ئەو حوكمەی كە خەواریجەكان دەیدەن بەسەریدا لەدونیادا (ولا يخلدونه في النار ) واتە : لەڕۆژی دوایی دا حوكمی مانەوەی بەهەتا هەتایی لەدۆزەخ دا نادەن بەسەریدا، بەشێوەیەک گەر چووە دۆزەخ ئیتر ڕزگاری نەبێت لێی (كما تقوله المعتزلة)وەك ئەوەی موعتەزیلەكان دەیڵێن، وهەروەها خەواریجەكانیش، موعتەزیلەكان پێیان وایە كەسی فاسق پێی ناوترێت موسوڵمان و پێشی ناوترێت كافر، بەڵكو لای ئەوان لەو نێوەندەدایە كە مەشهورە بە (**المنزلة بين المنزلتين**)، ئا ئەمە حوكمی فاسقە لای ئەوان، هەڵبەت لەدونیادا، بەڵام حوكمی لە ڕۆژی دوایی دا بەهەتا هەتایی لەدۆزەخ دا دەمێنێتەوە، بەڵگەش لەسەر ناڕاستی وناهەقی ئەم مەزهەب و بۆچوونە زۆر زۆرە و، دواتر بەڵگەكانی تر دەخەینە ڕوو .

پاشان شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) حوکمە صەحیح و درووستەکە، ئەوەی کە جێبەجێ دەبێت بەسەر فاسقی باوەڕداردا بە بەڵگەی قورئان وسوننەت ڕوونکرووەتەوە و دەڵێت : (بل الفاسق يدخل في اسم الإيمان المطلق) بەڵکو کەسی فاسق ئیمانی ڕەها - جنسی باوەڕی - پێدەرێت، واتە : ئیمانی ڕەها کە هەریەك لەئیمانی کامڵ و ناتەواو لاوازیش لەخۆ دەگرێت هەروەك لەم فەرمایشتەدا هاتووە : ﴿فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مُّؤۡمِنَةٖ﴾ ،واتە: ڕزگار کردنی بەندەیەکی باوەڕدار، جا هەرکەسێك لەم حاڵەتەدا بەندەیەکی باوەڕدار هەرچەند فاسقیش بێت ڕزگار بکات لەو کەفارەتانەدا کە مەرجە بەندە ئازاد کراوەکە باوەڕدار بێت - وەك کەفارەتی زیهاڕ و کوشتن - ئەوا درووستە و کەفارەتەکەی لەسەر لادەچێت بە کۆدەنگی زانایان؛ چونکە ئایەتەکە عام و گشتگیرە و بەندەی فاسقیش دەگرێتەوە هەرچەند باوەڕەکەشی بەهۆی فسقەکەوە کامڵ نەبێت .

ووتەکەی : (وقد لا يدخل) واتە : هەندێ جار فاسقی موسوڵمان داخلی (في اسم الإيمان المطلق) واتە: ناوی ئیمانی ڕەها نایگرێتەوە، گەر مەبەست لەئیمانەکە ئیمانی کامڵ بێت، هەروەک لەم فەرمایشتەی خودادا هاتووە: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ﴾ ،واتە: باوەڕداری ڕاستەقینە ئەوانەن کە کاتێ ناوی خودایان لەلادا دەبرێت، دڵەکانیان دادەخورپێ و ترس دایاندەگرێت ؛ چونکە مەبەستی ئیمان لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئیمانی کامڵە بۆیە کەسی فاسق ناگرێتەوە؛ لەبەرئەوەی کەسی فاسق ئیمانەکەی ناتەواو و لاوازە.

با بگەڕێینەوە بۆ تەفسیری ئایەتە پیرۆزەکە، وشەی : ﴿إِنَّمَا﴾ ئاداتی حەسرە و حوکمەکە بۆ ناوبراو ئیسپات دەکات و نەفی دەکات لەوانی تر ﴿ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ ، واتە : باوەڕداری کامڵ﴿إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ﴾ ، واتە : باسی گەورەیی و عەزەمەت وتوانای خودا کرا وئەو شتەی کە هەڕەشەی پێکردووە لەوانەی سەرپێچی دەکەن ﴿وَجِلَتۡ

قُلُوبُهُمۡ ﴾ ، واتە : ترس دڵەکانیان دادەگرێت﴿وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ﴾ ،واتە : کاتێ ئەو ئایەتانەی، کە دابەزیون دەخوێندرێتەوە یاخود باسی نیشانە و بەڵگە گەردوونی و کەونییەکانی دەکرێت ﴿زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا﴾ ، واتە : بەوهۆیەوە باوەڕیان زیاد دەکات ﴿ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ واتە : پشت بەپەروەردگاریان دەبەستن و هەموو کار و بارەکانیان دەدەنە دەست خودا نەك کەسانی تر .

پاشان شێخ بەڵگەیەکی هێناوەتەوە لەسەر ئەوەی فاسقی موسوڵمان داخلی ناوی ئیمانی کامڵ نابێت، کەئەویش فەرمایشتەکەی پێغەمبەرە ﷺ کە دەفەرمووێت: «لا یزني الزاني حین یزني وهو مؤمن . ..» هتد واتە: کەسی زیناکار لەکاتی زیناکەیدا باوەڕدار نیە، واتە : باوەڕی کامڵ و تەواو نییە، ئەوەی لێرەدا لە کەسی زیناکار نەفی کراوە: باوەڕی کامڵە نەك هەموو ئیمان و باوەڕ، بەبەڵگەی ئەوەی کۆدەنگی هەیە لەسەر ئەوەی کەسی زیناکار میرات دەبات، کەواتە باوەڕدار و کافر نیە . فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەسی زیناکار لەکاتی زیناکەیدا ئیمانی تەواو نییە و، چەندان بەڵگەی قورئان و فەرموودە هەیە کە بەو کارەی لەئیسلام دەرناچێت و مورتەد نابێتەوە، کەواتە ئەو ئیمانەی کە لەم فەرموودەیەدا نەفی کراوە ئیمانی کامڵ و واجبە نەك جنسی ئیمان.

ووتەکەی : «ولا ینتهب نهبة ذات شرف . . . » هتد وشەی **(النُهبة)** : بەزەمی **(النون)**ـەکە بریتییە لە شتێکی زەوتکراو ، و**(النهب)** : وەرگرتنی ماڵە بەزۆر و زەوتکردنیەتی «ذات شرف» واتە : بەنرخ و بەها ، و وتراوە: بەرز و بڵند وخەڵك چاوەکانیان بەرزدەکەنەوە بۆی و تەماشای دەکەن .

پاشان شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) باسی ئەنجامی لێکۆڵینەوەی پێشوو دەکات و حوکمەکەی لەبارەی فاسقی باوەڕدارەوە دەخاتە ڕوو و دەڵێت: (ونقول : هو مؤمن ناقص الإیمان، أو مؤمن بإیمانه، فاسق بکبیرته) ،واتە: دەڵێین: ئەو باوەڕدارێکی باوەڕ نوقسان و لاوازە، یاخود باوەڕدارە بەهۆی باوەڕەکەیەوە، وفاسقە

بەهۆی تاوانە گەورەکەیەوە، ئا ئەمە حوکمە دادپەروەرانەکەیە؛ لەپێناو جەمع کردن لەنێوان ئەو دەقانەی، کە نەفی ئیمانی لێدەکەن، وەك ئەم فەرموودەیە : «**لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن**»،واتە: کەسی زیناکار لەکاتی زیناکەیدا باوەڕدار نییە. لەگەڵ ئەو دەقانەی، کە ئیسپاتی ئیمانی بۆ دەکەن، وەك ئایەتەکەی کە باس لەقیساس و تۆڵەسەندنەوە دەکات و هەروەها ئایەتەکەی کە باس لەحوکمی بوغات و یاخی بوانی باوەڕدار دەکات، کەواتە (فلا يعطى الاسم المطلق) واتە : ئیمانی کامڵی پێنابەخشرێت (ولا يسلب مطلق الاسم) واتە: ئیمانی ناتەواو و لاوازیشی لێ ناسەندرێتەوە و حوکمی دەرچوون لەئیمان نادرێت بەسەریدا، وەک ئەوەی موعتەزیلە و خەواریجەکان دەیڵێن . والله أعلم ، جا ئیمانی موتڵەق: بریتییە لەئیمانی کامڵ، وموتڵەقی ئیمانیش، بریتییە لەئیمانی ناتەواو و لاواز .



## واجبی ئێمە بەرانبەر هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ و باسکردنی پێگە و فەزڵ و پلەو پایەیان

**فَصْلٌ : وَمِنْ أُصُولِ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ سَلاَمَةُ قُلُوبِهِمْ وَأَلْسِنَتِهِمْ لأَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ـ ﷺ ـ كَمَا وَصَفَهُمُ اللهُ بِهِ فِي قَوْلِـــهِ تَعَالَى: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾ ﴾[الحشر: ١٠] ، وَطَاعَةَ النَّبِيِّ ـ ﷺ ـ فِي قَوْلِهِ: «لاَ تَسُبُّوا أَصْحَابِي فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلا نَصِيفَهُ»[1] .**

**یەکێك لەئەسڵ و بنەماکانی ئەهلی سوننەو جەماعە سەلامەتی زمان و دڵیانە بەرانبەر هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەروەك خوای پەروەردگار وەسفی کردوون بەوە و فەرموویەتی: (ئەوانەش لە دوای ئەوانەوە هاتوون، واتە: پاش کۆچکەران و یارمەتیدەرانەوە هاتوون، دەڵێن: ئەی پەروەردگارەکەمان! لە ئێمەو لەو برایانەمان پێش ئێمە باوەڕیان هێناوە خۆشببە و هیچ بوغزو قینێک مەخەرە دڵمانەوە بەرانبەر بەوکەسانە باوەڕیان هێناوە ئەی پەروەردگاری ئێمە! بەڕاستیی تەنها ئەتۆی بە سۆزی میهرەبان).**

**هەروەها گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەر ﷺ لەم فەرمایشتەیدا: «جوێن بەهاوەڵانم مەدەن، سوێندبێ بەوەی گیانی منی بەدەستە، گەر یەکێك لەئێوە بەئەندازەی کێوی ئوحود ئاڵتون ببخەشێت، هێشتا ناگاتە مشتی یەکێك لەوان و بگرە نیوەشی».**

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٣٦٧٣)، ومسلم (٢٥٤١).

## شەرح

واتە : یەکێك لەئەسڵ و بنەماکانی عەقیدەی ئەهلی سونەو جەماعە (سلامة قلوبهم) سەلامەتی دڵیان لەڕق و کین و بوغز، وسەلامەتی (ألسنتهم) زمانیان لەتانە و نەفرەت و جوێن (لأصحاب رسول الله ﷺ)لەئاست هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ؛ لەبەرئەو ڕێز و فەزڵ ولەپێشینە بوونەی، کە هەیانە ولەبەر تایبەتمەندیان لەهاوەڵی کردنی پێغەمبەردا ﷺ، هەروەها لەبەر ئەو پلەو پایەو چاکەیەیی کە هەیانە بەسەر ئومەتی ئیسلامیەوە؛ لەبەرئەوەی ئەوان بوون شەریعەتەکەی پێغەمبەریان ﷺ هەڵگرت و گەیاندیانە دوای خۆیان، هەروەها لەبەر ئەو جیهاد و تێکۆشانەی کە لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ کردیان و سەریان خست. جا مەبەستی شێخ لەم بەشەدا وەڵامدانەوەی ڕافیزەکانە، ئەوانەی جوێن بەهاوەڵان دەدەن و ڕقیان لێیانە ونکۆڵی لەڕێز و فەزڵیان دەکەن، هەروەها مەبەستی بەریکردنی ئەهلی سونە و جەماعەیە لەو مەزهەبە پیسە، ئەوان لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەرەکەیانن، هەروەك خودا وەسفی کردوون لەم فەرمایشتەیدا: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ ﴾واتە : ئەوانەی دوای کۆچبەران و ئەنسارەکان هاتوون، کە بریتین لەتابیعین، ئەوانەی بەجوانترین شێوە شوێنی هاوەڵان دەکەون، تا ڕۆژی دوایی لەگشت موسوڵمانان بە عەوام وخەواصەوە﴿ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ ﴾مەبەست لەبرا لێرەدا برایەتی دینیە، ئەوان داوای لێخۆش بوون بۆ خۆیان و ئەوانەی پێش خۆیان لەموهاجیرین و ئەنسارِ دەکەن ﴿وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا ﴾ واتە : لەدڵەکانماندا ڕق و کین و حەسوودی مەهێڵە ﴿ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ واتە : لەئاست

ئیمانداران و هاوەڵان، لەپێشترن لەوەی ئەم دوعایە بیانگرێتەوە و مەبەست بن؛ چونکە ئەوان باشترینی باوەڕدارانن ولەبەر ئەوەی سیاقی ئایەتە لەبارەی ئەوانەوەیە .

**ئیمامی شەوکانی** (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت[1]: هەرکەسێك داوای لێخۆشبوون بۆ هاوڵان نەکات بەگشتی و داوای ڕازی بوونی خودایان بۆ نەکات، ئەوا پێچەوانەی فرمانی خودای کردووە، ئەوەی کەلەم ئایەتەدا فرمانی پێکردووە، جا ئەگەر لەدڵیدا ڕقێکی هەبوو بەرانبەریان ئەوا توشی داوی شەیتان بووە و توشی تاوان وسەرپێچی خودا بووە بەهۆی دژایەتی کردنی بۆ ئەولیاو خۆشویستانی خودا و باشترینی ئەم ئومەتە دوای پێغەمبەرەکەی ﷺ، و دەرگای سەرشۆڕی بۆ کراوەتەوە و لێوەی توشی چوونە نێو دۆزەخ دەبێت، گەر فریایی خۆی نەکەوێت بەپەنابردنە بەر خودا و داوای یارمەتی کردن لێی بەوەی ئەو ڕق و کینەی لەدڵ دەربێنێت بەرانبەر باشترین کەسانی سەردەم و ڕێزدارترینی ئەم ئوممەتە، خۆ ئەگەر سنوور ببەزێنێت لەڕق لێبوونەوە بۆ جوێندان و قسە پێگوتن ئەوا بەتەواوی ملکەچ بووە بۆ شەیتان و جڵەوی خۆی ڕادەستی شەیتان کردووە و، توشی توڕەیی و غەزەبی خودا بووە، ئا ئەم دەردە کوشندەیە توشی کەسانێك دەبێت کە توشی بەڵای مامۆستایەکی ڕافیزەیی بووبێت، یاخود هاوەڵێکی لەدوژمنانی باشترینی ئەم ئوممەتە ئەوانەی کە شەیتان فێڵی لێکردوون ودرۆ و بوهتانی بۆ ڕازاندوونەتەوە و، چەندان چیرۆکی درۆینەی لا جوان کردوون و توشی ئەفسانە و خوڕافیات و شتی بێ بنەما بوون و، دووری خستوونەتەوە لەقورئانەکەی خودا، ئەوەی کە ناهەق و باتڵی بەهیچ شێوەیەک تێدا نییە .

✍ **شایەتحاڵ لەم ئایەتە پیرۆزەدا:**

تێیدا تیشک خراوەتە سەر ڕێز و پلەی هاوەڵان؛ لەبەرئەوەی یەکەم کەسانێك بوون کە باوەڕیان هێنا، وفەزڵ و ڕێزی ئەهلی سوننە ئەوانەی کە هاوەڵانیان خۆشدەوێت و

---

(١) فتح القدير (٥/ ١٩٩).

زەمکردن و سەرزەنشت کردنی ئەوانەش کە دوژمنایەتیان دەکەن، لەم ئایەتە دروستی پاڕانەوەی تێدایە بۆ هاوەڵان وداوای ڕەزامەندنی لەخودا کردن بۆیان و، تێیدا تیشک خراوەتە سەر سەلامەتی دڵ و زمانی ئەهلی سوننە لەئاست هاوڵانی پێغەمبەری خوادا ﷺ، لەوتەکەیاندا : ﴿رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا﴾هتد.. سەلامەتی زمانی تێدا بەدی دەکرێت . وقسەکەی تریشیانیش : ﴿وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ سەلامەتی دڵی لەخۆ گرتووە لەئاستیاندا.

لەئایەتەکەدا جوێندان و ڕق لێبوونەوەیان حەرام کراوە و ئەوە لەکار و پیشەی موسوڵمان نییە، هەرکەسێك ئەوە بکات ئەوا شایستەی پێدانی هیچ بەشێك لەغەنیمەت و دەستکەوتی جەنگ نابێت .

ووتەکەی : (وطاعة النبي ﷺ في قوله) واتە : ئەهلی سوننە گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ دەکەن لەپاراستنی سەلامەتی دڵ و زمانیان لەئاست هاوەڵانی دا ودەست هەڵگرتن لەجوێندان پێیان و بەکەم تەماشا کردنیان لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کردوون لەوە و فەرموویەتی : «لا تسبوا أصحابي» واتە : هاوەڵانم بەکەم تەماشا مەکەن و جوێنیان پێمەدەن «أصحابي» : جەمعی(**صاحب**)ـە و، بەو کەسە دەوترێت کە هاوەڵی پێغەمبەری ﷺ کربێت، و(**صحابي**) بەو کەسە دەوترێت گەشتبێت بەخزمەت پێغەمبەر ﷺ و باوەڕی پێی هێنابێت و لەسەر ئەو حاڵە مردبێت .

«فوالذي نفسي بيده» واتە: سوێندبێ بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە. ئەمە سوێندێکە لەپێغەمبەرەوە ﷺ مەبەست لێی جەختکردنەوەی دوای خۆیەتی «لو أن أحدكم أنفق مثل أحد ذهباً» واتە: گەر یەکێك لەئێوە بەئەندازەی کێوی ئوحود زێڕ ببخەشێت ، و«أحد» : کێوێکی بەناوبانگە لەشاری مەدینە، هۆکاری ناونانی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە بەتەنهایە وجودایە لەکێوەکانی تر، و «ذهباً» مەنصوبە؛ چونکە تەمییزە «ما بلغ مد أحدهم» واتە: ناگاتە مشتێکی ئەوان، و(**المُد**): کێشێکە، کە بریتیە لە چوار صاعی پێغەمبەر ﷺ «ولا نصيفه» ،واتە: ونە نیوەشی.

**ماناکەی ئەوەیە:** بەخشینێکی زۆر لەلایەن کەسانێک کە لەهاوەڵان نەبن ناگاتە بەخشینی هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت)هەرچەند کەمیش بێت، ئەوەش لەبەر ئەو ئیمانەی، کە هەیان بوو لەکاتی ماڵ بەخشیندا لەسەرەتای هاتنی ئیسلام دا وکەمی موسوڵمانان و زۆری ڕێگریەکان لێی و لاوازی هۆکارەکانی بەرەو ئیسلام چوون ئا لەبەر ئەم هۆکارانە بەخشینی هیچ کەسێک دوای ئەوان با زۆریش بێت ناگات بەهی هاوەڵاندا هەرچەند کەمیش بێت.

**✍ شایەتحاڵی فەرموودەکە:**

لەفەرموودەکەدا حەرامییەتی جوێندان بەهاوەڵان بەدی دەکرێت، لەگەڵ ئاماژەدان بەڕێز و فەزڵیان بەسەر جگە لەخۆیاندا و، کردەوە بەپێی نیەتی خاوەنەکەی و کاتەکەی جیاوازە ولەیەک ئاستدا نییە . والله أعلم . ولەفەرموودەکەدا ئەوە بەدی دەکرێت: (هەرکەسێك هاوەڵانی خۆش بوێت و بەباشە باسیان بکات ئەوا بێگومان گوێڕایەڵی پێغەمبەری ﷺ کردووە و، ئەوەش جوێنیان پێبدات و ڕقی لێیان بێت، ئەوا بەدڵنیاییەوە سەرپێچی پێغەمبەری ﷺ کردووە) .



# پێگە و ڕێزی هاوەڵان و هەوڵوێستی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بەرانبەریان و ڕوونکردنەوەی ڕێز و پلەبەندیان لەنێو خۆیاندا

وَيَقْبَلُونَ مَا جَاءَ بِهِ الْكِتَابُ وَالسَّنَّةُ وَالإِجْمَاعُ مِنْ فَضَائِلِهِمْ وَمَرَاتِبِهِمْ.

وَيُفَضِّلُونَ مَنْ أَنْفَقَ مِنْ قَبْلِ الْفَتْحِ ـ وَهُوَ صُلْحُ الْحُدَيْبِيَةِ ـ وَقَاتَلَ عَلَى مَنْ أَنْفَقَ مِنْ بَعْدُ وَقَاتَلَ. وَيُقَدِّمُونَ الْمُهَاجِرِينَ عَلَى الأَنْصَارِ. وَيُؤْمِنُونَ بِأَنَّ اللهَ قَالَ لأَهْلِ بَدْرٍ ـ وكَانُوا ثَلاثَ مِائَةٍ وَبِضْعَةَ عَشَرَ ـ: (اعْمَلُوا مَا شِئْتُم. فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ). وَبِأَنَّهُ لاَ يَدْخُلُ النَّارَ أَحَدٌ بَايَعَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ؛ كَمَا أَخْبَرَ بِهِ النَّبِيُّ ـ ﷺ ـ بَلْ لَقَدْ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ، وكَانُوا أَكْثَرَ مِنْ أَلْفٍ وَأَرْبَعِ مِائَةٍ . وَيَشْهَدُونَ بِالْجَنَّةِ لِمَنْ شَـــهِدَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ـ ﷺ ـ كَالْعَشَرَةِ، وَثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بنِ شَمَّاسٍ، وَغَيْرِهِم مِّنَ الصَّحَابَةِ.

وَيُقِرُّونَ بِمَا تَوَاتَرَ بِهِ النَّقْلُ عَنْ أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ـ وَغَيْرِهِ مِنْ أَنَّ خَيْرَ هَذِهِ الأُمَّةِ بَعْدَ نَبِيِّهَـا : أَبُو بَكْرٍ، ثُمَّ عُمَرُ. وَيُثَلِّثُونَ بِعُثْمَانَ، وَيُرَبِّعُونَ بِعَلِيٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ؛ كَمَا دَلَّتْ عَلَيْهِ الآثَارُ، وكَمَا أَجْمَعَ الصَّحَابَةُ عَلَى تَقْدِيمِ عُثْمَانَ فِي الْبَيْعَةِ. مَعَ أَنَّ بَعْضَ أَهْلِ السُّنَّةِ كَانُوا قَد اخْتَلَفُوا فِي عُثْمَانَ وَعَلِيٍّ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ـ بَعْدَ اتِّفَاقِهِمْ عَلَى تَقْدِيمِ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ ـ أَيُّهُمَا أَفْضَلُ؟ فَقَدَّمَ قَوْمٌ عُثْمَانَ: وَسَكَتُوا، أَوْ رَبَّعُوا بِعَلِيٍّ، وَقَدَّمَ قَوْمٌ عَلِيًّا، وَقَوْمٌ تَوَقَّفُوا. لَكِنِ اسْتَقَرَّ أَمْرُ أَهْلِ السُّنَّةِ عَلَى تَقْدِيمِ عُثْمَانَ، ثُمَّ عَلِيٍّ. وَإِنْ كَانَتْ هَذِهِ الْمَسْأَلَةُ ـ مَسْأَلَةُ عُثْمَانَ وَعَلِيٍّ .

ئەهلی سوننە لەبارەی پێگە و فەزڵی هاوەڵانەوە ئەوە قەبوڵ دەکەن کە لەقورئان و سوننە و کۆدەنگی زانایاندا هاتووە. وڕێزی ئەوانەی، کە لەپێش فەتحی مەککە ـ کە بریتییە لەسوڵحی حودەیبیە ـ ماڵی بەخشیبێ و جەنگابێ بەسەر ئەوانەدا کە دوای ئەوە ماڵی بەخشیبێ و جەنگابێ، وموهاجیرەکان پێش دەخەن بەسەر ئەنسارەکاندا و،

باوەڕیان بەوە هەیە، کە خودا بەئەهلی بەدری فەرموو ـ کە ژمارەیان سێسەد و دە نەفەر زیاتر بوو ـ : (چ دەکەن بیکەن من لێتان خۆشبووم). وباوەڕیان بەوە هەیە، ئەوانەی بەیعەتیان دابێت لەژێر دارەکەدا ناچنە دۆزەخەوە، هەروەك پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە لەو بارەیەوە، بەڵکو خودا لێیان ڕازی بووە و ئەوانیش لەخودا ڕازی بوون، ژمارەیان هەزار و چوارسەد کەس دەبوو. وشایەتی دەدەن بەبەهەشت بۆ ئەوانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ شایەتی بۆ داون: وەك دە کەسەکەی، کە موژدەی بەهەشتی بۆ دابوون، وبۆ سابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس، وجگە لەوانیش لەهاوەڵان. ودان دەنێن بەوەی کە بەموتەواتری لەپێشەوای باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبو تالیب و جگە لەویشەوە هاتووە بەوەی باشترینی ئەم ئومەتە دوای پێغەمبەرەکەی: ئەبو بەکرە، پاشان عومەر. ولەڕیزبەندی سێیەمدا عوسمان دێنن، ولەچوارەمیشدا عەلی دێنن (خودا لەهەموویان ڕازی بێت)، هەروەك لەبەڵگەو ئەسەرەکاندا هاتووە، وهەروەها هاوەڵان کۆدەنگن لەسەر پێشخستنی عوسمان لەبەیعەتدا.

لەکاتێکدا هەندێ لەئەهلی سوننە جیاوازن لەپێشخستنی عوسمان و عەلی دا، کە ئایە کامیان باشترە؟ هەڵبەت ئەمە دوای کۆدەنگیان لەپێشخستنی ئەبو بەکر و عومەردا، هەندێك عوسمانیان پێشخستووە پاشان بێدەنگ بوون، یاخود لەڕیزبەندی چوارەم دا عەلییان هێناوە، وتاقمێکی تر عەلییان پێشخستووە، وتاقمێکی تر تەوەقوفیان کردووە لەم بابەتەدا وبێدەنگ بوون، بەڵام بۆچوونی ئەهلی سوننە لەسەر پێشخستنی عوسمان جێگیر بووە، پاشان عەلی.

## شەرح

شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، لەم بەشەی قسەکانیدا جیاکاری هاوەڵانی ڕوون کردەوە دوای ئەوەی پێشتر فەزڵ و ڕێزیانی ڕوون کردەوە و هەڵوێستی ئەهلی سوننەو جەماعەی لەو بارەیەوە خستە ڕوو .

ووتەکەی: (ويقبلون) وە قبوڵی دەکەن، واتە: ئەهلی سوننەت و جەماعە (ما جاء في الكتاب والسنة والإجماع) ئەوەی لە قورئان و سوننەت و ئیجماعدا هاتووە، واتە: کۆدەنگی و تەوافوقی موسڵمانان (من فضائلهم ومراتبهم)سەبارەت بە فەزیلەت و پلە و پایەیان، و ئەم سێ سەرچاوەیە بەسە وەک شایەتحاڵی ڕێز و فەزیلەتەکانیان .

جگە لەوەش لە فەزیلەتدا یەک پلەیان نییە، بەڵکو بەپێی پێشینەییان بەرانبەر ئیسلام و جیهاد و کۆچکردن و بەپێی ئەوەی لە کردارەکانیان بەرانبەر پێغەمبەرەکەیان و ئایینەکەیان کردوویانە، خوا لێیان ڕازی بێت ؛ هەر بۆیە شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت : (ويفضلون من أنفق من قبل الفتح ـ وهو صلح الحديبية) ؛وە ئەوانەیان پێ باشترە کە پێش فەتح ماڵیان بەخشیوە، کە بریتییە لە سوڵح و پێکهاتنەکەی حودەیبیە؛ چونکە خودا بە وتەی خۆی، واتە (سوڵح و پێکهاتنەکەی) بە فەتح ناوی بردووە، هەروەك فەرموویەتی: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴾ [الفتح: ١] ، واتە: بێگومان ئێمە - بە هۆی پێکهاتنەکەی حودەیبیەوە- فەتحێکی ئاشکرامان بۆ کردیت ئەی موحەممەد! -ﷺ- واتە: بەو فەتحە دەرگای سەرکەوتنمان لێکردیتەوەو، پاشان شاری مەککەمان بۆ فەتح کردیت و، حودەیبیە بوو بە پێش قەرەوڵی ئەو

فەتحە، جا کەوابوو هەر لە ئێستاوە وەکو ئەوە وایە، کە وڵاتەکەمان بۆت فەتح کردبێت[١] .

ئەوەش ئەو ڕاستییە مەشهور و زانراوەیە کە مەبەست لە فەتحکردنەکە پەیمانی حودەیبیەیە؛ چونکە سورەتی (**الفتح**)بەماوەیەکی دوای ئەو ڕووداوە هاتە خوارەوە.

و(الحديبية) [٢]: بیرێکە لە نزیک شاری مەککە، کە لە لایدا بەیعەت لە ژێر دارێکدا درا، ئەوەش کاتێک ڕویدا، کە موشریکەکان ڕێگرییان لە پێغەمبەری خودا ﷺ و هاوەڵەکانی کرد لە چوونە ناو مەککە، بۆیە بەیعەتیان پێدا لەسەر مردن. جا ئەم بەیعەتە پێی دەگوترا فەتح؛ لەبەرئەوەی بەهۆیەوە خێر و سەرکەوتنێکی زۆر بەدەست هات بۆ موسوڵمانان.

بەڵگەی ڕێزدارتربوونی ئەوانە: فەرمایشتەکەی خوایە، کە دەفەرمووێت : ﴿ لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَٰتَلَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَقَٰتَلُوا۟ ۚ﴾[الحديد: ١٠] ، واتە: چوونیەک و یەکسان نین ئەو کەسەتان کە پێش (فەتح) و (ئازادکردنی مەککە) ماڵ و دارایی خۆی بەخت کردووەو، لەگەڵ دوژمنانی خوادا جەنگاوە، لەگەڵ ئەوانەی تردا، کە پاش فەتحی مەککە دێن و ماڵ و دارایی خۆیان بەخت دەکەن و دەجەنگێن، چونکە پێش ئازادکردنی مەککە، زیاتر پێویستی بە بەخشینی ماڵ بوو. ئا ئەوانە، کە لە پێش فەتحی مەککەوە ماڵیان بەختکردووەو

---

(١) جەماوەری زانایان پێیان وایە کە ئەم (**فەتحە**) پێکهاتنەکەی حودەیبیەیە، چونکە لە دواییدا بوو بەهۆی فەتحی مەککە، بۆیە حودەیبییە لە پلەو پایەدا لەفەتحی مەکە کەمتر نییە، بەتایبەت لەو ماوەیەدا خەڵکی تێکەڵی یەکتر بوون، وە زۆرێکی زۆرینەیان لە ماوەی سێ ساڵدا موسڵمان بوون.. ئەم سوورەتەیش وەک (**ئیبن کەسیر**) دەڵێ: ئەوکاتە هات کە پەیامبەر-ﷺ- لە مانگی (**ذوالقعدة**)ی ساڵی شەشەمی کۆچی لە حودەیبییە گەڕایەوە، چونکە ئەوان نەیانهێشت بڕواتە (**مسجد الحرام**)ـەوە.. (مەراغیی) دەڵێ: ئێمەش ئەمەمان هەڵبژارد. (**تەفسیری ڕامان**).

(٢) بڕوانە : «مرويات غزوة الحديبية» للدكتور حافظ الحكمي (ص ٨) .

جەنگاون، پلەیان گەورە ترە لەوانە کە لە پاش فەتحی مەککەوە ماڵیان بەختکردووەو جەنگاون.

ئا ئەو تاقمە پێشینەو پێشەنگی کۆچبەران(موهاجیرین) و پشتیوانانن (ئەنسارەکانن)، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ﴾ [التوبة : ١٠٠] ،واتە: لە دەستەی یەکەمی پێشەنگی کۆچکەران و پشتیوانان، و چاک پەیڕەوانی ئەوانیش، خوا ڕازیی بوو لێیان، و ئەوانیش لە خوا ڕازییبوون .

دەڵێت: (ویقدمون المهاجرین علی الأنصار)وە ئەولەویەت بە کۆچبەران دەدەن بەسەر پشتیوانان ولایەنگراندا، و(**المهاجرون**): جەمعی (**مهاجر**)ـە، ومەبەست لێیان ئەوەیە ئەوانەن کە لە مەککەوە کۆچیان کردووە بۆ مەدینە، و کۆچبەری: لە ڕووی زمانەوانییەوە[1]: بەمانای جێهشتن و وازلێهێنان دێت، و لە ڕووی شەرعیەوە: کۆچکردن و گواستنەوەیە لە وڵاتی شیرکەوە بۆ وڵاتی ئیسلام. و(الأنصار) ، واتە :ئەنسارەکان، واتە: ئەوانەی پشتیوانیان لە پێغەمبەر ﷺ کرد و سەریان خست، کە ئەوانیش بریتیبوون لە هۆزی ئەوس و خەزرەج، پێغەمبەر ﷺ ئەم ناوەی لێنان.

**بەڵگەش لەسەر ڕێزدارتر بوونی کۆچبەران بەسەر پشتیوانانداا ئەوەیە کە خودا لە ناوهێناندا پێشی خستوون، هەروەک فەرموویەتی:** ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ﴾،واتە: لە دەستەی یەکەمی پێشەنگی کۆچکەران و پشتیوانان.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ﴾ [التوبة: ١١٧] ،واتە: بۆیە خوا لەوکارەی پەیامبەرەیش خۆش بوو کە: مۆڵەتی دەستەیەک لەدوو ڕووەکانیدا، کە لە گەڵی نەچن

---

(١) تحفة الأریب » لأبي حیان الأندلسي ( ٣٠٦ ) .

بۆ جەنگی تەبووک، وە لە کۆچکەران و پشتیوانانیش- کە هەندێکیان چوونە جیهادو، هەندێکیشیان خۆیان بە زەوییدا نووساند خۆشبوو، ئەوانەیان کە لە جەنگە سەختەکەی (تەبووک)دا دوای پێغەمبەر ﷺ کەوتن و پەیڕەوییان لێکردو چوونە تەبووک.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ ﴿٨﴾ وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ﴾ [الحشر: ٨، ٩] ، واتە: ئەو فەیئو دەستکەوتەیە بۆ ئەو هەژارە دوورە وڵات و کۆچکردووانەیە لە خانوو و سامانی خۆیان دەرکران لەلایەن مەککەییەکانەوە، تا بەڵکو وردە وردە ژیانیان ڕاست بکرێتەوەو بگاتەوە ئاستی ئاسایی خۆی، پاش ئەوەی کە بتپەرستەکانی مەککە هەڵیان فڕاندن و ناچاریان کردن بە هیجرەت ، داوای چاکەو ڕەزامەندیی لە خوا دەکەن، بۆیە نەیانتوانی لە مەککەدا بژین، ئەگینا لەگەڵیاندا خۆیان ئەسازاند، و یارمەتی خواو پەیامبەرەکەی دەدەن بۆیە کۆچیان کرد.. ئا ئەوانەن ڕاستگۆکانن لە باوەڕو جیهادیاندا.

ئینجا خوا ستایشی پیاوەتیی و چاکەی یارمەتیدەرەکان دەکات، پاش ئەوەی کە دەستکەوتی (بەنی نەزیر) درا بە کۆچکەران و ئەوان هیچ دڵگرانیی و گلەییەکیان نیشان نەدا، بۆیە دەفەرمووێ: ئەو کەسانەی نیشتەجێی **(دار الهجرة)**و **(دار الإيمان)** ببوون، واتە: پشتیوانان لە پێش کۆچی کۆچەرییەکان، کۆچەرییەکانیان خۆش دەوێن و، بەشێک لە دارایی خۆیانیان دەدەنێ و دڵخۆشیان دەکەن.

ئەم ئایەتە پیرۆزە بەڵگەیە لەسەر فەزڵ وڕێزی کۆچبەران و پشتیوانان، هەروەها پێشخستنی کۆچبەران بەسەر پشتیواناندا لەڕێز وفەزڵدا؛ لەبەر ئەوەی لەئایەتەکەدا پێشخراون و ناویان لەپێشتر هاتووە و، لەبەرئەوەی وڵات و ماڵ و منداڵی خۆیان بەجێهێشت، لەپێناو خێر و پاداشت، وسەرخستنی خودا و پێغەمبەرەکەی، وڕاستگۆییان لەو کارەیاندا (خوا لێیان ڕازی بێت) .

دەڵێت : (ویؤمنون بأن الله قال لأهل بدر وكانوا ثلاثمائة وبضعة عشر : «اعملوا ما شئتم فقد غفرت لكم»)وە باوەڕیان بەوە هەیە کە خودا بەئەهلی بەدری فەرمووـ کە ژمارەیان سێسەد و دە کەس زیاتر بوو«چ دەکەن بیکەن بەدڵنیاییەوە من لێتان خۆشبووم»، هەروەك لەسەحیحی بوخاری و موسلیم دا [1]لەچیرۆکی حاتیب کوڕی ئەبی بەڵتەعەدا هاتووە.

جا بەدر: گوندێکی ناسراوە و نزیکەی چوار قۆناغ لە مەدینەوە دوورە، کە تێیدا شەڕەکە ڕوویدا لەو جەنگەدا خودا ئیسلامی بەهێز کرد، ڕۆژی بەدریش پێی دەگوترا ڕۆژی پێوەر وجیاکەرەوەی هەق و ناهەق.

ووتەکەی: (وكانوا ثلاثمائة وبضعة عشر)وە سێ سەد و دە کەس زیاتر بوون، بەم شێوەیە ژمارەیان لە [**صحيح البخاری**]دا هاتووە[2]و وتەکەی: (اعملوا ما شئتم فقد غفرت لكم) هەرچیتان دەوێت بیکەن، چونکە من لێتان خۆش بووم. **ئیبنولقەیم** لە [**الفوائد**]دا دەڵێت[3] :

ئەم فەرموودەیە کێشەی لای زۆرێك دروستکردووە. پاشان بۆچوونەکانی لەم بارەوە خستووەتە ڕوو، پاشان دەڵێت: ئێمە پێمان وایە ـ وە خودا باشتر دەزانێت ـ کە ئەمە وتارێک بوو بۆ گەلێک، کە خودای گەورە دەزانێت کە ئەوان واز لە ئایینەکەیان ناهێنن، بەڵکو لەسەر ئیسلام دەمرن، و لەوانەیە گوناهی هاوشێوەی ئەوانی تر ئەنجام بدەن، بەڵام خودا جل جلاله بەجێیان ناهێڵێت لەسەریان بەردەوام بن، بەڵکو ڕێنماییان دەکات بۆ تەوبەی دڵسۆزانە، داوای لێبوردن و کردەوەی چاکە، کە کاریگەری ئەو شتە دەسڕێتەوە، و ئەوان بەبێ کەسانی تر بۆ ئەمە تایبەت دەکرێن؛ چونکە ئەمە لەواندا بەدەست هاتووە، و لێخۆشبوونیان بۆ هەیە، و ئەوەش ڕێگری

---

(١) متفق عليه : أخرجه البخاري ( ٦٢٥٩ ) ، ومسلم ( ٢٤٩٤ ) .
(٢) برقم ( ٣٩٥٧ ) .
(٣) برقم ( ١/١٦ ) .

ناکات لەوەی کە لێخۆشبوونەکە بە هۆکاری دامەزراوی ڕوویداوە، هەروەک چۆن پێویست ناکات ئەرکە فەرزەکان دوابخەن لەبەر متمانە بە لێخۆشبوون، خۆ ئەگەر ئەوە بەدەست بهاتبایە بەبێ بەردەوامی لەسەر جێبەجێ کردنی فرمانەکان ئەوا دوای ئەوە پێویستیان، نە بەنوێژ و نە بەڕۆژوو و نە بەحەج و نە بەزەکات و نە بەجیهاد و تێکۆشان نەدەبوو، ئەمەش شتێکی ئەستەم و مەحاڵە .

دەڵێت : (وبأنه لا يدخل النار أحد بايع تحت الشجرة، كما أخبر به النبي ، بل لقد رضي الله عنهم ورضوا عنه وكانوا أكثر من ألف وأربعمائة) وە هیچ کەسێک لەوانەی کە بەیعەتی دا لە ژێر دارەکەدا، ناچێتە دۆزەخەوە، هەروەک پێغەمبەر هەواڵی لەبارەوە داوە، بەڵکو بەهۆی ئەو پەیمانەوە خودا لێیان ڕازی بوو و ئەوانیش لێی ڕازی بوون، و ژمارەیان زیاتر لە هەزار و چوار سەد کەس بوو.

ئەم قسەیە لەبارەی ئەهلی بەیعەتی ڕیزوانەوەیە، کە بریتییە لەو بەڵێنەی کە لە حودەیبیە ڕوویدا کاتێک موشریکەکان ڕێگرییان کرد لە پێغەمبەری خودا ﷺ، لە چوونە ناو مەککە - وەک پێشتر بە کورتی ڕوونکرایەوە- و شێخ دوو تایبەتمەندی ئەم تاقمەی باسکردووە:

**یەکەم:** هیچیان ناچنە دۆزەخەوە، بەڵگەش بۆ ئەوە ئەوەیە کە لە صەحیح موسلیم دا هاتووە[1] لەجابرەوە (خوای گەورە لێی ڕازی بێت)، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «**لا يدخل النار أحد بايع تحت الشجرة**»،واتە: هیچ یەکێك لەوانەی بەیعەتیان داوە لەژێر درەختەکەدا ناچنە دۆزەخەوە.

**دووەم:** خودا لێیان ڕازی بووە، ئەمەش لە قورئاندا بە ڕوونی هاتووە و دیارە، وەک لە فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگاردا هاتووە: ﴿لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ﴾ [الفتح: ١٨] ، واتە: بە دڵنیاییەوە خودا لە ئیمانداران ڕازی

(١) برقم ( ٢٤٩٦ ) .

بووە، کاتێک لە ژێر دارەکەدا بەیعەتیان پێدایت. وە وتەکەی: (وكانوا أكثر من ألف وأربعمائة) واتە: زیاتر لە هەزار و چوار سەد کەس بوون. ئەمەش لەسەر بنەمای ژمارەی درووستی ئەوانە. والله أعلم .

ووتەکەی: (ويشهدون بالجنة لمن شهد له رسول الله العشرة وثابت بن قيس ابن شماس وغيرهم من الصحابة) ئەهلی سوننە شایەتی چوونە بەهەشت دەدەن بۆ ئەو کەسەی پێغەمبەری خودا ﷺ شایەتی بۆ دابێت، وەك دە کەسەکە، هەروەها وەك سابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس و هاوەڵەکانی تر.

واتە: ئەهلی سوننەت و جەماعە شایەتی چوونە بەهەشت دەدەن بۆ کەسێك کە پێغەمبەری خودا ﷺ شایەتی بۆ دابێت، بەڵام ئەوانەی پێغەمبەر ﷺ شایەتی بۆ نەدابن بە چوونە بەهەشت ئەهلی سوننەش شایەتی بۆ نادەن بەڵام هیوایان بە چاکەکارانە و ترسیان لە ستەمکاران هەیە و ئەمەش یەکێکە لە بناغەکانی عەقیدە .

ووتەکەی : (كالعشرة) وەك دە کەسەکە ئەوانیش بریتیین لە: ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان، عەلی، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف، زوبەیری کوڕی عەوام ، سەعدی کوڕس ئەبی وەقاس، سەعید کوڕی زەید، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح، تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێت)، وچەندان فەرموودەی سەحیح هاتووە لە بارەی شایەتیدان بەبەهەشت بۆ ئەم تاقمە، ووتەکەی: (وثابت بن قيس بن شماس) واتە: سابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس، وتاربێژ و بانگخوازی پێغەمبەری خودایە ، وە مژدەی بەهەشتەکەی لە [صحيح بوخاری]دا[1]پشتڕاستکراوەتەوە - لە پێغەمبەرەوەﷺ.

هەروەها وتەکەی: (وغيرهم من الصحابة)وە جگە لەوانیش لەهاوەڵان،واتە: جگە لەوانەی باسکراون لەوانەی کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە بەوەی لە بەهەشتدان؛ وەك

(١) برقم ( ٤٨٤٦ ) ، أخرجه مسلم أيضا برقم ( ١١٩ ) .

عوکاشەی کوڕی میحسەن، و عەبدوڵلا کوڕی سەلام و ئەوانی تریش جگە لەم دووە.

هەروەها وتەکەی: (ويقرون بما تواتر به النقل عن أمير المؤمنين علي بن أبي طالب رضي الله عنه وغيره)وە دان بەوەدا دەنێن، کە بەموتەواتری لە ئەمیری ئیمانداران عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە هاتووە(خوا لێی ڕازی بێت)، و لەوانی تریش: واتە: ئەهلی سوننە و جەماعە داندەنێن و باوەڕیان بەوە هەیە کە(ما تواتر به النقل) واتە : ئەوەی لەچەندان کەسەوە گێڕدراوەتەوە ـ و(**التواتر**) : بەهێزترین سەنەدی فەرموودە و گێڕانەوەیە ـ (عن أمير المؤمنين علي بن أبي طالب رضي الله عنه وغيره) لەپێشەوای باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە، لەناو هاوەڵاندا (أن خير هذه الأمة بعد نبيها أبو بكر ثم عمر ويثلثون بعثمان) باشترینی ئەم میللەتە دوای پێغەمبەرەکەی ئەبوبەکرە، پاشان عومەر ولەپلەی سێیەمدا عوسمان دێنن، واتە : عوسمان لەڕیزبەندی سێیەمدا دێنن (ويربعون بعلي) واتە : عەلی لەڕیزبەندی چوارەمدا دێنن (رضي الله عنهم) خودا لێیان ڕازی بێت، لەم ڕیوایەتە موتەواترەی، کە لەعەلی یەوە هاتووە، وەڵامێکە بۆ ئەو ڕافیزانەی کە عەلییان لە ئەبوبەکر و عومەر پێ باشترە و ئەویان پێش ئەبوبەکر و عومەر خستووە، لە خەلافەتدا وتانەش دەدەن لەخەلافەتی ئەو دوو پێشەوایە.

ئەم توێژینەوەیە دوو بابەت لەخۆدەگرێت:

**یەکەمیان:** پرسی خەلافەتە، **دووەمیان:** پرسی ئیمتیازاتە.

سەبارەت بە پرسی خەلافەت، ئەهلی سوننەت و جەماعە، بە هاوەڵانیشەوە (خوا لێیان ڕازی بێت)، بە کۆی دەنگ کۆک بوون لەسەر ئەوەی خەلیفەی دوای پێغەمبەری خودا ﷺ ، ئەبوبەکرە، پاشان عومەر ، پاشان عوسمان، پاشان عەلی.

سەبارەت بە پرسی ئەوەی کامیان ڕێزدارترن، ئەوان کۆدەنگ بوون لەسەر ئەوەی باشترینی ئەم میللەتە دوای پێغەمبەرەکەی ئەبوبەکرە و پاشان عومەرە، هەروەک بەموتەواتری لە عەلییەوە هاتووە. وە لەبارەی عوسمان و عەلی ناکۆکییان هەبووە

(خوا لێیان ڕازی بێت) کامیان باشترە، شێخ لێرەدا سێ وتەی باس کردووە، هەروەك دەڵێت: (فقدم قوم عثمان وسكتوا، أو ربعوا بعلي، وقدم قوم علياً) ، وتاقمێك عوسمانیان پێشخستووە، پاشان بێدەنگ بوون، یاخود لەڕیزبەندی چوارەم دا عەلیان هێناوە، وتاقمێکی تریش عەلیان پێشخستووە. ئەمە پوختەو ئەنجامی ئەو ڕاجیاییەیە کە لەم بابەتەدا هەیە : پێشخستنی عوسمان، پێشخستنی عەلی، تەوەقوف لەم بابەتەدا، واتە: پێش نەخستنی هیچ یەکێکیان بەسەر ئەویتردا .

**✍شێخ ئاماژەی بە پەسەند (تەرجیح) کردنی بۆچوونی یەکەم کرد ئەوەش لەبەر چەند هۆکارێک:**

**هۆکاری یەکەم:** ئەم بۆچوونە ئەوەیە کە چەندان فەرموودە بەڵگەن لەسەری، کە لەبارەی فەزیلەتەکانی عوسمانەوە هاتووە، وئاماژەی پێکراوە (خوا لێی ڕازی بێت) [١].

**دووەم:** کۆدەنگی و تەوافوقی هاوەڵان لەسەر پێشخستنی عوسمان لە بەیعەتدا هەر ئەمەش وای کردووە ئەولەویەت بدەن بە عوسمان، ئەمەش بۆ هیچ شتێك نییە تەنها ئەوە نەبێت، کە عوسمان ڕێزدارترە، کەواتە ڕێکخستنیان لە فەزیلەتدا وەک ڕیزبەندی وڕێکخستنیانە لە خەلافەتدا .

**سێیەم:** بۆچوونی ئەهلی سوننە لەسەر ئەولەویەت دان بە عوسمان و پاشان عەلی یەکلایی بووەتەوە[٢]، وەک چۆن پێشتر لە بەیعەتدا پێشیان خستووە و ئەولەویەتیان پێداوە.

---

(١) فقد أخرج البخاري ( ٣٦٩٧ ) عن ابن عمر هند قال : ( كنا زمن النبي ﷺ لا تعدل بأبي بكر أحدا ثم عمر ثم عثمان ثم نترك أصحاب النبي ﷺ لا نفاضل بينهم ) .

(٢) بڕوانە: « شرح أصول أهل السنة » للالكائي ( ١٣٦٣ ) ، و « السنة » لعبد الله بن أحمد بن حنبل (ص ٥٧٤) .

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف بە عەلی گوت: (خوا لێی ڕازی بێت): سەیری کاروباری خەڵکم کرد، نەمبینی لابدەن لەعوسمان و هیچ کەسێك لەبری ئەو دانێن و پێشیخەن بەسەریدا.

ئەبو ئەیوب دەفەرمووێت: هەرکەسێک زیاتر لە عەلی ئیمتیاز بە عوسمان نەدات و پێشی نەخات، ئەوا سووکایەتی کردووە بەکۆچبەران و پشتیوانان، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی عوسمان باشترە؛ چونکە پێشیانخست بەویست وئارەزووی خۆیان دوای ڕاوێژکردنیان لەو بارەیەوە، و عەلیش (خوا لێی ڕازی بێت)، لە نێو ئەو کەسانەدا بوو، کە بەیعەتیان پێدا، هەر ئەویش سنوورەکانی ئیسلامی لەژێر دەستی عوسماندا جێبەجێ دەکرد.



## حوکمی ئەولەویەتدان وپێشخستنی عەلی بەسەر چوار خەلیفەکەی تردا لەخەلافەتدا

وَإِنْ كَانَتْ هَذِه الْمَسْأَلَةُ ـ مَسْأَلَةُ عُثْمَانَ وَعَلِيٍّ ـ لَيْسَتْ مِنَ الأُصُولِ الَّتِي يُضَلَّلُ الْمُخَالِفُ فِيهَا عِنْدَ جُمْهُورِ أَهْلِ السُّنَّة. لَكِنِ الَّتِي يُضَلَّلُ فِيهَا: مَسْأَلَةُ الْخِلاَفَة، وَذَلِكَ أَنَّهُمْ يُؤْمِنُونَ أَنَّ الْخَلِيفَةَ بَعْدَ رَسُولِ الله ـ ﷺ ـ : أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، ثُمَّ عُثْمَانُ، ثُمَّ عَلِيٌّ. وَمَنْ طَعَنَ فِي خِلاَفَةِ أَحَدٍ مِنْ هَؤُلاءِ؛ فَهُوَ أَضَلُّ مِنْ حِمَارِ أَهْلِه.

هەرچەند ئەم بابەتەیە ـ بابەتی عوسمان و عەلی - لەو بابەتە بنەماییانە نییە کە تێیدا کەسی موخالیف و سەرپێچیکار بەگومڕا دابنرێت لای جمهووری ئەهلی سوننە؛ بەڵام ئەوەی تیایدا کەسی موخالیف بەگومڕا دادەنرێت: لەمەسەلەی خەلافەتدا، ئەوەش لەبەرئەوەیە کە پێیان وایە خەلیفەی دوای پێغەمبەری خوا ﷺ: ئەبوبەکرە، پاشان عومەر، پاشان عوسمان، پاشان عەلی. جا هەرکەسێك تانە بدات لەخەلافەتی یەکێك لەو خەلیفانە؛ ئەوا لە بەگوێدرێژی بنەماڵەکەی گومڕاترە.

---

### شەرح

شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، هاوسەنگی لە نێوان ئەو دوو مەسەلەیەدا نیشان دا: پرسی ئیمتیازدان بە عەلی بەسەر عوسمان لە ڕووی فەزیلەتەوە، هەروەها پرسی ئەولەویەتدان بە عەلی بەسەر ئەوانی تردا لە خەلافەتدا، لە ڕووی ئەو دەرەنجامە مەترسیدارەی کە بەو هۆیەوە دێتە ئاراوە.

شێخ ئەوەی ڕوونکردووەتەوە، کە پرسی ڕێزدانی عەلی بەسەر عوسماندا پرسێك نییە کەسێک ئەو بۆچوونەی هەبێت بەوهۆیەوەیە بەگومڕا دابنرێت؛ بەهۆی بوونی

ناکۆکی تێیدا لەنێو ئەهلی سوننەدا، هەرچەندە ڕاجح و ڕاستترین پێشخستنی عوسمانە بەسەر عەلی دا.

(لكن التي يضلل فيها مسألة الخلافة ) بەڵام ئەوەی تیایدا کەسەکان بەهۆیەوە بە گومڕا دادەنرێت پرسی خەلافەتە، واتە: حوکمی گومڕایی دەدرێت بەسەر ئەوەی پێچەوانەی ئەهلی سوننەیە تێیدا و، پێی وابێت عەلی لە خەلافەتدا ئەولەویەتدار تر و لەپێشترە لە عوسمان یان خەلیفەکانی تر، کە پێش خۆی کەوتوون، یان عەلی لە فەزیلەتدا پێش ئەبوبەکر و عومەر بخات.

ئەهلی سوننەت و جەماعەت پێیان وایە خەلیفەی دوای پێغەمبەری خودا ﷺ، ئەبوبەکر صدیق جێنشینی ئەوە ؛ لەبەر ئەو فەزڵ و پێشینەیەیی کە هەیەتی لەئیسلامەتییدا، ولەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێشیخستووە بەسەر هەموو هاوەڵەکاندا، و کۆدەنگی هاوەڵان لەسەر بەیعەتەکەی.

پاشان خەلیفەی دوای ئەبوبەکر عومەری کوڕی خەتابە، لەبەر ئەو ڕێز وفەزڵەی و پێشینەیەی کە هەیەتی، وە سپاردنی ئەبوبەکر پێی، وە ڕێکەوتنی ئوممەتی ئیسلامیی ئەو سەردەمە لەسەری دوای ئەبوبەکر، پاشان خەلیفەی دوای عومەر عوسمانی کوڕی عەففانە، لەبەر پێشخستنی لەلایەن ئەهلی شوراوە و ڕێکەوتنی ئوممەت لەسەری، پاشان دوای عوسمان خەلافەت بۆ عەلی یە؛ بەهۆی ڕێز و شکۆمەندییەکەی، و کۆدەنگی خەڵکی سەردەمی خۆی لەسەری، ئەمانە ئەو چوار خەلیفەیەن کە ئاماژەیان پێدراوە، وە لەفەرموودەکەی عیربازی کوڕی ساریەدا هاتووە و پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : «**عليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين من بعدي**» [(١)]،واتە: پابەند بن بە سوننەتی من و سوننەتی خەلیفە ڕێوێنیکراوەکانی دوای منەوە.

---

(١) أخرجه أحمد ( ١٧١٤١ ) ، وابن ماجه (٤٣) ، وصححه الألباني .

هەر بۆیەش شێخ گوتی: (ومن طعن في خلافة أحد من هؤلاء) وە هەرکەسێک تانە لە خەلافەتی یەکێک لەو کەسانە بدات، واتە: ئەو چوارەی پێشتر باسمان کرد (فهو أضل من حمار أهله) ئەوا لە گوێدرێژی بنەماڵەکەی گومڕاترە؛ چونکە بەبێ هیچ بەڵگەیەک دژایەتی دەق و کۆدەنگی کردووە و ئەوەش وەک ئەو ڕافیزانە وایە کە بانگەشەی ئەوە دەکەن: گوایە خەلافەتی دوای پێغەمبەر ﷺ مافی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە.

وەلحاڵ لە بابەتی پێشخستنی عەلی بەسەر سێ خەلیفەکەی تردا:

١- هەرکەسێک لە خەلافەتدا پێشی بخات، ئەوا گومڕایە بەکۆدەنگی زانایان.

٢- هەرکەسێک لە فەزیلەتدا ئیمتیازی پێبدات بەسەر ئەبوبەکر و عومەریشدا ئەمەشیان بەگومڕا ولاڕێ دادەنرێت.

٣- هەرکەسێک لە ڕووی فەزیلەتەوە ئەوی لە عوسمان پێباشتر بێت، ئەوا بەگومڕا و لاڕێ دانانرێت، هەرچەند ئەو بۆچوونە ڕاجح و ڕاست ودرووست نییە.



## پێگەی خانەوادە و خزم و کەسی پێغەمبەر ﷺ لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت

وَيُحِبُّونَ أَهْلَ بَيْتِ رَسُولِ اللهِ ـ ﷺ ـ وَيَتَوَلَّوْنَهُمْ، وَيَحْفَظُونَ فِيهِمْ وَصِيَّةَ رَسُولِ اللهِ ـ ﷺ ـ : حَيْثُ قَالَ يَوْمَ غَدِيرِ خُمٍّ: «أُذَكِّرُكُمُ اللهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي»[1] . وَقَالَ أَيْضًا لِلْعَبَّاسِ عَمِّهِ ـ وَقَدِ اشْتَكَى إِلَيْهِ أَنَّ بَعْضَ قُرَيْشٍ يَجْفُو بَنِي هَاشِمٍ ـ فَقَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ؛ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحِبُّوكُمْ؛ للهِ وَلِقَرَابَتِي»[2] . وَقَالَ: «إِنَّ اللهَ اصْطَفَى بَنِي إِسْمَاعِيلَ، وَاصْطَفَى مِنْ بَنِي إِسْمَاعِيلَ كِنَانَةَ، وَاصْطَفَى مِنْ كِنَانَةَ قُرَيْشًا، وَاصْطَفَى مِنْ قُرَيْشٍ بَنِي هَاشِمٍ، وَاصْطَفَانِي مِنْ بَنِي هَاشِمٍ»[3] .

ئەهلی سوننەت و جەماعە خانەوادە وخزم و کەسی پێغەمبەریان ﷺ خۆشدەوێت، و لەبارەیانەوە پارێزگاری لەوەسیەت و ئامۆژگاری پێغەمبەر ﷺدەکەن: کە لە ڕۆژی غەدیری خومدا فەرموویەتی: «خوداتان بیردەخەمەوە سەبارەت بە خانەوادە و خزم و کەسەکەم، خوداتان بیردەخەمەوە سەبارەت بە خانەوادە و خزم و کەسەکەم».

هەروەها بە عەباسی مامی - کاتێ گلەیی لا کرد کە هەندێک لە قورەیش توند و خراپن - فەرموو: «بەو کەسەی کە ڕۆحی من لە دەستیدایە، ئەوان باوەڕ ناهێنن تا ئێوەیان خۆش نەوێت، لەبەر خودا و لەبەر نزیکایەتی و خزمایەتیتان لەمنەوە».

هەروەها فەرمووی: «خودا ئیسماعیلی هەڵبژارد و کینانەی لە هۆزی ئیسماعیل هەڵبژارد و قوڕەیشی لە کینانە هەڵبژارد و بەنو هاشمی لە قوڕەیش هەڵبژارد و منیشی لە هاشمییەکان هەڵبژارد».

---

(١) أخرجه مسلم ( ٢٤٠٨ ) .

(٢) أخرجه الإمام أحمد ( ١٧٧٧ ) ، والطبراني في «كبير »( ١٢٢٢٨ )، وابن أبي شيبة ( ٦ / ٣٨٢ ).

(٣) أخرجه مسلم ( ٢٢٧٦ ) ، وأحمد ( ١٦٣٩٣ ) .

## شەرح

لەم بەشەدا شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پێگەی خزم و کەسی پێغەمبەری ﷺ ڕوونکردووەتەوە و، دەڵێت: ئەهلی سوننە (ویحبون أهل بيت رسول الله ﷺ)ئەهلی بەیتی پێغەمبەری خودایان ﷺ خۆشدەوێت ، ئەهلی بەیت: بریتیین لە بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ، ئەوانەی کە زەکاتیان لێ قەدەغە کراوە، کە ئەوانیش بنەماڵەی عەلی و بنەماڵەی جەعفەر و، بنەماڵەی عەقیل و، بنەماڵەی عەباس و، کوڕ و نەوەکانی حاریسی کوڕی عەبدولموطەلیب، و ژنەکانی پێغەمبەر ﷺ و کچ و منداڵەکانی بەشێکن لەبنەماڵەکەی، وەک خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ﴾ [الأحزاب : ٣٣] ،واتە: بەڕاستی لەم - ئاراستانەدا- خوا هەر دەیەوێ هەموو چڵک و چەپەڵیی و، گشت کارێکی ناڕەواو نا دروستان لێ دوور بخاتەوە (ئەی خانەوادەی پێغەمبەر!) .

جا ئەهلی سوننە خۆشیان دەوێن و ڕێز و ئیحترامیان دەگرن؛ چونکە ئەوە بەشێکە لە ڕێزگرتن لە پێغەمبەر ﷺ و ئیحترام گرتنی، لەبەر ئەوەی خودا و پێغەمبەرەکەی فەرمانیان بەو شتە کردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾ [الشورى : ٢٣] ، واتە:بەوانە بڵێ- کە وەڵامت نادەنەوە- من لەسەر گەیاندنی پەیامەکەی خوا، هیچ کرێ و مزەیەکم لە ئێوە ناوێت، ئەوە نەبێت کە ئێوە لەبەر خوا مافی خزمایەتی بپارێزن و وازم لێ بێنن با پەیامەکەم بگەیەنم.

چەندان بەڵگەی فەرموودە لەم بارەیەوە هاتوون، لەوانە ئەوەی کە شێخ هێناویەتی. ئەوەش کاتێ کە ئەوان - خانەوادە و ئال وبەیت ـ شوێنکەوتەی سوننەت بن و جێگیر و دامەزراو بن لەسەر ئیسلام وەك عەباس و نەوەکانی و عەلی و نەوەکانی، بەڵام

ئەوەی موخالەفەی سوننەت بکات و جێگیر و دامەزراو نەبێت لەسەر ئاین، ئەوا دروست نییە خۆشبویسترێت هەر چەند تاکێك بێت لەخانەوادە و ئەهلی بەیت.

ووتەکەی: (ویتولونهم) واتە : خۆشیانیان دەوێت . و وتەکەی : (ویحفظون فیهم وصیة رسول الله ﷺ) واتە: وسیەتەکەی پێغەمبەر ﷺ لەبارەیانەوە دەپارێزن و جێبەجێی دەکەن (حیث قال یوم غدیر خم )هەروەك لەڕۆژی غەدیرخوم دا گوتی، جا(**الغدیر**) لێرەدا : شوێنی کۆبوونەوەی ئاوە ، و(خم) وتراوە : ناوی پیاوێکە : دواتر (**الغدیر**) دراوەتە پاڵی . وبۆچوونێك هەیە دەڵێت : بریتییە لەدارێکی لول خواردوو ، پاشان غەدیر دراوەتەپاڵی ، جا ئەم غەدیرە لەڕێگای مەدینەدا بوو پێغەمبەر ﷺ لە کاتی گەڕانەوەی لە حەجیماڵئاوایی بەلایدا تێپەڕ بوو وتارێکی تێدا پێشکەش کرد و بەشێک لەوتارەکەی ئەوەیە کە شێخ هێناویەتی کە فەرمووی: «أذکرکم الله في أهل بیتي» واتە: خوداتان بیردەخەمەوە لەوەی فەرمانی پێکردووە لەبارەی خانەوادەکەمەوە لەڕێز لێگرتن و چاکبوون لەگەڵیان ودانی ماف و هەقەکانیان پێیان.

(وقال أیضا للعباس عمه) هەروەها بەعەباسی مامی فەرموو، جا عەباس کوڕی عەبولموطەلیبی کوڕی هاشمی کوڕی عەبدولمەنافە (وقد اشتکی إلیه) واتە: کاتێ شکایەتی حاڵی بردە لای و گلەیی کرد و هەواڵی لەبارەی ئەو شتانەوە پێدا کە لە لایەن خەڵکەوە هاتووەتە ڕێی و پێی ناخۆش بووە (أن بعض قریش یجفو) هەندێ لەقورەیش خراپن لەگەڵیان، و(**الجفاء**) : باشنەبوون وبچڕاندنی پەیوەندیە (فقال) واتە : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «والذي نفسي بیده» سوێندبێ بەوەی گیانی منی بەدەستە ، ئەمە سوێندی پێغەمبەر ﷺ بوو «لا یؤمنون» باوەڕناهێنن واتە: باوەڕی کامڵ و واجب «حتی یحبوکم لله ولقرابتي» تاوەکو ئێوەیان خۆشنەوێت لەپێناو خودا و لەبەر نزیکایەتیتان لەمنەوە، واتە: لەبەر دوو هۆکار:

**یەکەم:** نزیکبوونەوە لەخودا بەو کارە؛ چونکە ئەوان بەشێکن لەخۆشەویستان و ئەولیایی خودا .

**دووەم :** لەبەر ئەوەی ئەوان خانەوادە و خزم و کەسی پێغەمبەری خودان ﷺ ، لەمەشدا ڕازیکرنی ئەو هەیە لەگەڵ ڕێزگرتن لێی.

پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بە فەزیلەتی بەنو هاشم ـ کە خزم و کەسوکارین ـ داوە و، فەرموویەتی: «إن الله اصطفى» واتە : خودا هەڵیبژارد، و(**الصفوة**) واتە: هەڵبژاردن «بني إسماعيل» نەوەکانی پێغەمبەر ئیبراهیم خەلیل ﷺ «واصطفى من بني إسماعيل كنانة» ولەنەوەی ئیسماعیل کینانەی هەڵبژارد، وکینانە ناوی هۆزێکە، باوکیان کینانەی کوڕی خوزەیمەیە «واصطفى من كنانة قريشا» ولەکینانەش قورەیشی هەڵبژارد ، کە بریتیین لە منداڵ و نەوەکانی موزیڕی کوڕی کینانە «واصطفى من قريش بني هاشم» ولەقورەیشیش بەنو هاشمی هەڵبژاردووە، کە بریتیین لە نەوەکانی هاشمی کوڕی عەبولمەناف «واصطفاني من بني هاشم» و منی لە بەنو هاشم هەڵبژارد، و پێغەمبەر ناوی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموطەلیبی کوڕی هاشمی کوڕی عەبدولمنافی کوڕی قوسەی کوڕی کیلامی کوڕی مورەی کوڕی کەعبی کوڕی لوئەی کوڕی غالبی کوڕی کینانەی کوڕی خوزەیمەي کوڕی مودرەکەی کوڕی ئیلیاسی کوڕی موزیڕی کوڕی نزاری کوڕی مەعدی کوڕی عەدنانە[١] .

**✍ شایەتحاڵی فەرموودەکە:**

فەرموودەکە بەڵگەی فەزڵ و باڵادەستی عەرەبی تێدایە و، قوڕەیش باشترینی عەرەبن و، بەنو هاشم باشترینی قوڕەیشە و، پێغەمبەرﷺ باشترینی بەنو هاشمە، کەواتە باشترینی دروستکراوەکانە لە ڕۆحدا و باشترینی ئەوانە لە ڕەچەڵەکدا، لەفەرموودەکەدا فەزیلەتی بەنو هاشم هەیە کە پەیوەندیی خزمایەتیان بە پێغەمبەرەوە ﷺ هەیە .



(١) بڕوانە: سيرة ابن هاشم (١/ ١١).

## پێگەی خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت

وَيَتَوَلَّوْنَ أَزْوَاجَ رَسُولِ اللهِ - ﷺ - أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ، وَيُؤْمِنُونَ بِأَنَّهُنَّ أَزْوَاجُهُ فِي الآخِرَةِ: خُصُوصًا خَدِيجَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا أُمَّ أَكْثَرِ أَوْلادِه، وَأَوَّلَ مَنْ آمَنَ بِهِ وَعَاضَدَهُ عَلَى أَمْرِه، وكَانَ لَهَا مِنْهُ الْمَنْزِلَةُ الْعَالِيَةُ. وَالصِّدِّيقَةَ بِنْتَ الصِّدِّيقِ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، الَّتِي قَالَ فِيهَا النَّبِيُّ - ﷺ - : «فَضْلُ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ»[١].

ئەهلی سوننە و جەماعە خێزانەکانی پێغەمبەریان ﷺ خۆشدەوێت کە پێشیان دەوترێت دایکانی باوەڕداران و، پێیان وایە ئەوان ژنی ئەون لە قیامەتدا، بەتایبەتی خەدیجە، کە دایکی زۆربەی منداڵەکانی بوو، یەکەم کەسە کە باوەڕی پێی هێناوە و پشتگیری لە کاروبارەکانی کردووە، پێگەیەکی بەرزی هەبووە لەلای و، عائیشە ڕاستگۆی کچی ڕاستگۆ، کە لەبارەیەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «باڵاتربوونی عائیشە بەسەر ژناندا، وەک باڵایی گوشتاو وایە بەسەر هەموو خواردنەکانی تردا».

---

## شەرح

شێخ ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، لەم بەشەدا باسی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعەی کردووە سەبارەت بە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ، و فەرموویەتی: (ویتولون أزواج رسول الله ﷺ) واتە : خۆشیانیان دەوێن و ڕێزیان دەگرن ؛ لەبەرئەوەی ئەوان(أمهات المؤمنين) دایکی باوەڕدارانن، لەڕێز و پلەو پایەدا ولە حەرامی زەواج و مارەکردنیان لەسەر ئوممەتی ئیسلامیی .

سەبارەت بە گشت حوکمەکانی تر حوکمەکەیان حوکمی ژنانی بیانییە لە ڕووی قەدەغەکردنی بە تەنیا بوون لەگەڵیان و سەیرکردنیان، خوای پەروەردگار فەرموویەتی

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٣٣٧٠) ، ومسلم (٢٤٤٦) .

: ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ ﴾ [الأحزاب:٦] ،واتە: پەیامبەر -ﷺ- بە بڕواداران لە خودی خۆیانیش لە پێشترە، لە هەموو کاروبارێکی دین و دنیادا، وە هەرگیز پێیخۆش نەبووە موسڵمانان تووشی هیچ جۆرە بەڵاو نەهامەتیەک ببن، هەموو کاتیش هەوڵیداوە بەرەو خێرو چاکە بچن و خۆی بە برایان داناوە، دیارە کە دەبێ موسڵمانانیش هەر ئەو بڕیارو حوکمیان بۆ بداو، هەر قسەی ئەویش ببیستن، و ژنەکانیشی دایکیانن، پێویستە وەک دایکی خۆیان ڕێزو حورمەتیان لێبنێن. واتە: لە ڕێز گرتن و حەرامیی مارەکردنیاندا وەک دایکیانن، بەڵام لە تەماشا کردن و خەڵوەت و..هتد، دەبێ وەک ژنانی تر مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت و، فەرموویەتی : ﴿وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا۟ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓا۟ أَزْوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦٓ أَبَدًا ۚ﴾ [الأحزاب : ٥٣] ، واتە: بێگومان هەرگیز بۆ ئێوە ناشێ و نابێت ئازارو ئەزیەتی پەیامبەری خوا ﷺ بدەن، ئیدی بە زمان بێ، یان بە کردار ، هەرگیزیش بۆتان نییە ژنەکانی دوای خۆی بە هیچ جۆرێک مارە بکەن، چونکە وەکو دایکتانن؛ چونکە ئەزیەتدانیی و مارەکردنی ژنەکانی ئەو، لای خوا کارێکی زۆر گەورەیەو چاوپۆشی لێناکرێ ، هەروەها فەرموویەتی : ﴿ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ۚ ﴾ [الأحزاب : ٥٣] ، واتە: خۆ ئەگەر داوای شتێکتان لە ژنانی پێغەمبەر ﷺ کرد، لە پشتی پەردەوە داوایان لێ بکەن، واتە: ئەدەب لە ماڵی پەیامبەر ﷺ و تێکەڵ نەبوون لەگەڵ خانەوادەکەیدا یاسایەکی خواییەو، دەبێ هەموو کات پێش چاو بگیرێ. ئەوان لە ڕێز گرتن و حەرامیی مارەکردنیاندا دایکی ئیماندارانن، بەڵام لە تەماشا کردن و خەڵوەت و..هتد، دەبێ وەک ژنانی تر مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت.

پێغەمبەر ﷺ کاتێ وەفاتی کرد نۆ خێزانی هەبوو و ئەوانیش بریتیین لە: (عائیشە، حەفسە، زەینەبی کچی جەحش، ئوم سەلەمە، سەفیە، مەیموونە، ئوم حەبیبە، سەودا، جووەرییە) سەبارەت بە خەدیجە، پێش پێغەمبەرایەتی شووی پێکرد، تا وەفاتی کرد

ژنی بەسەر نەهێنا، دواتر هاوسەرگیری لەگەڵ زەینەبی کچی خوزەیمەی هیلالی کرد و ئەو نەمایەوە تەنها ماوەیەکی کەم، دواتر وەفاتی کرد ، ئەمانە ئەو ژنانەن کە گواستوونیەوە و، یازدە دانە بوون، خودا لێیان ڕازی بێت.

(ویؤمنون) واتە: ئەهلی سوننەت و جەماعە باوەڕیان وایە (بأنهن أزواجه في الآخرة) ئەوان ژنی پێغەمبەرن ﷺ لە قیامەتدا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر پلەو ڕێزیان (خصوصا خديجة) بەتایبەت خەدیجە، کە خاوەنی چەندین تایبەتمەندی و فەزیلەتە، و شێخی ئیسلام لە نێویاندا باسی چەند دانەیەکی کردووە:

١- دایکی زۆربەی منداڵەکانیەتی و هەموو منداڵەکانیشی لەون، جگە لە ئیبراهیم کە لەماریای قیبتییە.

٢- یەکەم ژن بوو ـ بە پێی ڕوانگەیەک باوەڕی پێی هێنا ـ، ئەویش ئەو کەسەیە کە شێخ لێرەدا باسی کردووە ـ یان یەکەم ژن بوو بە پێی بۆچوونەکەی تر باوەڕی پێی هێنا.

٣- یەکێکە لە یەکەم کەسەکان بوو، کە پشتگیری لێکرد و یارمەتی دا لە کاتە پێویست و هەستیارەکاندا.

٤- پێگەیەکی بەرزی هەبوو لەلای ئەو، بۆیە خۆشی دەویست و زۆر باسی دەکرد و ستایشی دەکرد.

(والصديقة بنت الصديق) واتە: عائیشە کچی ئەبی بەکر، و (**الصِّديق**): زیادەڕەوییە لە ڕاستگۆیی دا، پێغەمبەر ﷺ ئەو نازناوەی بە ئەبوبەکر بەخشی ، و عائیشە چەندان فەزیلەتی هەیە، لەوانە:

خۆشەویسترین خێزان بووە بەلای پێغەمبەرەوە ﷺ، و جگە لە ئەو هاوسەرگیریی لەگەڵ کچ دا نەکردووە، و لەناو جێگا و پەڕۆکەی ئەودا وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ دادەبەزی، و خودا بێبەری کردووە لەوەی کە خەڵکی درۆ تۆمەتیان بۆ هەڵبەست، و ئەو ژیرترینە لە ژنەکانی و گەورەترینی هاوەڵان بووە، کاتێک بابەتێك ناڕوون بوایە

لای هاوەوڵان، ڕاوێژیان پێدەکرد، پێغەمبەر ﷺ سەری لەباوەشی ئەودا بوو کاتێ کە وەفاتی کرد [1] و لە ماڵەکەی ئەودا نێژرا، . . هتد.

جا شێخ لێرەدا ئاماژەی بەچەند فەزائیلێکی داوە: پێغەمبەر ﷺ لەبارەیەوە فەرموویەتی : «**فضلُ عائشةَ على النِّساءِ ، كفضل الثَّريدِ على سائرِ الطَّعامِ** » واتە: پلەو پایەیی عائیشە بەسەر ئافرەتاندا وەک پلەی گۆشتاو بەسەر هەموو خواردنەکانی تردا، و «**الثريد**» گۆشتاو یاخود تەشریبە و باشترین خواردنە ؛ چونکە لەگۆشت و نان پێکهاتووە ، نان باشترینی قوتە، وگۆشتیش باشترین مەرگە و شۆربایە، جا گەر گۆشت باشترین مەرگە و شۆربا بێت، وە نان باشترین قوت بێت، ئەوا بەهەردوکیان پڵاوی گۆشت (الثريد) پێک بێت، ئەوا پڵاوی گۆشت (الثريد) باشترین خواردنە.



(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٨٩٠) ، ومسلم (٢٤٤٣).

## خۆبەریکردنی ئەهلی سوننەت و جەماعەت
## لەوەی بیدعەکاران دەیڵێن لە دژی هاوەڵان و ئالو بەیت

وَيَتَبَرَّؤُونَ مِنْ طَرِيقَةِ الرَّوَافِضِ الَّذِينَ يُبْغِضُونَ الصَّحَابَةَ وَيَسُبُّونَهُمْ. وَطَرِيقَةِ النَّوَاصِبِ الَّذِينَ يُؤْذُونَ أَهْلَ الْبَيْتِ بِقَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ. وَيُمْسِكُونَ عَمَّا شَجَرَ بَيْنَ الصَّحَابَةِ، وَيَقُولُونَ: إِنَّ هَذِه الآثَارَ الْمَرْوِيَّةَ فِي مَسَاوِيهِمْ مِنْهَا مَا هُوَ كَذِبٌ، وَمَنْهَا مَا قَدْ زِيدَ فِيهِ وَنُقِصَ وَغُيِّرَ عَنْ وَجْهِهِ، وَالصَّحِيحُ مِنْهُ هُمْ فِيهِ مَعْذُورُونَ: إِمَّا مُجْتَهِدُونَ مُصِيبُونَ، وَإِمَّا مُجْتَهِدُونَ مُخْطِئُونَ. وَهُم مَّعَ ذَلِكَ لاَ يَعْتَقِدُونَ أَنَّ كُلَّ وَاحِدٍ مِنَ الصَّحَابَةِ مَعْصُومٌ عَنْ كَبَائِرِ الإِثْمِ وَصَغَائِرِهِ؛ بَلْ يَجُوزُ عَلَيْهِمُ الذُّنُوبُ فِي الْجُمْلَةِ. وَلَهُم مِّنَ السَّوَابِقِ وَالْفَضَائِلِ مَا يُوجِبُ مَغْفِرَةَ مَا يَصْدُرُ مِنْهُمْ ـ إِنْ صَدَرَ ـ حَتَّى إِنَّهُمْ يُغْفَرُ لَهُم مِّنَ السَّيِّئَاتِ مَا لاَ يُغْفَرُ لِمَنْ بَعْدَهُمْ؛ لأَنَّ لَهُم مِّنَ الْحَسَنَاتِ الَّتِي تَمْحُو السَّيِّئَاتِ مَا لَيْسَ لِمَنْ بَعْدَهُمْ. وَقَدْ ثَبَتَ بِقَوْلِ رَسُولِ اللهِ ـ ﷺ ـ أَنَّهُمْ خَيْرُ الْقُرُونِ، وَأَنَّ الْمُدَّ مِنْ أَحَدِهِمْ إِذَا تَصَدَّقَ بِهِ كَانَ أَفْضَلَ مِنْ جَبَلِ أُحُدٍ ذَهَبًا مِمَّن بَعْدَهُمْ. ثُمَّ إِذَا كَانَ قَدْ صَدَرَ مِنْ أَحَدِهِمْ ذَنْبٌ؛ فَيَكُونُ قَدْ تَابَ مِنْهُ، أَوْ أَتَى بِحَسَنَاتٍ تَمْحُوهُ، أَو غُفِرَ لَهُ؛ بِفَضْلِ سَابِقَتِهِ، أَوْ بِشَفَاعَةِ مُحَمَّدٍ ـ ﷺ ـ الَّذِي هُمْ أَحَقُّ النَّاسِ بِشَفَاعَتِهِ، أَوْ ابْتُلِيَ بِبَلاَءٍ فِي الدُّنْيَا كُفِّرَ بِهِ عَنْهُ. فَإِذَا كَانَ هَذَا فِي الذُّنُوبِ الْمُحَقَّقَةِ؛ فَكَيْفَ الأُمُورُ الَّتِي كَانُوا فِيهَا مُجْتَهِدِينَ: إِنْ أَصَابُوا؛ فَلَهُمْ أَجْرَانِ، وَإِنْ أَخْطَؤُوا؛ فَلَهُمْ أَجْرٌ وَاحِدٌ، وَالْخَطَأُ مَغْفُورٌ. ثُمَّ إِنَّ الْقَدْرَ الَّذِي يُنْكَرُ مِنْ فِعْلِ بَعْضِهِمْ قَلِيلٌ نَزْرٌ مَغْفُورٌ فِي جَنْبِ فَضَائِلِ الْقَوْمِ وَمَحَاسِنِهِمْ؛ مِنَ الإِيمَانِ بِاللهِ، وَرَسُولِهِ، وَالْجِهَادِ فِي سَبِيلِهِ، وَالْهِجْرَةِ، وَالنُّصْرَةِ، وَالْعِلْمِ النَّافِعِ، وَالْعَمَلِ الصَّالِحِ. وَمَن نَّظَرَ فِي سِيرَةِ الْقَوْمِ بِعِلْمٍ وَبَصِيرَةٍ، وَمَا مَنَّ اللهُ عَلَيْهِم بِهِ مِنَ

الْفَضَائِلِ؛ عَلِمَ يَقِينًا أَنَّهُمْ خَيْرُ الْخَلْقِ بَعْدَ الأَنْبِيَاءِ؛ لاَ كَانَ وَلا يَكُونُ مِثْلُهُمْ، وَأَنَّهُمُ الصَّفْوَةُ مِنْ قُرُونِ هَذِهِ الأُمَّةِ الَّتِي هِيَ خَيْرُ الأُمَمِ وَأَكْرَمُهَا عَلَى اللهِ.

هەروەها خۆیان بەریدەکەن لە ڕێگا وڕێبازی ڕافیزییەکان دەکەن، ئەوانەی کە ڕقیان لە هاوەڵانە و سوکایەتیان پێدەکەن، هەروەها لە ڕێگای ئەو نەواسیبیانەی کە ئەزیەتی ئەهلی بەیت دەدەن بە قسە یان کردار. و خۆگر و بێدەنگن لەو کیشانەی، کە لە نێوان هاوەڵاندا هەبووە، و دەڵێن: ئەو هەواڵانەی کە گێڕدراونەتەوە لەبارەی عەیبەکانیانەوە: هەندێکیان درۆ و هەڵبەستراون، هەندێکی بۆی زیاد کراوە و لێی لابراوە، و هەقیقەتەکەی شێوێندراوە، ئەوەش کە ڕاستە بیانو و عوزریان بۆ دەهێندرێتەوە: لەو کارەیاندا یان ئیجتهادیان کردووە و پێکاویانە، یان ئیجتهادیان کردووە بەهەڵەدا چوون. لەگەڵ ئەوەشدا ئەهلی سوننەت و جەماعەت باوەڕیان وا نییە، کە هەر یەکێک لە هاوەڵان لە تاوانە گەورە و بچووکەکان دوور بن لە هەڵە و پارێزراو بن لێی؛ بەڵکو دەکرێت گوناهەکان بە گشتی ئەنجام بدەن، بەڵام ئەو پێشینە و فەزیلەتەی، کە هەیانە کە وا پێویست دەکات لێخۆشبوونیان بۆ هەبێن بۆ ئەوەی دەیکەن - ئەگەر بیکەن وئەنجامی بدەن - تا ئەو ڕادەیەیی، کە چاوپۆشی لە تاوانەکانیان دەکرێت کە بۆ ئەوانەی دوای ئەوان شتی وا نییە؛ چونکە کردەوەی چاکیان هەیە، کە کارە خراپەکان دەسڕێتەوە و ئەو تایبەت مەندیە بۆ ئەوانەی دوای ئەوان نیە. هەروەها سەلمێنراوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ئەوان باشترینی کەسانی سەدەکانن و مشتێك لە یەکێکیان ئەگەر بە خێر ببیەخشیت لە چیای ئوحود باشترە بە زێڕ لە ئەوانەی دوای خۆیان. پاشان ئەگەر یەکێکیان گوناهێکی کرد؛ ئەوا بەدڵنیاییەوە تەوبەی لێ کردووە، یان کارێکی چاکی کردووە، کە دەیسڕێتەوە، یان خودا لێی خۆش بووە؛ لە سایەی ئەو پێشینەیەیی کە هەیەتی لەئیسلامەتی دا، یان بەهۆی تکا و شەفاعەتی موحەمەد ﷺ ، کە شایستەترین کەسن بەشەفاعەتەکەی لەکەسانی تر، یان تووشی بەڵایەک بووە لە دونیادا، کە دەبێتە کەفارەت بۆ تاوانەکەی. کەواتە ئەگەر ئەمە لە حاڵەتی ئەو

**گوناهانەدا بوو کە ئەنجام دراون، ئەوا چۆنە سەبارەت بەو بابەتانەی، کە ئیجتیهاد و کۆششیان تێدا کردووە، ئەگەر ڕاست بووبن و پێکابێتیان، دوو پاداشتیان دەبێت، ئەگەر بەهەڵەدا چووبن یەک پاداشتیان بۆ هەیە، هەڵەکەش خودا لێی خۆش دەبێت.**

**پاشان ئەو ئەندازەیەی نکۆڵی لێ دەکرێت لە کردەوەی هەندێکیان زۆر کەمە و؛ مایەیی لێخۆشبوونە بەهۆی ئەو ڕێز و قەدر و چاکەیەیی کە هەیانە: لە ئیمان بوون بە خودا و پێغەمبەرەکەی و، جیهاد لە پێناو خودا و، کۆچکردن و، سەرکەوتن و زانستی بەسوود و، کردەوەی ڕاست و درووست.**

**جا هەرکەسێک بە زانست و بەرچاو ڕوونی سەیری ژیاننامەی هاوەڵان بکات، ئەوەی خودا لە فەزیلەتەکان پێی بەخشیون؛ بە دڵنیاییەوە دەیزانێت: کە ئەوان لە دوای پێغەمبەران باشترینی درووستکراوەکانن و، وێنەیان نییە و نابێت، ئەوان نوخبە و کەڵە پیاوی سەردەم وسەدەکانی ئەم میللەتەن، کە باشترینی گەلان و بە شەرەفترینیانن لای خودای پەروەردگار.**

---

## شەرح

شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەم بەشەدا چەند بابەتێکی ڕوونکردۆتەوە:

**یەکەم:** هەڵوێستی ئەهلی سوننەت و جەماعە بەرانبەر بە هاوەڵان و ئەهلی بەیت، ئەوەش هەڵوێستی میانڕەوی و وەسەتە لە نێوان زیادەڕەوی و کەمتەرخەمیدا و، توندڕەوی و کورتڕەویدا، ئەهلی سوننە هەموو باوەڕدارانیان خۆش دەوێت بەتایبەت پێشینەکان لەکۆچبەران و پشتیوانان ئەوانەش کە لەچاکەدا شوێنیان کەوتوون و، ئالو بەیتیانیش خۆشدەوێت، ئەوان بەهای هاوەڵان و فەزیلەتەکانیان دەزانن و ڕەچاوی مافەکانی ئالو بەیت دەکەن ئەوەی، کە خودا واجبی کردووە.

(ویتبرءون من طريقة الروافض)وە ئینکاری لە ڕێبازی ڕافیزییەکان دەکەن و خۆیانی لێبەری دەکەن، ئەوانەی کە سوکایەتی بە هاوەڵان دەکەن و بوختانیان بۆ دەکەن و، زیادەڕەوی دەکەن دەرهەق بە عەلی کوڕی ئەبی تالیب و ئالو بەیت. (ومن طريقة النواصب) هەروەها لە ڕێچکە و میتۆدی ناسیبیەکان، ئەوانەی کە دوژمنایەتی ئالو بەیت دەکەن و تانەیان لێدەدەن، پێشتر عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت سەبارەت بە هاوەڵان و ئەهلی بەیتمان ڕوون کردەوە، بەڵام مەبەست لە باسکردنی لێرەدا بەراوردکردنیەتی لەگەڵ عەقیدەی لادەران و ئەوانەی دژیانن.

**دووەم:** شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) شیکردنەوەی خۆی بۆ هەڵوێستی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ڕوون کردەوە سەبارەت بەو ناکۆکییەی لە نێوان هاوەڵان لە سەردەمی فیتنەدا ڕوویدا و ئەو شەڕانەی لە نێوانیاندا ڕوویدا، هەروەها هەڵوێستیان سەبارەت بەوەی دەدرێتە پاڵ هاوەڵان لەو کەموکوڕیانەی، کە دوژمنانی خودا وەک هۆکارێک بۆ دوژمنایەتی و تانەدان لێیان بەرامبەریان بەکاری دێنن، وەک ئەوەی لەگەڵ هەندێک لە نووسەرانی دواتر و مۆدێرن ڕوویدا، کە خۆیان کردە دادوەر لەوەی کە لەنێوان هاوەڵانی پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕوویدا، بەبێ بەڵگە هەندێکیان بە ڕاست دانا و هەندێکیش بە هەڵە، بەڵکو بە شوێنکەوتنی ئارەزووەکانیان و لاساییکردنەوەی ئەو کەسە بەدخوازانەی، کە هەوڵی فریودانی موسڵمانان دەدەن بە گومانکردن لەسەر مێژووە سەربەرزەکەیان و، پێشەوا چاکەکەیان، کە خەڵکانێکی باشترینی سەردەمی سەدەکان بوون؛ بۆ ئەوەی لەوێوە دزە بکەن بۆ تانەدان لەئیسلام و، دوو بەرەکی دروستکەن لەنێو موسڵماناندا و لاوازیان بکەن.

چەندە باشە ئەوەی شێخ لێرەدا باسی کرد لەڕووی ڕوونکردنەوەی هەقیقەت و ڕاستییەکان ، باسی هەڵوێستی ئەهلی سوننەی کردووە سەبارەت بەوەی دەدرێتە پاڵ هاوەڵان و چی ناکۆکیەک لە نێوانیاندا هەبووە - واتە ناکۆکییان لەسەر درووست بووە - دەتوانرێت لە دوو شتدا کورت بکرێتەوە:

**یەکەم:** ئەوان (یمسکون عما شجر بین الصحابة) زمانیان دەپارێزن لەوەی کە لە نێوان هاوەڵەکاندا ڕوویداوە و ناکۆکی لەسەر بووە، واتە: لە گەڕان دەوەستن و قووڵ نابنەوە تێیدا؛ چونکە قوڵبوونەوە لەوەدا هاوسۆزی و ڕق و کینە بۆ هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ درووست دەکات ، ئەوەش یەکێکە لە تاوانە گەورەکان، کەواتە ڕێگای سەلامەتی ئەوەیە کە بێدەنگ بیت بەرامبەری و قسەی لەسەر نەکەیت.

**دووەم:** بیانوهێنانەوەی بۆ ئەو کەموکورتیانەی لەبارەیانەوە دەگێڕدرێنەوە؛ چونکە ئەمە بۆ بەرگریکردنە لەوان، و لە وەڵامی پیلانی دوژمنەکانیاندایە، ئەوەش هاتووە کە دەکرێ بیانووەکان بەم شێوەیە کورت بکرێتەوە:

١- (هذه الآثار المروية في مساويهم : منها ما هو كذب) ، ئەو ڕیوایەتانەی سەبارەت بە عەیبەکانیان گێڕدراونەتەوە: هەندێکیان درۆیە و، دوژمنەکانیان هەڵیانبەستووە؛ بۆ لەکەدارکردنی ناو و ناوبانگیان، وەک ئەوەی ڕافیزە دەیکەن، خودا نەفرەتیان لێ بکات، جا درۆش گرنگی پێنادرێت و حسابی بۆ ناکرێت.

٢- ئەو عەیب و کەموکورتیانەی کە گێڕدراونەتەوە (ومنها ما قد زيد فيه ونقص وغير عن وجهه) هەندێکی بۆی زیاد کراوە و لێی کەمکراوە و دەستکاری کراوە و، درۆی تێکەڵ بووە، تووشی شێواندنێک بووە، کە پشتی پێ نابەسترێت؛ چونکە فەزیلەتی هاوەڵان زانراوە و دادپەروەرییان مسۆگەرە، بۆیە واز لەزانراوی دڵنیا بۆ بابەتی شێواوی جێی پرسیار ناهێندرێت.

٣- (والصحيح منه) واتە: بەشە درووستەکەی، واتە: ئەو ڕیوایەتە سەحیحانەی کە گێڕدراونەتەوە لەو بارەیەوە (هم فيه معذورون: إما مجتهدون مصيبون، وإما مجتهدون مخطئون) ئەوان عوزر و بیانوویان بۆ هێندراوەتەوە: یان ئیجتیهادیان کردووە و ڕاست بوون، یاخود ئیجتیهادیان کردووە بە هەڵەدا چوون و، ئەم بابەتە لەبابی ئیجتهادە، ئەوەی گەر کەسی موجتەهید بیپێکێت دوو پاداشتی بۆ هەیە، گەر

بەهەڵەشدا بچێت یەك پاداشت، لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە لە "الصحيحين"دا هاتووە[١]، لە ئەبو هورەیرە و عەمری کوڕی عاسەوە: پێغەمبەری خودا ﷺ، فەرموویەتی:«**إذا اجتهد الحاكمُ فأصاب فله أجرانِ وإذا حكَم فاجتَهَد فأخطأ فله أجرٌ**»، واتە: "ئەگەر حاکم و داوەر هەوڵ بدات و ڕاست بێت، ئەوا دوو پاداشتی بۆ هەیە، وئەگەر هەوڵیداو بە هەڵەدا چوو، یەک پاداشتی بۆ هەیە".

٤- ئەوان مرۆڤن، دەکرێت هەر تاکێکیان توشی ئەوە بن کە هەرتاکێکی تری موسوڵمان توشی دەبێت لە هەڵە و تاوان، جا ئەهلی سوننە: (لا يعتقدون أن كل واحد من الصحابة معصوم عن كبائر الإثم وصغائره ؛ بل يجوز عليهم الذنوب في الجملة) باوەڕیان وا نییە کە هەر یەکێک لە هاوەڵەکان پارێزراون بن لە هەڵە و تاوانە گەورە و بچووکەکان؛ بەڵکو بەگشتی دەکرێت تووشی هەڵەبن، بەڵام ئەوەی کە توشی دەبن لە گوناهـ و تاوان، چەندان هۆکار هەیە بۆ ئەوەی خودا بەهۆیەوە لێیان خۆش بێت، لەوانە :

ئـ- بەهۆی (لهم من السوابق والفضائل ما يوجب مغفرة ما يصدر منهم -إن صدر) ئەو پێشینەو فەزیلانەی کە هەیانە وا دەکات لێخوشبوونیان مسۆگەر بێت بۆ ئەوەی ئەنجامیانداوە ـ ئەمە گەر ئەنجامیان دابێت ـ ، جا ئەو تاوانەی کە تاکێکیان توشی دەبێت بەهۆی چاکە گەورەکانیانەوە جێی لێبوردن و لێخۆشبوونە، هەروەک لەچیرۆکی حاتیب دا هاتووە، کاتێک ئەوەی کرد کە لە شەڕی فەتحدا ڕوویدا، لەتاوانەکەی بووران لەبەرئەوەی بەشداری جەنگی بەدری کردبوو (حتى إنهم يغفر لهم من السيئات ما لا يغفر لمن بعدهم ؛ لأن لهم من الحسنات التي تمحو السيئات ما ليس لمن بعدهم) تەنانەت هەندێ تاوان بۆ ئەوان جێی لێخۆشبوونە بەڵام بۆ کەسانی دوای ئەوان ئەو لێخۆش بوونە ڕەنگە نەبێت؛ چونکە ئەوان چاکەگەلێکیان هەیە کە بەهۆیەوە تاوانەکانیان دەسڕدرێتەوە و کەسانی دوای ئەوان ئەو چاکانەی نییە،

---

(١) متفق عليه : أخرجه البخاري (٧٣٥٢) ، ومسلم (١٧١٦) .

خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ [هود : ١١٤] ، واتە: بەدڵنیاییەوە خێر وچاکە تاوان لادەبات و دەیسڕێتەوە.

ب- ئەوان چەندان چاکەیان هەیە بەبەراورد بەکەسانی تر و هیچ کەسێك لەڕێز و فەزڵدا شان نادات لەشانیان (وقد ثبت بقول رسول الله ﷺ : «أنهم خير القرون ، وأن المد من أحدهم إذا تصدق به كان أفضل من جبل أحد ذهبا ممن بعدهم ») أخرجه الشيخان[1] ، واتە: بەفەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکلایی بووەتەوە: کە ئەوان لەباشترین کەسانی سەردەم و سەدەکانن، تەنانەت مشتێك خێری تاکێك لە ئەوان کاتێك دەیکاتە خێر باشترە لەخێری دوای خۆی بەشێوەیەك گەر زێڕ بکەنە خێر بەئەندازەی کێوی ئوحود، لەفەرموودەکەی ئەبو هورەیرە و عیمرانی کوڕی حوصەین دا هاتووە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : «**خير القرون قرني ، ثم الذين يلونهم**» باشترین کەسانی سەدەکان سەدەو سەردەمی منە، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان ، و «**القرون**» : جەمعی (**قرن**)ـە، و(**القرن**) حەڵکانی یەک سەردەمن و لێکەوە نزیکن و لەبابەتێک لەبابەتەکاندا هاوبەشن ، و(**القرن**) دەدرێت بەسەر ماوەیەك لەزەمان و کاتدا.

ت- زۆری هۆکارەکانی تاوان سڕەرەوە ، ئەوان شت گەلێکیان هەیە، کە تاوان دەسڕێتەوە بەڵام کەسانی دوای خۆیان ئەو چاکە و خێرەی نییە (فإذا كان قد صدر من أحدهم ذنب ؛ فيكون قد تاب منه ، أو أتى بحسنات تمحوه ، أو غفر له ؛ بفضل سابقيه) پاشان ئەگەر یەکێکیان گوناهێکی کردبێت، ئەوا تەوبەی لێ کردووە، یان کارێکی چاکی کردووە کە تاوانەکەی بۆ دەسڕێتەوە، یان لەسەری لادراوە، بەهۆی فەزڵی ئەو پێشینەیەیی کە هەیەتی، واتە: بەهۆی ئەو کارە چاکانەی کە پێش خۆیان خستووە (أو بشفاعة محمد ﷺ الذي لهم أحق الناس بشفاعته ، أو ابتلي ببلاء في

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢٦٥٢) ، ومسلم (٢٥٣٣) بلفظ : «خير الناس قرني...».

الدنيا كفر به عنه) یان بە شەفاعەتی موحەممەد ﷺ ، کە ئەوان شایەنی زۆرترین شەفاعەتی ئەویان هەیە، یان لەدونیادا تووشی بەڵایەک دەبێت، کە دەبێتە کەفارەت بۆی، واتە: تاقیکراوەتەوە و تووشی بەڵایەک بووە، کە بەهۆیەوە ئەو تاوانەی لێ سڕاوەتەوە و لەسەری نەماوە، وەک لە لەفەرموودەیەکی سەحیحدا هاتووە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**مَا يُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ وَلاَ وَصَبٍ وَلاَ هَمٍّ وَلاَ حَزَنٍ وَلاَ أَذًى وَلاَ غمٍّ، حتَّى الشَّوْكَةُ يُشَاكُها إِلاَّ كفَّر الله بِهَا مِنْ خطَايَاه**» متفق عليه[1] ، واتە: هیچ شتێك تووشی موسڵمان نابێت لە ماندووبوون و خەم و پەژارەو ئازار و کێشە، تەنانەت دڕکێکیش کاتێ کە ئازاری دەدات، ئیللا خوای گەورە بە هۆیەوە لە گوناهەکانی دەسڕێتەوە ولەسەری لایدەبات. هاوەڵان لەپێشترین کەسن بەوە.

دەڵێت : (فإذا كان هذا في الذنوب المحققة) جا ئەگەر ئەمە لەبارەی ئەو گوناهانەوە بێت کە بەهەقیقی بەدی هاتوون و ڕوویان داوە، واتە: لەواقع دا ڕوویدابێت، ئەوا ئەوان چەندان کاری چاکانەیان هەیە کە کەدەبنە کەفارەتی خراپەکانیان (فكيف بالأمور التي كانوا فيها مجتهدين) ئەی دەبێ لەو بابەتانەدا چۆن بن کە تێیدا کۆشش وئیجتیهادیان کردووە؟، و(**الاجتهاد**) : هەوڵدان و خستنەکاری تواناکانە بۆ تێگەیشتن لەحوکمێکی شەرعی (إن أصابوا فلهم أجران ، وإن أخطئوا ؛ فلهم أجر واحد ، والخطأ مغفور) گەر بپێکن دوو پاداشتان هەیە و، گەر بەهەڵەشدا بچن؛ ئەوا یەك چاکەیان بۆ هەیە و، هەڵەکەش بووراوە و مایەیی لێخۆشبوونە، هەروەک پێشتر ئەم بابەتەمان بەبەڵگەوە ڕوونکردەوە، کەواتە ئەو هەڵانەی کە لە هاوەڵانەوە ڕوو دەدەن هەرچەند زۆر کەمیشن لەدوو حاڵەت بەدەر نییە:

**یەکەمیان:** بەهۆی جۆرە تێگەیشتن و ئیجتیهادێکەوە بووە و ئەوان تێیدا پاداشت دەدرێنەوە.

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٥٦٤١) ، ومسلم (٢٥٧٣).

**دووەمیان:** کە بەبێ ئیجتیهاد ئەنجامیان داوە و تاوانێکە لەتاوانەکان، ئەم جۆرەیان بەهۆی ئەو کردەوە چاک و فەزیلەت و پێشینەی کە هەیانە دەبێتە کەفارەت بۆ هەڵەکەیان و دەیسڕێتەوە.

ووتەکەی : (ثم القدر الذي ينكر من فعل بعضهم) پاشان ئەو بڕە کارەی کە جێی ڕەخنە و تێبینی و هەڵوێستە لەسەر کردنە، کردەوەی هەندێکیانە، ئەمە پوختەی باسەکەی پێشووە و، ڕوونکردنەوەی ڕێز و فەزڵی هاوەڵان بەکورتی، بریتییە لە:

١- ئیمان بوون بەخودا و پێغەمبەرەکەی، کە ئەویش باشترین کردەوەیە .

٢- جیهاد لە ڕێگەی خوادا بۆ بەرزکردنەوەی وتە و کەلامی خودا، کە بە بەرزترین چڵەپۆپەی ئیسلام دادەنرێت .

٣- کۆچکردن لە پێناو خوادا، کە یەکێکە لە باشترین کارەکان .

٤- سەرخستن و پشتیوانی کردنی ئاینی خودا، خودای گەورە لەبارەیانەوە فەرموویەتی : ﴿وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ﴾ [الحشر : ٨ ] ، واتە: خودا و پێغەمبەرەکەی سەردەخەن ئا ئەوانەن ڕاستگۆکان لە باوەڕو جیهادیاندا.

٥- زانستی بەسوود و کردەوەی چاکە .

٦- باشترینی درووستکراون لە دوای پێغەمبەران، جا ئوممەتی موحەممەد ﷺ باشترینی گەلانە، هەروەک خودای گەورە فەرموویەتی :﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ﴾ [آل عمران: ١١٠] ،واتە:ئێوە چاکترین ئوممەت و کۆمەڵن، هێنراونەتە ئەم سەر زەوییە بۆ کەڵک گەیاندن بەمەردوم و ڕێنمایی کردنیان. ، وچاکترین ئوممەتە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوایە ﷺ؛ بەبەڵگەی فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ : «**خيركم قرني ، ثم الذين يلونهم**»[١] الحديث، واتە: باشترینتان ئەوانەن کە لەسەردەمی مندان، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان .

---

(١) سبق تخريجه .

٧- ئەوان نوخبەی سەدەکانی ئەم میللەتەن، کە باشترینی گەلان و بەڕێزترینیانە لەلای خودا، هەروەک لەو فەرموودەیەدا هاتووە کە ئیمام ئەحمەد گێڕاوەتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : «**أنتم تُوفُّون سبعين أمة، أنتم خيرها وأكرمها على الله سبحانه**» ، ورواه الترمذي وابن ماجه والحاكم في «مستدركه»[1]، واتە: ئێوە حەفتایەمین گەلن کە دەمرن، ئێوە باشترین و ڕێزدارینیانن لە لای خودا.



(١) حسن : أخرجه الترمذي ( ٣٠٠١ ) ، وابن حبان ( ٤٢٨٨ ) ، والحاكم في «مستدركه» (٤/٩٤) ، وقال الترمذي : هذا حديث حسن .

# عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت سەبارەت بە کەرامەتی پیاوچاکان

وَمِنْ أُصُولِ أَهْلِ السُّنَّةِ: التَّصْدِيقُ بِكَرَامَاتِ الأَوْلِيَاءِ وَمَا يُجْرِي اللهُ عَلَى أَيْدِيهِم مِّنْ خَوَارِقِ الْعَادَاتِ فِي أَنْوَاعِ الْعُلُومِ وَالْمُكَاشَفَاتِ وَأَنْوَاعِ الْقُدْرَةِ وَالتَّأْثِيرَاتِ، كالْمَأْثُورِ عَنْ سَالِفِ الأُمَمِ فِي سُورَةِ الْكَهْفِ وَغَيْرِهَا، وَعَنْ صَدْرِ هَذِهِ الأُمَّةِ مِنَ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ وَسَائِرِ قُرُونِ الأُمَّةِ، وَهِيَ مَوْجُودَةٌ فِيهَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ.

**یەكێك لەئەسڵ و بنەماكانی ئەهلی سوننە: بەڕاستدانانی كەرامەتی پیاوچاكانە، ئەوەی خودا لەسەر دەستی ئەوان دەیهێنێتە بوون لەو شتە نائاساییانەی، كە لەدەرەوەی دەسەڵاتی مرۆڤن هاوشێوەی چەندان جۆری زانست و زانیاری و كەشف، واتە: بینین وهەست كردن بە شتانێك كە كەسانی تر نایبینن و هەستی پێناكەن و هێزو توانا و كاریگەریەك، كە بەدەربێت لە عادەت و توانای كۆی مرۆڤەكان، ئەوەی لە گەلانی پێشووەوە گێڕدراوەتەوە لە سورەتی كەهف و جگە لەویش، ئەوەی لە پیاوانی سەرەتای ئەم میللەتەوە لە هاوەڵان و شوێنكەوتووانیان و هەموو تاقمەكانی ئومەتەوە گێڕدراوەتەوە، كەرامەت باقیە و تا ڕۆژی دوایی لەم ئومەتەدا هەردەمێنێ.**

---

شەرح

ووتەكەی : (ومن أصول أهل السنة) واتە: لە ئەسڵ و بناغەكانی عەقیدە و بیروباوەڕ و ئیمانەكەیان (التصديق بكرامات الأولياء) باوەڕبوونە بە كەرامەتی پیاوچاكان، و(**الكرامات**) : جەمعی (**كرامة**)ـەیە كە بریتییە لەوەی كە : (وما يجري الله على أيديهم من خوارق العادات) خودا لەسەر دەستی پیاوچاكان دەیهێنێتە دی

لەو شتانەی، کە لە دەرەوەی توانای مرۆڤەکانە، جا بۆیە بەکورتی کەرامەت [١]: بریتییە لەو شتە سەیرانەی، کە خودا لەسەر دەستی هەندێ لەبەندەکان دەیهێنێتە دی لەزانست و پێش بینی کردن و توانا ...هتد، و شتێکە لەدەرەوەی شتی باوە و لەتوانای مرۆڤەکاندا نییە، واتە: ئەوەی کە باوە لەناو خەڵکدا. و(**الأولياء**) : جەمعی (**ولي**)ـە : کە بریتییە لە مرۆڤێکی باوەڕداری بەتەقواو لەخوا ترس، هەروەك خودای گەورە فەرموویەتی : ﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٦٢ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ﴾ [یونس : ٦٢،٦٣] ، واتە: چاك بزانن و هۆشیاربن! کە دۆستەکانی خودا - دوا ڕۆژ- هیچ ترس و بیمێکیان لەسەر نییە، و دڵ زویرو خەفەتباریش نابن بۆ دونیای پاش خۆیان. دۆستانی خودا ئەوانەن کە: باوەڕی کامڵیان هێناوەو، هەمیشەش لە خودا دەترسن و، خۆ دەپارێزن لە هەر شتێ پێویستە خۆپارێزی لێبکەن، بەردەوامیش بە پێی فەرمانی خوداو پەیامبەر -ﷺ- کار دەکەن.

هۆکاری ناونانی بە(**ولي**) لەبەرئەوەی لە(**الولاء**) وەرگیراوە و، بەمانای خۆشویستن و نزیکبوونەوە (**المحبة والقرب**)دێت ، جا وەلی خودا : ئەوەیە کە خۆشەویستی بۆ خودا دەردەبڕێت بە خۆشەویستنی خۆشەویستانی و نزیک بوونەوە لێی بەئەنجامدانی فرمانەکانی .

شایەنی باسە کەرامەتی پیاوچاکان هەقە و، چەندان بەڵگەی قورئان و سوننەی لەسەرە و چەندان ڕیوایەت هەیە لەبارەیەوە لەهاوەڵان و تابیعینەوە .

**جا تاقمەکان لەبابەتی کەرامەتی پیاوچاکاندا دەبنە سێ تاقم و گرووپەوە:**

**تاقمی یەکەم:** ئەو بیدعەچیانەن کە نکوڵی لێ دەکەن، وەک موعتەزیلە و جەهمییەکان و هەندێک لە ئەشعەریەکان.

---

(١) بروانە : « شرح العقيدة الطحاوية » (٤٩٤) .

بیانو و گومانەکەیانیش: کەرامەت و شتە نائاساییەکان، گەر دروست بێت لەسەر دەستی پیاوچاکان ڕوو بدات ئەوکات ئەو کەسانە لەگەڵ پێغەمبەراندا جودا ناکرێنەوە و تێکەڵی و ناڕوونی ڕوو دەدات، بەو پێیەی جیاوازی نێوان پێغەمبەر و ئەوانی تر ئەو موعجیزەیەیە کە ڕێچکەشێنی شتی باو و خووەکانە.

**تاقمی دووەم:** ئەوانەی کە لەبابەتی کەرامەتدا تووشی زێدەڕۆیی بوون، هاوشێوەی شوێنکەوتوانی سۆفیگەریی و گۆڕپەرستەکان و بەناو شێخ و، دەروێش، بەشێوەیەك فێڵ و چاوبەست لەخەڵك دەکەن و موعجیزە شەیتانییەکان جێبەجێ دەکەن؛ وەک چوونە ناو ئاگر و لێدان لە خۆیان بە شمشێر و چەک و، گرتنی مار و دوو پشك و، شتی تر کە بانگەشەی بۆ دەکەن بۆ مردووی نێو گۆڕ لەو کردەوانەن کە پێی دەڵێن کەرامەت.

**تاقمی سێیەم:** ئەوانەی شێخ لێرەدا باسی کردوون ، ئەوانیش ئەهلی سوننەت و جەماعەن، جا باوەڕیان بە کەرامەتی پیاوچاکان هەیە و بە پێی ئەوەی لە قورئان و سوننەتدا هاتووە باوەڕیان پێیەتی و جێگیری دەکەن، ڕەدی ئەوانەش دەدەنەوە کە بەبیانووی تێکەڵ بوونی پێغەمبەران بەکەسانی تر کەرامەت ڕەتدەکەنەوە: بەو پێیەی لەبابەتی کەرامەتدا جیاوازی زۆر هەیە لە نێوان پێغەمبەران و کەسانی تردا. کەسی وەلی و پیاوچاك ئیدیعا و بانگەشەی پێغەمبەرایەتی ناکات، ئەگەر ئیدیعای کردبا، ئەوا لە وەلی بوون دەردەچوو و دەبووە ئیدیعاکار و درۆزن نەک وەلی، وە سوننەتی خودا وایە کەسە درۆزنەکان ئاشکرا بکات، وەک ئەوەی بەسەر موسەیلەمەی درۆزندا هات و... جگە لەویش لە کەسانی تری درۆزن.

وەڵامی ئەو کەسانەش دەدەنەوە، کە زێدەڕۆییان کردووە لە سەلماندن و دانپێنانی دا، ورەتی دەکەنەوە کەسانی ساختەچی و درۆزن ببنە وەلی و کەرامەتیان هەبێت، ئا ئەمانە وەلی خودا نین، بەڵکو وەلی شەیتانن و ئەوەی ئەنجامی دەدەن بەناوی کەرامەتەوە یان درۆ و فێڵە، یاخود فیتنەو تاقیکردنەوەیە بۆ ئەوان و کەسانی تریش وجۆێکە لە ئیستدراج و مۆڵەت دان بەکەسانی ناپاك و فێڵزان. والله أعلم.

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە کتێبێکی گەورەی هەیە لەسەر ئەم بابەتە بە ناوی: **«الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان»**.

وە وتەکەی کە دەڵێت: (في أنواع العلوم والمكاشفات وأنواع القدرة والتأثيرات) ئاماژەیەکە بەوەی کەرامەت ئەوەیە کە لە بابەتی زانین و ئاشکراکردنەوە دێت، کە بەندە شتانێك دەبیستێت، کە کەسانی تر نایبیستن، یان ئەو شتانێك دەبینێت کە کەسی تر نایبینێت لە کاتی بەئاگابوون یان لە خەودا، یان ئەو شتانێك دەزانێت کە کەسی تر نایزانێت، و جۆرێک لەکەرامەت هەیە، کە پەیوەندی بەهێز و کاریگەری درووستکردنەوە هەیە لەسەر شتەکان.

**نموونەی جۆری یەکەم:** بانگەکەی ئیمامی عومەر کاتێک کە لەمەدینە لەسەر مینبەر بوو وگوتی : **«يا سارية بنَ زُنَيْم، الجبلَ»**[1] ، واتە : ئەی سارییەی کوڕی زونەیب ، ئاگات لەلای شاخەکە بێت . لەکاتێکدا ساریە لەعێراق بوو و گوێی لەدەنگەکەی ئیمامی عومەر بوو.

هەروەها هەواڵدانی ئەبوبەکر بەوەی ئەوەی لەسکی خێزانەکەیدایە کچەو مێینەیە و، هەواڵدانی عومەر بەوەی نەوەی کوڕەکەی دادپەروەر دەبێت، هەروەها چیرۆکی هاوڕێکەی موسا و علیم و زانیاری لەبارەی حاڵی منداڵەکەوە[2] .

**نموونەی جۆری دووەم:** چیرۆکی ئەو کەسەی لە کتێبەکەوە فێربووە و هێنانی تەختی بەلقیس بۆ لای سلێمان، وچیرۆکی خەڵکی ئەشکەوتەکە (أصحاب الكهف)، وچیرۆکی مەریەم، وچیرۆکی خالیدی کوڕی وەلید کاتێک ژەهری خواردەوە و هیچ زیانێکی پێ نەگەیشت.

---

(١) أخرجه البيقهي في « الاعتقاد والهداية » (٢٠٣) ، في « السلسلة الصحيحة » برقم (١١١٠).

(٢) ئەوەی بەخزر بەناوبانگە و لەگەڵ موسادا گەشتێکیان کرد و لەناو گەشتەکەدا منداڵێکی کوشت لەبەرئەوەی دەیزانی ئەومنداڵە خراپ دەردەچێ و دەبێتە دەرد وبەڵا و کێشە بۆ دایک و باوکی و کۆمەڵگاش. (وەرگێڕ).

هەروەها وتەکەی: (والمأثور عن سالف الأمم في سورة الكهف وغيرها ، وعن صدر هذه الأمة من الصحابة والتابعين وسائر فرق الأمة) وە ئەوەی لە گەلانی پێشوو وجگە لەوانیشەوە گێڕدراوەتەوە لەسورەتی (**الكهف**) و سورەتەکانی تردا، لە پێشەوایان و باوباپیرانی ئەم میللەتەوە لە هاوەڵان و شوێنکەوتووەکان و هەموو تاقمەکانی ئوممەت.

ئەمانە ئاماژەن بۆ ئەو کەڕاماتانەی کە لەقورئان و دەقە سەحیحەکاندا باسکراوە، یەکێك لەو شتانەی خودا لەقورئانی پیرۆزدا باسی کردووە لەئوممەتانی پێشووەوە چیرۆکی دووگیانی مەریەمە بەبێ مێرد و، ئەوەی لە سورەتی کەهفدا باسکراوە سەبارەت بە چیرۆکی (**أصحاب الكهف**)، وچیرۆکی هاوەڵەکەی موسا (**خزر**)و، وچیرۆکی ذول قەرنەین.

هەروەها وەک ئەوەی کە دەگێڕدرێتەوە - واتە: بە زنجیرەیەکی درووستی گێڕەرەوە لە(صدر هذه الأمة) سەرەتای ئەم میللەتەوە دەگوازرێتەوە، واتە: یەکەمیان لە نێو هاوەڵان و تابیعییەکان؛ وەک عومەر لە کاتێکدا کە لە سەر سەکۆی مەدینە و لەشکری ساریا لە نەهاوەند بوو و بانگەوازەکەی بۆی: ئەی ساریە ئاگاداری شاخەکە بە، ساریە گوێی لەدەنگەکەی بوو و سوودی لەو ئاگادارکردنەوە بینی و سەلامەت بوو لەپیلان و تەڵەکەی دوژمن.

هەروەها وتەکەی: (وهي موجودة فيها إلى يوم القيامة)و تا ڕۆژی قیامەت تێیدا دەبێت، واتە: کەرامەتەک لەم میللەت وئوممەتەدا بەردەوام بوونی دەبێت تا ڕۆژی قیامەت تا ئەو کاتەی کە کەسی وەلی بوونی هەبێت بەمەرجەکانیەوە، والله أعلم.

⁂

# تایبەتمەندییەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت و، هۆکاری ناو نانیان بەو ناوە

ثُمَّ مِنْ طَرِيقَةِ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ اتِّبَاعُ آثَارِ رَسُولِ اللهِ ـ ﷺ ـ بَاطِنًا وَظَاهِرًا، وَاتِّبَاعُ سَبِيلِ السَّابِقِينَ الأَوَّلِينَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ، وَاتِّبَاعُ وَصِيَّةِ رَسُولِ اللهِ ـ ﷺ ـ حَيْثُ قَالَ: «عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ مِنْ بَعْدِي، تَمَسَّكُوا بِهَا، وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ؛ فَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ»(١). وَيَعْلَمُونَ أَنَّ أَصْدَقَ الْكَلامِ كَلامُ اللهِ، وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ـ ﷺ ـ وَيُؤْثِرُونَ كَلامَ اللهِ عَلَى غَيْرِهِ مِنْ كَلامِ أَصْنَافِ النَّاسِ، وَيُقَدِّمُونَ هَدْيَ مُحَمَّدٍ ـ ﷺ ـ عَلَى هَدْيِ كُلِّ أَحَدٍ.

وَلِهَذَا سُمُّوا أَهْلَ الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ، وَسُمُّوا أَهْلَ الْجَمَاعَةِ؛ لأَنَّ الْجَمَاعَةَ هِيَ الاجْتِمَاعُ، وَضِدُّهَا الْفُرْقَةُ، وَإِنْ كَانَ لَفْظُ الْجَمَاعَةِ قَدْ صَارَ اسْمًا لِنَفْسِ الْقَوْمِ الْمُجْتَمِعِينَ. وَالإِجمَاعُ هُوَ الأَصْلُ الثَّالِثُ الَّذِي يُعْتَمَدُ عَلَيْهِ فِي الْعِلْمِ وَالدين. وَهُمْ يَزِنُونَ بِهَذِهِ الأُصُولِ الثَّلاثَةِ جَمِيعَ مَا عَلَيْهِ النَّاسُ مِنْ أَقْوَالٍ وَأَعْمَالٍ بَاطِنَةٍ أَوْ ظَاهِرَةٍ مِمَّا لَهُ تَعَلُّقٌ بِالدِّينِ. وَالإِجْمَاعُ الَّذِي يَنْضَبِطُ هُوَ مَا كَانَ عَلَيْهِ السَّلَفُ الصَّالِحُ؛ إِذْ بَعْدَهُمْ كَثُرَ الاخْتِلافُ، وَانْتَشَرَ فِي الأُمَّةِ.

پاشان یەکێک لەڕێبازەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت: شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ ، لەناخ و ڕواڵەتیشدا و، شوێنکەوتنی ڕێبازی پێشەنگەکانی یەکەمی موهاجیرین و ئەنسار و پەیڕەوکردنی فەرمانی پێغەمبەری خودایە ﷺ ، کاتێک فەرموویەتی: "دەبێت پابەند بن بە سوننەتی من و سوننەتی خەلیفە ڕێنوێنیکراوەکان لە دوای منەوە، دەستی پێوە بگرن، بە ددانەکان بیگرن و ئاگاداری بیدعە وشتی نوێ

---

(١) أخرجه أحمد (١٧١٤١) ، وأبو داود (٤٦٠٧) ، وابن ماجه (٤٣) .

**وداهێنراو بن لەدیندا؛ چونکە هەموو بیدعەیەک گومڕایی وچەواشەکارییە" وە دەزانن کە ڕاسترین قسە قسەی خودایە، باشترین ڕێنمایش ڕێنمایی موحەممەدە ﷺ و، وتەی خودا پێشدەخەن بەسەر وتەی هەموو جۆرە کەسێکدا و، سوننەت وڕێبازی موحەممەد پێش ڕێبازی هەموو کەسێك دەخەن هەر بۆیە پێیان دەگوترێت: (ئەهلی قورئان و سوننەت) و پێیان دەگوترێت (ئەهلی جەماعەت)؛ چونکە جەماعەت لە کۆبوونەوەدایە و پێچەوانەکەی دابەشبوونە، تەنانەت ئەگەر دەستەواژەی جەماعەت بووبێتە ناوێک بۆ هەمان ئەو کەسانەی کۆکراونەتەوە، وکۆدەنگی: ئەسڵ و بنەمای سێیەمە، کە لە زانست و ئاییندا پشتی پێ دەبەسترێت. بەم سێ بنچینەیە، هەموو قسە و کردارەکانی خەڵک، ناوەوە یان دەرەوە و زاهیر، کە پەیوەندییان بە ئاینەوە هەیە، هەڵدەسەنگێنن. ئەو کۆدەنگییەی کە زەبت و جێگیرکراوە: ئەوە ئەوەیە کە پێشینە ڕاستگۆکان لەسەری بوون؛ دوای ئەوان جیاوازیەکە زیاتر بوو، ومیللەت و ئوممەتی ئیسلامی تەشەنەی کرد.**

---

## شەرح

کاتێک شێخ باسی ڕێباز ومیتۆدی ئەهلی سوننەتی کرد لە بابەتی عەقیدەدا، لەم بابەتە و ئەوەی دواتریشدا باسی لە ڕێبازی ئەهلی سوننەت کرد، ڕێبازەکەیان تایبەندییەکەی لە گشتگیری ئایین و سەرچاوەکانی و لقەکانی و وەسفەکانیانیدایە، کە پێیان خۆیان جیا دەکردەوە لە خەڵکی بیدعەچی و موخالیفەکان، جا هەندێك لەسیفاتەکانیان بریتییە لە:

١- (اتباع آثار رسول الله ﷺ باطنًا وظاهرًا) شوێنکەوتنی سوننەکانی پێغەمبەر لەناخ و ڕوڵەتدا، واتە : ڕێباز و ڕەوشتەکەی ودەستگرتن بەمەنهەجەکەیەوە (باطنًا وظاهرًا) لەناخ و ڕواڵەتدا، جیاواز لەو مونافیقانەی کە لە ڕواڵەتدا پەیڕەوی لێدەکەن

نەك ناخ و ناوەڕۆک، و(**آثار الرسول** ﷺ) سوننەتەکانی پەیامبەر، ئەمەش ئەوەیە کە لێوەی گێڕدراوەتەوە لە قسە یاخود کردار یاخود بێدەنگ بوون لەشتێك کە پێی زانیبێت. نەک مەبەست لێی شوێنەواری حسیەکانی بێت، وەک شوێنی دانیشتن و نوستن وهاوشێوەکانی؛ چونکە شوێنکەوتنی ئەوە هۆکارێکە بۆ کەوتنە ناو شیرکەوە، وەک ئەوەی لە گەلانی پێشوودا ڕوویدا.

٢- یەکێک لە خەسڵەتەکانی ئەهلی سوننەت بریتییە لە (اتباع سبيل السابقين الأولين من المهاجرين والأنصار)پەیڕەوکردنی ڕێبازی پێشەنگەکانی یەکەم لە موهاجیرین و ئەنسار؛ چونکە خوای گەورە بە زانست و فیقهی تایبەتی کردوون، ئەوان ئامادەی دابەزینی قورئان بوون و هۆکارەکەیان زانیووە، وگوێبیستی تەفسیریش بوون، وە لەپێغەمبەرەوە ﷺ شتیان وەرگرتووە بەبێ هیچ واستەیەك، ئەوان نزیکترین کەسن لەهەق و ڕاستیەوە و، لەپشترن لەوەی خەڵک دوای پێغەمبەر ﷺ شوێنیان بکەوێت، کەواتە شوێنکەوتنیان بە پلەی دووەم دێت لە دوای پێغەمبەر ﷺ.

جا وتەی هاوەڵان حوججە و بەڵگەیە کە دەبێت پەیڕەوی لێ بکرێت ئەگەر دەقێک لەو بارەیەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەبێت؛ چونکە ڕێباز و ڕێگاکەیان سەلامەتتر و زاناتر و ژیرترە، نەک وەک هەندێک لە زانایانی ئەم دواییە دەڵێن: ڕێگای سەلەف سەلامەتترە، بەڵام ڕێگای خەلەف زاناتر و لێزانانە ترە؛ شوێن ڕێگای خەلەف دەکەون و پەیڕەو دەکەن، و ڕێگای پێشینەکان وازلێدێنن.

٣- یەکێکی تر لە سیفەتەکانی ئەهلی سوننەت (اتباع وصية رسول الله ﷺ حيث قال : «**عليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين من بعدي ، تمسكوا بها ، وعضوا عليها بالنواجذ ، وإياكم ومحدثات الأمور ؛ فإن كل بدعة ضلالة**»)[1] پەیڕەوکردنی فەرمانی پێغەمبەری خودا ﷺ، کاتێک فەرموویەتی: «دەبێت شوێن سوننەتی من و سوننەتی خەلیفە ڕێنوێنی کراوەکان لە دوای من بکەون، دەستی پێوە

---

(١) أخرجه أحمد (١٧١٤١) ، وأبو داود (٤٦٠٧) ، والترمذي ( ٢٦٧٦) ، وابن ماجه ( ٤٣) .

بگرن، به ددانەکانتان بیگرن، ئاگاداری شتە تازە و داهێنراوەکان بن، چونکە هەموو بیدعەیەک گومڕایی و چەواشەکارییە».

مەبەستی شێخ ئەوەیە ڕوونی بکاتەوە کە ئەهلی سوننە و جەماعە بەتایبەت دوای ڕێگەو ڕێبازی خەلیفە ڕاشیدەکان دەکەون و پەیڕەوی دەکەن، دوای ئەوەی ڕێگای پێشەنگەکانی یەکەمی موهاجیرین و ئەنساریان بە گشتی پەیڕەو کرد؛ چونکە پێغەمبەر ﷺ وەسیەت و پێشنیاری پەیڕەوکردنی ڕێبازی خەلیفە ڕاشیدەکانی کردووە، کە فەرمانێکی تایبەتە لەم فەرموودەیە، کە تیایدا سوننەتی خەلیفە ڕاشیدەکان بەراورد دەکات لەگەڵ سوننەتەکەی خۆیدا ﷺ ، کەواتە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەوەی سوننەتی خەلیفە ڕاشیدەکان یان یەکێکیان بێت درووست نییە لێی لابدرێت.

و«الخلفاء الراشدين» وە خەلیفە ڕاست و ڕێنماییکراوەکان، بریتیین لە: چوار خەلیفەکە: ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان و عەلی، جا بەڕاشید وەسفکراون، چونکە ئەوان هەقیقەتیان زانیوە و شوێنی کەوتوون، و(**الراشد**) : ئەوەیە هەق دەناسێت و کاری پێدەکات، ودژەکەی(**الغاوي**)ـە : کە بریتییە لەوەی هەق دەناسێت بەڵام کاری پێناکات .

هەروەها وتەکەی: «المهديين» واتە : ئەوانەی ڕێنوێنی کراون بۆ هەق «تمسكوا بها» واتە : پابەند بن پێوەی ، «وعضوا عليها بالنواجذ» کینایەتە لەتوند دەستگرتن پێوەی ، و(**النواجذ**) : ددانی کۆتایی، واتە: کاکیلە. «ومحدثات الأمور» بریتییە لەبیدعە و شتی داهێنراو لەدیندا «فإن كل بدعة ضلالة» هەموو بیدعەیەك گومڕاییە، و(**البدعة**) لەزمانەوانیدا : ئەوەی کە نموونەی پێشووی نییە . وە لە شەریعەتدا: ئەوەیە کە بەڵگەی شەرعی لەسەر نییە. هەرکەسێک شتێکی نوێ دابێنێت و زیادی بکات بۆ دین بەبێ بەڵگە، ئەوا بیدعە و چەواشەکارییە، جا لەبیر وباوەڕدا بێت یان لە قسە یان کردار.

٤- یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەهلی سوننە ئەوەیە، کە ڕێز لە کتێبی خودا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی دەگرن و بەرزیان دەکەنەوە و دەیانکەنە بەڵگە و شوێنیان

دەکەون و دەیکەنە حەکەم و دادوەر بەسەر قسە و کرداری خەڵکدا ؛ چونکە ئەوان : (یعلمون أن أصدق الكلام كلام الله) دەزانن باشترین وتە وتەی خودایە، خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلًا﴾ [النساء : ١٢٢] ، واتە: جا چ کەسێک لەخوا ڕاست بێژترە لەبڕیارەکانیدا؟، ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثًا﴾ [النساء : ٨٧] ،واتە: جاکێ لە خوا قسەو گوفتاری ڕاسترە؟!.

هەروەها دەزانن : (خير الهدي هدي محمد ﷺ) باشترین ڕێباز ڕێبازی موحەمەدە ﷺ ، و(**الهَدْي**) : بەفەتحی هائەکە و سکونی دالەکە : ڕێگاو ڕێبازە وژیاننامەیە و، بەزەممی هائەکە و فەتحی دالەکەش خوێندراوەتەوە، -و(**الهُدَى**) - واتە : دەلالەت و ڕێنوێنی .

(ويؤثرون كلام الله على غيره من كلام أصناف الناس) واتە : وتەی خودا پێش وتەی هەمووان دەخەن و هەرشتێکی دژی بێت وازی لێ دێنن جا وتەی هەرکەسێك بێت و هەر پلەو پایەیەکی هەبێت، دەسەڵاتدار بێت یاخود زانا و پیاوچاك (ويقدمون هدي محمد ﷺ) واتە : سوننەت و تەعلیمات و ڕێنماییەکانی پێغەمبەر ﷺ پێشدەخەن (على هدي كل أحد) بەسەر ڕێبازی هەموو خەڵکدا، هەرچەند پلەو پایەشی بەرز بێت، گەر ڕێبازەکەی تێکبگرێتەوە لەگەڵ ڕێبازی پێغەمبەری خوادا ﷺ ؛ وەك کارکردن بەم فەرمایشتەی خوای پەروەردگار : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ [النساء : ٥٩] واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە! گوێڕایەڵیی فەرمانی خواو پەیامبەربن لەهەموو کاروبارێکدا، وە بەر فەرمانی کاربەدەستان و کارسازانی خۆتان بن، واتە: بەقسەی ئەو کاربەدەست و زانایانە بکەن، کە لەخۆتانبن. واتە: لەچوارچێوەی شەریعەتدا گوێڕایەڵیان بن، ئینجا ئەگەر لەشتێکدا کێشەو ناکۆکیتان بوو ، جا بیگێڕنەوە بۆلای خواو پەیامبەر ﷺ ، واتە: با تەنها قورئان و سوننەت داوەرو حەکەمتان بن.

هەروەها وتەکەی : (ولهذا سُموا : أهل الكتاب والسنة) واتە : بۆیە ناویان نرا ئەهلی قورئان و سوننەت؛ لەبەر دەستگرتنیان بەقورئان و سوننەتەوە وپێشخستنی وتەی خودا بەسەر وتەی هەموو کەسێکدا و، پابەندبوونیان بەڕێبازی پێغەمبەری خواوە ﷺ و، پێشخستنی بەسەر ڕێبازی هەموو کەسێکدا ـ ناونراون بە ئەهلی سوننە و جەماعە، لەبەرئەوەش ئەم نازناوە پیرۆزەشیان وەرگرتووە، کە وا دەخوازێت ئەوان تایبەت بن پێوەی جگە لەکەسانی تر ئەوانەی پشتیان کردووە لەقورئان و سوننە لەتاقمە گومڕاو سەرلێشێواوەکان؛ هاوشێوەی موعتەزیلە و خەواریج و ڕافیزە و ئەوانەش هاودەنگ و هاوئاوازیان لەبیرو بۆچوونەکانیاندا یاخود لەهەندێکی دا[١].

هەروەها وتەکەی: (وسُموا : أهل الجماعة) ناویانراوە: ئەهلی سوننە، واتە: وەک چۆن ناوزەدکراون بە ئەهلی کیتاب و سوننە، ئاوهاش ناونراون (أهل الجماعة) ئەهلی جەماعە، وجەماعەت دژی دابەشبوونە؛ چونکە پابەندبوون بە کیتاب و سوننەت خوازەری کۆبوونەوە و هاوپەیمانی و هاودەنگ بوونە،خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ ﴾ [آل عمران : ١٠٣] ، واتە: هەمووان دەست بگرن بەدینەکەی خوداوە و دوو بەرەکی و خیلاف درووست مەکەن، جا جەماعەت لێرەدا: ئەوانەن کە لەسەر هەق کۆبوونەتەوە .

٥- یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی ئەهلی سوننەت یەکگرتوویی لە وەرگرتنی کیتاب و سوننەت و ڕێککەوتن لەسەر هەقیقەت و هاوکارییە لە چاکە و تەقوادا. وە بەرهەمی ئەمەش بوونی ئیجماع و کۆدەنگیە، (وَالإِجمَاعُ هُوَ الأَصْلُ الثَّالِثُ الَّذِي يُعْتَمَدُ عَلَيْهِ فِي الْعِلْمِ وَالدينِ) کۆدەنگی: ئەسڵ و بنەمای سێیەمە، کە لە زانست و ئاییندا پشتی پێ دەبەسترێت ، و زانایانی زانستی ئوصول ئیجماع بەوە پێناسە دەکەن:

---

(١) بروانە: «معالم أصول الفقه» للجيزاني (ص ١٨٦) .

کۆدەنگی زانایانی سەردەمێکە لەسەر بابەتێکی دینی و، ئەوەش بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیە و پێویستە کاری پێبکرێت.

هەروەها وتەکەی : (وهو الأصل الثالث)وە ئەوەش بنەمای سێیەمە، واتە: دوای دوو بنەمای یەکەم کە بریتیین لە قورئان و سوننەت.

٦- یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەهلی سوننەت ئەوەیە کە(یزنون بهذه الأصول الثلاثة) شتەکان بەم سێ بنەمایە" قورئان و سوننەت و ئیجماع" دەپێون(جمیع ما علیه الناس من أقوال وأعمال باطنة أو ظاهرة مما له تعلق بالدین)هەموو ئەو شتانەی کە مرۆڤەکان هەیانە لە قسە و کرداری ناخ و ناوەوە یان ڕواڵەت وشتانی دیار، کە پەیوەندییان بە ئاینەوە هەیە، ئەوان ئەم سێ بنەمایە دەکەنە پێوەر بۆ ناسین هەق و جوداکردنەوەی لەناهەق و، ڕێنوێنی لەگومڕایی و سەرلێشواوی ئەوەی کە خەڵکی ئەنجامی دەدەن لە هەڵس و کەوت جا قسە بێت یاخود کردار یاخود بیروباوەڕ (مما له تعلق بالدین) لەو شتانەی کە پەیوەندی بە ئایینەوە هەیە، لە کردەوەی مرۆڤەکان؛ وەک نوێژ، ڕۆژوو، حەج، زەکات، مامەڵە و هتد..سەبارەت بەو شتانەی کە پەیوەندی بە دینەوە نییە لە بابەتە ئاساییەکان و شتە ئاساییەکان و شتە دونیاییەکان، ئەسڵ وایە هەمووی درووستە مەگەر بەڵگەیەک هەبێت لەسەر نادروستی یەکێکیان.

پاشان شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، واقیعی ئەو کۆدەنگی و تەوافوقەی ڕوونکردەوە کە دەیکاتە بنەما بۆ کردنە بەڵگە و دەڵێت:

(والإجماع الذي ینضبط) واتە: ئەو کۆدەنگیەی کە زەبت کراوە کە دەکرێت ڕوویدات و بێتەدی : (هو ما كان علیه السلف الصالح)ئەو کۆدەنگیەیە کە سەلەفی ساڵەح لەسەری بوون و کۆدەنگی ئەوانی لەسەرە؛ لەبەرئەوەی ژمارەیان کەم بوو و لەگەڵ ئەوەشدا هەموو لەحیجاز کۆبووبوونەوە و، دەکرا پرسیان پێبکرێت و بۆچوونیان بزانرێت سەبارەت بەهەربابەتێك (وبعدهم كثر الاختلاف ، وانتشرت الأمة)بەڵام دوای ئەوان خیلاف وڕاجیایی زۆر بوو و، ئومەتی ئیسلامیش بەرفراوان بوو، واتە : سەبارەت بەدوای ئەوان کە ئیختلاف و ڕاجیەکی ئیجگار زۆر هاتە ئاراوە

و، ئومەتی ئیسلامی زۆر بوو و بڵاو بوویەوە، لەم حاڵەتەدا ئیجماع زەبت ناكرێت و ڕوودانی قورس یاخود ئەستەمە لەبەر دوو هۆكار :

**یەكەمیان :** زۆری خیلاف و ڕاجیاییەكان بەشێوەیەك ناتوانرێ پەی بەهەموو بۆچوونەكانیان ببرێت، كە لەبابەتەكاندا هەیانە.

**دووەم :** بڵاوبوونەوەی ئوممەتی ئیسلامی لە وڵاتانی سەرزەوی دوای فەتح و ڕزگاری كردنی وڵاتان، بەجۆرێک كە بە شێوەیەكی ئاسایی ناتوانرێت بۆ هەر یەكێكیان بگاتە ڕووداوەكە و لەسەری بوەستێت.

پاشان ناتوانیت دڵنیا بیت لەوەی كە ئەوان یەک بۆچوونیان هەبووە لەهەر بابەتێكدا و خیلاف وڕاجیاییان نەبووە.

**تێبینی:** شێخ خۆی بەتەنها تیشكی خستە سەر باسكردنی سێ بنەماكە، وە باسی بنەمای چوارەمی نەكرد: كە بریتییە لە قیاس و لێكچوون؛ چونكە قیاس بەڵگەیەكە كۆدەنگی لەسەر نییە لەنێو زانایاندا و ناكۆكن تێیدا، كە ئایا بەشێك لە بەڵگە و ئەدیللەی ئەحكام یاخود نا ؟، هەروەک چۆن لە چەند بابەتێكی دیكەشدا جیاواز بوون كە باس وخواسیان كتێبە ئوسوڵیەكانە، واتە: **(أصول الفقه)**.



# ڕوونکردنەوەی تەواوکەرەکانی عەقیدە لە ڕەوشتی شەرەفمەندانە و ئەو کردەوانەی کە ئەهلی سوننەت خاوەندارێتی دەکەن

ثُمَّ هُم مَّعَ هَذِه الأُصُولِ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ، وَيَنْهَونَ عَنِ الْمُنْكَرِ عَلَى مَا تُوجِبُهُ الشَّرِيعَةُ: وَيَرَوْنَ إِقَامَةَ الْحَجِّ وَالْجِهَادِ وَالْجُمَعِ وَالأَعْيَادِ مَعَ الأُمَرَاءِ أَبْرَارًا كَانُوا أَوْ فُجَّارًا، وَيُحَافِظُونَ عَلَى الْجَمَاعَاتِ. وَيَدِينُونَ بِالنَّصِيحَةِ للأُمَّة، وَيَعْتَقِدُونَ مَعْنَى قَوْلِه ـ ﷺ ـ : «الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ الْمَرْصُوصِ؛ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا»، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِه، وَقَوْلِه ـ ﷺ ـ : «مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ كَمَثَلِ الْجَسَدِ؛ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ؛ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالْحُمَّى وَالسَّهَرِ». وَيَأْمُرُونَ بِالصَّبْرِ عِنْدَ الْبَلاءِ، وَالشُّكْرِ عِنْدَ الرَّخَاءِ وَالرِّضَا بِمُرِّ الْقَضَاءِ.

ئینجا ئەهلی سوننە لەگەڵ ئەم ئەسڵ و بنەمایانەشدا فەرمان بەچاکە دەکەن و ڕێگری دەکەن لەخراپە بە پێی ئەوەی شەریعەت داوایان لێدەکات و، پێیان وایە: حەج و جیهاد و گردبوونەوە و ئاهەنگ لەگەڵ حاکمەکاندا ئەنجام دەدرێت: کەسانی چاك بن یاخود خراپ[١] ، وە پارێزگاری دەکەن لەگرۆ وکۆمەڵی موسوڵمانان و توشی تەفرەقە و دوو بەرەکی ناکەن و، پابەندن بە ئامۆژگاری کردنی میللەتەوە و، باوەڕیان بە مانای وتەکەی پێغەمبەر ﷺ هەیە، کە دەفەرموێت: «ئیماندار بۆ ئیماندار وەک

(١) هەڵبەت گەر موسوڵمان بوون و ئەحکامەکانی ئیسلامیان جێ بەجێ دەکرد، ئەوکات گەر خۆیانیش خراپ بن ئەوا نوێژ وحەج و جیهادیان لەگەڵ دەکرێت دژ بە دوژمنان، جا کەدەڵێین نوێژیان لەگەڵ دەکرێت؛ لەبەر ئەوەیە حاکم و دەسەڵاتدارنی پێشوو دەهاتنە مزگەوت و پێشنوێژیان بۆ خەڵك دەکرد و بەشداری مەڕاسیمی حەج و جەژنەکانیان دەکرد، نەك وەك زۆرێك لەدەسەڵاتدارانی ئێستا کە قەت لەمزگەوت نەبینراون! (وەرگێڕ).

**بینایەکی پتەو وایە، هەندێکیان ئەویتری ڕاگرتووە و بە توندی بە یەکەوە گرێدراون» و پەنجەکانی دەستی کرد بەناو یەکدا ولەیەکتردا تێکەڵی کرد. وە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ: «نموونەی ئیمانداران لە خۆشەویستی و ڕەحم و هاوسۆزی یەکتریاندا وەک یەك جەستە وایە، کاتێ ئەندامێکی توشی ئازاربێت؛ گشت ئەندامەکانی تر تووشی نارەحەتی دەبن وئاسوودە نابن». وفەرمان دەکەن بەوەی لە کاتی ناخۆشیدا ئارام بگرن و لە کاتی خۆشگوزەرانیدا سوپاسگوزار بن و ڕازی بن بەناخۆشی قەزاو قەدەر.**

---

## شەرح

ئەم بەشە تەواوکەری ئەو بابەتەی پێش خۆیەتی، کە تێیدا ڕوونکردنەوەیەک لەسەر سیفەتەکانی ئەهلی سوننەت هەیە، کە بەشێکە لەتەواوکەرەکانی عەقیدە، جا وتەکەی: (ثم هم) پاشان ئەوان، واتە : ئەهلی سوننە ، (مع هذه الأصول) واتە: لەگەڵ بوونی ئەم بنەمایانە کە پێشتر باسکرا، واتە: لەگەڵ ئەوەی بەزانست و کردار جێبەجێی دەکەن ئەوان چەندان سیفەتی تریشیان تێدایە، کە تەواوکەری عەقیدەیە و بەرهەمەکەیەتی جا ئەوان(يأمرون بالمعروف ، وينهون عن المنكر) فرمان بەچاکە دەکەن و ڕێگری دەکەن لەخراپە، هەروەك خوای پەروەردگار وەسفی کردوون بەوە : ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾ [آل عمران : ١١٠] ، واتە: ئێوە چاکترین ئوممەت و کۆمەڵن، هێنراونەتە ئەم سەر زەوییە بۆ کەڵک گەیاندن بەمەردم و ڕێنمایی کردنیان، بۆیە فەرمان بەچاکە دەدەن و، ڕێ لەکاری خراپەو شیرک دەگرن، بەڵام گەلانی تر، وەک ئێوە ئەم سیفەتانەیان گشت تێدانییە. پێشەوا (عومەر) فەرمووی: ئەوکەسەی پێی خۆشە لەم ئوممەت و کۆمەڵی ئیسلام بێت، دەبێ باوەڕی بەخوا هەبێ و، فەرمان بەچاکە بداو ڕێ لەخراپە بگرێت.

و(**المعروف**) : ناوێکی گشتگیرە بۆ هەموو شتێک کە خودا خۆشی دەوێت، وەك باوەڕهێنان و کردەوەی چاکە. و(**المنکر**): ناوێکی گشتگیرە بۆ هەموو شتێک کە خودا ڕقی لێیەتی و حەرامی کردووە ، (علی ما توجبه الشریعة) بەوشێوەیەیی کە شەریعەت فرمانی پێکردووە، واتە: گەر توانیت بەدەس خراپەکە بگۆڕە پاشان بەزمان پاشان بەدڵ هەڵبەت بەپێی توانا و مەسڵەحەت و بەرژەوەندی[1]، بە پێچەوانەی ئەو موعتەزیلانەی، کە دژایەتی ئەو شتانە دەکەن کە شەریعەت لەمەدا فەرمانی پێکردووە و، پێیان وایە فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لەخراپە بریتییە لەخروج کردن ودەرچوون و یاخی بوون لەئوممەت.

ووتەکەی: (ویرون إقامة : الحج ، والجهاد ، والجمع ، والأعیاد مع الأمراء : أبرار کانوا أو فجارا) واتە: ئەهلی سوننە پێیان وایە واجبە ئەم ڕێوڕەسمانانە لەگەڵ فەرمانڕەواکانی موسڵماناندا ئەنجام بدرێت (أبرارا کانوا أو فجارا) واتە : جا فرمان ڕەواکان کەسانی چاك و ساڵەح بن یاخود فاسق بەمەرجێك فیسقێك نەبێت لەئیسلام بینباتە دەرەوە.

ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە مەبەستی موسڵمانان لەم کارەدا یەکخستن موسوڵمانان و یەکدەنگی درووستکردنە و، دوورکەوتنەوەیە لە دووبەرەکی و ناکۆکی، هەروەها لەبەر ئەوەی فەرمانڕەوای فاسق بە هۆی فیسقەکەیەوە لانادرێت و لەدەسەڵات دوور ناخرێتەوە و دروست نییە لە دژی ڕاپەڕین بکرێت؛ چونکە ئەوکارە دەبێتە هۆی خوێنڕێژی و لەدەستدانی چەندان ماف و هەق و دەرئەنجامێکی باشی نابێت.

**شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە** (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: «**ولعله لا یکاد یعرف طائفة خرجت علی ذي سلطان إلا وکان في خروجها من الفساد أکثر من الذي**

(١) کاتێ دەڵێت: مەسڵەحەت، واتە: مەسڵەحەتی شەرع نەك مەسڵەحەتی شەخسی، بەجۆرێك کەسانێك بێت مەسڵحەتی خۆیان و تاقمەکەیان تێکەڵ بەمەسڵەحەتی شەرع بکەن. (وەرگێڕ).

**في إزالته»**[١]، واتە: ڕەنگە بەزەحمەت تاقمێك هەبێت، کە لە دژی ئەو کەسەی دەسەڵاتدارە ڕاپەڕیبێت، ئیللا زیانی ئەو ڕاپەڕینە زیاتر بووە لە لادانی دەسەڵاتدارەکە و دوورخستنەوەی لەدەسەڵات.

ئەهلی سوننە لەمەدا جیاوازن لە بیدعەچیەکان هاوشێوەی خەواریج و موعتەزیلە و شیعەکان کە شەڕکردن لەگەڵ دەسەڵاتداران و ڕاپەڕین لە دژی ئەوان دەبینن، ئەگەر کارێکی ناڕەوا بکەن یان پێیان وایە ناڕەوا بێت و ئەمەش وەک بابەتێک دەبینن لە فەرمان کردن بە چاکە و قەدەغەکردنی خراپە.

هەروەها وتەکەی: (ويحافظون على الجماعات)وپارێزگاری دەکەن لەجەماعەت، واتە: لە تایبەتمەندییەکانی ئەهلی سوننەت: ئامادەبوونی نوێژی فەرزە لەگەڵ جەماعەت، جا نوێژی هەینی بێت یاخود نوێژەکانی تر جومعە یان جگە لەوە دەپارێزن؛ چونکە ئەوە یەکێکە لە گەورەترین ڕێوڕەسمەکانی ئیسلام و گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەرەکەی لەوەدایە، بە پێچەوانەی شیعەکانەوە، کە پێیان وانییە نوێژ درووست بێت جگە لە گەڵ ئیمامە مەعسوم و بێهەڵەکان، و بە پێچەوانەی ئەو مونافیقانەی کە لە جەماعەت دواکەوتوون، هەڵبەت چەندان فەرموودە هاتووە فەرمان بەئامادەبوون دەکات بۆ نوێژی جەماعەت وئێرە شوێنی باسکردنی نییە.

(ويدينون بالنصيحة للأمة)ئامۆژگاری ئومەت بەدین دەزانن، واتە: بەبەشێك لەدین لێی دەڕوانن .

ئەسڵی ئامۆژگاری (**النصح**) لە زماندا: دڵسۆزیە، و لە ڕووی شەرعەوە: خواستی چاکەیە بۆ ئەو کەسەی ئامۆژگاری دەکرێت و ڕێنمایی دەکرێت بۆ ئەوەی بەرژەوەندی کەسی ئامۆژگاریکراوی تێدایە، ئەهلی سوننەت خێریان بۆ میللەت دەوێت و، ڕێنوێنی خەڵك دەکەن بۆ ئەوەی بەرژەوەندی میللەتی تێدایە.

---

(١) «منهاج السنة النبوية» (٣٩١/٣) .

**لە ئاکار و خەسڵەتەکانی ئەهلی سونئەت:** هاوکاری کردن لە چاکەدا و، هاوسۆزی بوونە بۆ ئازاری ئەو کەسانەی، کە توشی بەڵا بوون و بەدەستیەوە دەناڵێنن، (يعتقدون معنى قوله ﷺ : «المؤمن للمؤمن كالبنيان ، يشد بعضه بعضا» ، وشبك بين أصابعه ) رواه البخاري ومسلم [(١)] ، وباوەڕیان بەمانای فەرمایشتەکەی پێغەمبەرە ﷺ : «وێنەی باوەڕدار بۆ باوەڕداری تر وەك دیوار وایە، هەندێکی ئەویتری ڕاگرتووە» و پەنجەی دەستەکانی کرد بەنێو یەکدا،(وقوله ﷺ : «مثل المؤمنين في توادهم وتراحمهم وتعاطفهم كمثل الجسد إذا اشتكى منه عضو ؛ تداعى له سائر الجسد بالحمى والشهر») رواه البخاري ومسلم وغيرهما[(٢)]،(وە فەرمایشتەکەی: «نموونەی ئیمانداران لە خۆشەویستی و ڕەحم و هاوسۆزی یەکتریاندا، وەک یەك جەستە وایە، کاتێ ئەندامێکی توشی ئازاربێت؛ گشت ئەندامەکانی تر توشی ناڕەحەتی وشەونخونی دەبن وئیسراحەت ناکەن»).

ئەم دوو فەرموودەیە ئاماژەیەکە بەوەی کە پێویستە موسڵمانان لەسەری بن و ڕەچاوی بکەن لەڕووی هاوکاری و بەزەیی و، ئەهلی سونئە کار بەمانا و ناوەڕۆکەکەیان دەکەن.

هەروەها فەرمایشتی : «المؤمن للمؤمن» ، هەروەها فەرمایشتی : «مثل المؤمنين» مەبەست لە باوەڕ (**الإيمان**) لێرەدا : ئیمانی کامڵە «كالبنيان» وەك دیوار و خانوون ، ئەمە نموونەیە بۆ نزیکردنەوەی تێگەیشتنە «يشد بعضه بعضا» ڕوونکردنەوەی شتە هاوبەشەکەی نێوان دیوار و موسوڵمانانە (وشبك بين أصابعه) نموونەیەکی ترە و مەبەست لێی زیاتر تێگەیشتنە . وە فەرمایشتی : «كمثل الجسد الواحد» واتە : بەنیسبەت گشت ئەندامەکانی تریەوە لەڕووی هەست کردن بە خۆشی یاخود ناڕەحەتی و ئازار «توادهم» واتە: خۆشەویستی هەندێکیان بۆ ئەوانیتر ، «وتعاطفهم»

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٤٨١) ، ومسلم (٢٥٨) .

(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (٦٠١١) ، ومسلم (٢٥٨٦) .

واتە : سۆزی هەندێکیان بۆ ئەوانیتر «إذا اشتكى»هەست بەئازار بكات «تداعى» دەنگی لێبەرزدەبێتەوە و هاوبەش دەبێت لەئێش و ئازار پێگەیشتندا لەگەڵ ئەوانیتر «سائر الجسد» گشت ئەندامەکانی تری لاشەی «بالحمى» ئەوە تایەی کە بەهۆی ئازارەوە توشی دەبێت «والسهر» شەونخونی و نەنووستنە .

ئەم فەرموودەیە: مانای ئەوەیە: هەروەک چۆن بەشێک لە جەستەی ئازار بچێژێت، ئەو ئازارە بۆ هەموو جەستەی بڵاودەبێتەوە، بەهەمان شێوە ئیمانداران وەک یەک ڕۆح وان؛ گەر کەسێکیان تووشی بەڵاو ناخۆشیەك بێت ئەوا هەموویان تووشی غەم وخەفەت دەبن و کاردەکەن بۆ لابردنی، ئەمەش جۆرێکە لەچواندن کە مەبەست لێی زیاتر تێگەیاندنە و هێنانە بەرچاوی مانا و مەبەستەکانە وەك وێنە و شاشە.

**یەکێکی تر لە سیفەتەکانی ئەهلی سوننە:** خۆڕاگرییانە لە دۆخی ناڕەحەت و تاقیکردنەوەدا، (يأمرون بالصبر على البلاء) فەرمان دەکەن بە ئارامگرتن لەسەر بەڵاو ناخۆشی، و(**الصبر**) لە ڕووی زمانەوانییەوە: خۆگرتنەوە و زیندانیکردنە، و ماناکەی لێرەدا: خۆگرتنی ڕۆحە لە دڵەڕاوکێ و ڕاگرتنی زمانە لە سکاڵای حاڵی خۆ کردن و ناڕەزایی دەربڕین و، گرتنەوەی ئەندامەکانی لاشەیە لە لەڕوومەتدان و یەخە داڕنین[1].

و بەڵا (**البلاء**) تاقیکردنەوەیە بە بەڵا و ناخۆشی و ناڕەحەتی، (والشكر عند الرجاء) و سوپاسگوزاری (**الشكر**) : کارێکە لەسەر بەگەورەدانانی نیعمەتبەخش؛ بەو پێیەیی بەخشەری نیعمەتە، کە ئەویش بریتییە لە بەکارهێنانی نیعمەتەکان لەلایەن بەندەوە لە گوێڕایەڵی خودادا (**الرخاء**) فراوانی نیعمەتە، (والرضا بمر القضاء) ڕازی بوون بەناخۆشی قەزاو قەدەر، و(**الرضا**): دژی ناڕەزاییە، و(**القضاء**) لەڕووی زمانەوانیەوە [2]: حوکم و دادوەریە . ولەڕووی عورفەوە: ویست و ئیرادەی خودایە ئەوەی پەیوەستە بەشتەکانەوە بەوشێوەیەیی کە هەیە. و(**مُر القضاء**) واتە: تاڵی و

---

(١) بڕوانە : «عدة الصابرين» لابن قيم الجوزية (ص ٣٣) دار ابن الجوزي .

(٢) بڕوانە : « القضاء والقدر» للدكتور عمر سليمان الأشقر (ص ٢٧).

ناڕەحەتی قەزاو قەدەر) : ئەوشتانەیە کە بەسەر مرۆڤدا دێت وپێی ناخۆشە؛ وەک نەخۆشی، هەژاری، زیانگەیاندن بە مرۆڤ، گەرما، سەرما و ئازار.



وَيَدْعُونَ إِلَى مَكَارِمِ الأَخْلاقِ، وَمَحَاسِنِ الأَعْمَالِ، وَيَعْتَقِدُونَ مَعْنَى قَوْلِهِ ـ ﷺ ـ : «أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا». وَيَنْدُبُونَ إِلَى أَنْ تَصِلَ مَنْ قَطَعَكَ، وَتُعْطِيَ مَنْ حَرَمَكَ، وَتَعْفُوَ عَمَّنْ ظَلَمَكَ. وَيَأْمُرُونَ بِبِرِّ الْوَالِدَيْنِ، وَصِلَةِ الأَرْحَامِ، وَحُسْنِ الْجِوَارِ، وَالإِحْسَانِ إِلَى الْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ، وَالرِّفْقِ بِالْمَمْلُوكِ. وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْفَخْرِ، وَالْخُيَلاءِ، وَالْبَغْيِ، وَالاسْتِطَالَةِ عَلَى الْخَلْقِ بِحَقٍّ أَوْ بِغَيْرِ حَقٍّ. وَيَأْمُرُونَ بِمَعَالِي الأَخْلاَقِ،وَيَنْهَوْنَ عَنْ سَفْسَافِهَا. وَكُلُّ مَا يَقُولُونَهُ وَيَفْعَلُونَهُ مِنْ هَذَا وَغَيْرِهِ؛ فَإِنَّمَا هُمْ فِيهِ مُتَّبِعُونَ لِلْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ.

هەروەها بانگەوازی دەکەن بۆ: بەرزترین ڕەوشت و باشترین کردەوە و، باوەڕیان بە مانای فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ هەیە: (کامڵترینی باوەڕداران لە ئیماندا باشترینیانن لە ڕەوشت و ئەخلاقدا)، وە بانگەشە بۆ ئەوە دەکەن، کە سەردانی ئەو کەسانە بکەیت کە پەیوەندیان لەگەڵ دابڕیوی و، ببەخشیت بەو کەسانەی کە بێبەشیان کردوویت و، لێخۆشبوون لەوانەی ستەمیان لێکردوویت و، فەرمان دەکەن بە ڕێزگرتن لە دایک و باوک و، پاراستنی پەیوەندی خزمایەتی و، دراوسێیەتی باش و، خێرخوازی بەرامبەر بە منداڵانی بێباوک و، کەسانی کەمدەرامەت و کەسانی ڕێبوار و، نەرم ونیان بوون لەگەڵ بەندەو خزمەتتکاردا و، ڕێگری دەکەن لە لووتبەرزی و خۆبەزلزانین و سەرپێچی و خۆفەرزکردن بەسەر کەسانی تردا، جا بەهەق یان ناهەق و، فەرمانکردن بە ئەخلاقی بەرز و، ڕێگری دەکەن لەڕەوشتی نزم و هەرزەکارانە.

هەرچی دەیڵێن و دەیکەن لەم شتانە یان شتانی تر؛ تیایدا پەیڕەوی لە قورئان و سوننەت دەکەن و ئامۆژگاری لەو دووانە وەردەگرن.

## شەرح

ئەهلی سوننە گرنگیەکی زۆر بەڕەوشت دەدەن و لە خەمیدان، بۆیە خۆیان بە ڕەوشتی بەرز دەڕازێننەوە و ئارەزووی ئەوە دەکەن ئەوانی تریش ئەو کارە بکەن. (یدعون إلی : مکارم الأخلاق) واتە : بانگەواز دەکەن بۆ بەرزترین و باشترین ڕەوشت.

و(الأخلاق) : جەمعی (**خُلُق**)ـە ، بەزەمی (**الخاء واللام**) ، کە بریتیە لەوێنای ناوەوە، و(**الخَلْق**) بەفتحی (**الخاء**) و(**اللام الساکنة**)وێنا زاهیر و دیارەکەیە، کە بریتییە لە دین و سروشت و تەبیعەت و، بانگەوازی دەکەن بۆ (ومحاسن الأعمال)جوانترین ڕەوشت، وەك بەخشندەیی و، بوێری و، ڕاستگۆیی و متمانە و، پاراستنی سپاردە(ویعتقدون معنی قوله ﷺ) وباوەڕیان بەمانای فەرمایشتەکەی پێغەمبەرە ﷺ واتە : باوەڕیان پێیەتی و کاربەناوەڕکەکەی دەکەن، کە ئەویش فەرمایشتی: «أکمل المؤمنین إیمانا أحسنهم خلقا» ، رواه أحمد والترمذي وقال : حسن صحیح[1] واتە: کامڵترینی ئیمانداران لە ئیماندا باشترینیانە لە ڕەوشتدا، وفەرمایشتی : «أحسنهم خلقا» واتە : ئەوەیان کە نەرمتر و بەسۆزترە و ڕەوشتی لەهەمووان بەرزترە.

لە فەرموودەکەدا ئامۆژگارییەک هەیە بۆ گرتنەبەری باشترین ڕەوشت، هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە کردارەکان بەناوی ئیمانەوە جێگیرکراون و بەشێکن لەپێکهاتەکەی و، ئیمانی بەهێز و لاواز هەیە و ئیمانی هەندێک لەهەندێکی تر بەهێزترە.

ئەهلی سوننەت داوای مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵک دەکەن بەشێوەیەکی باشتر و بۆ ئەوانەی مافیان هەیە مافەکانیان پێبدرێت، هەروەها هۆشداری دەدەن لە

---

(١) أخرجه أحمد (٧٣٣٥) ، والترمذي (١١٦٢) .

پێچەوانەی لەگەڵ ئەو ڕەوشتە بەرزە هاوشێوەی لەخۆبایی و سنوور بەزاندان بەرانبەر بە خەڵک، وئەوان(یندبون) واتە : بانگەوازی دەکەن (إلى أن تصل من قطعك) سەردانی ئەو کەسانە بکەیت کە پەیوەندیان لەگەڵ دابڕیوی ، واتە : چاک بیت لەگەڵ ئەوەی خراپ بووە لەگەڵت وستەمی لێکردووی (وتعطي من حرمك)وە ببەخشی بەوەی بێبەشی کردووی، واتە : تۆ دیاری و ماڵ ببەخشی بەو کەسانەی کە تۆیان بێبەش کردووە لەبەخشین ودیاری؛ چونکە ئەوە جۆرێکە لەچاکە. (وتعفو عمن ظلمك) و لەوانە خۆشبیت کەستەمیان لێکردووی، واتە : لەوانە ببووریت کە سنووریان بەرانبەرت بەزاندووە، جا ماڵیان خواردبێتی یاخود خوێن یاخود ناموستیان لەکەدارکردبێت؛ چونکە ئەوە سۆز و خۆشەویستی دەهێنێت و پاداشت بەدەست دەهێنێت .

(ويأمرون)وە فرمان دەکەن، واتە: ئەهلی سوننەت بەو شتەی کە خودا فەرمانی پێکردووە و مافی خۆیان بدەن بەو کەسانەی کە مافیان هەیە (بر الوالدين) ڕێزگرتن لە دایک و باوکی، واتە: گوێڕایەڵییان بکەن، بەبێ ئەوەی سەرپێچییان بکەن و، ومیهرەبان بن لەگەڵیان لە قسە و کرداردا .

(وصلة الأرحام) بەرزڕاگرتنی پەیوەندیی خزمایەتی، بە واتای: چاکەکردن لەگەڵ نزیکترین کەسەکان، ئەوەش ئەو کەسەیە کە تۆ جۆرێك لە خزمایەتی و نزیکایەتیت لەگەڵی هەیە (وحسن الجوار) دراوسێیەتی باش و لەگەڵیدا پەیوەندیت هەیە، واتە: چاکەکردن لەگەڵ ئەوانەی، کە لە تەنیشتتەوە دەژین بە ئەنجامدانی چاکە و خۆبەدوورگرتن لە زیان گەیاندن پێیان(والإحسان إلى اليتامى) چاکبوون لەگەڵ منداڵانی بێباوك، و(**اليتامى**)جەمعی (**يتيم**)ـە ، لە ڕووی زمانەوانییەوە: بەمانای تاقانە دێت، و لە شەریعەتدا: ئەو کەسەیە کە باوکی دەمرێت پێش ئەوەی بگاتە تەمەنی باڵغبوون و، چاکبوون و میهرەبانی بۆیان بریتییە لە گرنگیدان بە بارودۆخیان و میهرەبانبوون لەگەڵیان.

(والمساكين) هەژاران، واتە: میهرەبانبوون لەگەڵ هەژاران: و(**المساكين**) : جەمعی (**مسكين**)ـە، کە بریتییە لەو کەسەی کە بەهۆی پێداویستیەکانیەوە رووبەڕووی پێویستی و هەژارییەوە بووەتەوە، چاکبوون لەگەڵیاندا بە پێدانی بەخشین و میهرەبان بوونە لەگەڵیان، (وابن السبيل) ڕێبوار، واتە: چاکەکردن لەگەڵ ڕێبوار، ئەویش: ئەو ڕێبوارەیە کە پارە و خۆراکی لێی بڕاوەتەوە و، خەرجییەکانی تەواو بووە، جا ون بووە، یان دزراوە، بۆچوونێك هەیە دەڵێت: مەبەست لێی میوانە.

(والرفق بالمملوك) ومیهرەبانی لەگەڵ بەندەو ژێردەستەدا، واتە: فەرمان بە میهرەبانی دەکەن لەگەڵ بەندەو ژێردەستەدا، کە بریتین لەکۆیلەو ژێردەستەکان و، ئەمە ئاژەڵیش دەگرێتەوە، جا میهرەبانی: دژی توندوتیژیە، کەواتە نەرم و نیانییە.

(وينهون عن الفخر) ڕێگری دەکەن لە لووتبەرزی و قەدەغەی دەکەن، کەئەویش بریتییە لە خۆ هەڵکێشان بەناو ناوبانگ و فەزیلەتەکان هاوشێوەی پلەوپۆست و ڕەچەڵەک..هتد.

(والخيلاء) بەزەمی (**الخاء**) بریتییە لە : خۆبەگەورەزانین و لەخۆڕازیبوون، (والبغي) بریتییە لە سنووربەزاندن بەرانبەر خەڵك (والاستطالة على الخلق) واتە: خۆفەرزکردن بەسەر خەڵکدا و بەکەم زانیان و تانەو تەشەر لێدانیان (بحق أو بغير حق) جا بەهەق بێت یاخود ناهەق، چونکە ئەوکەسەی کە خۆبەزلزانەو تانەو تەشەر لەخەڵک دەدات، ئەگەر بە حەق سووکایەتی کرد، ئەوا خۆی فەرز کردووە، وە ئەگەر بە ناڕەوا سووکایەتی کرد، ئەوا سەرپێچیکار و سنوور بەزێنە و، هیچیان ڕێگەپێدراو نییە.

(ويأمرون بمعالي الأخلاق) وە فەرمان بە ڕەوشتی بەرز دەکەن، واتە: ئەهلی سوننە فەرمان بە ڕەوشتی بەرز دەکەن، کە ئەویش ڕەوشت و ئەخلاقی بەرز و باشە (وينهون عن سفسافها) واتە : ڕێگری دەکەن لەڕەوشتی نزم و هەرزەکارانە ، و(**السفساف**) بریتیە لە : شتی بێ نرخ و هەرشتێك کە هیچ و پوچ کەم نرخ بێت و، ئەوەش دژی ڕوەشت و ئاکاری بەرز و جوانە.

(وكل ما يقولونه ويفعلونه من هذا أو غيره ؛ فإنما هم فيه متبعون للكتاب والسنة)وه هەرچییەک کە دەڵێن و دەیکەن، جا ئەمە بێت یان بە شێوەیەکی تر، ئەوا ئەوان تێیدا شوێنکەوتەی قورئان و سوننەتن، واتە هەموو شتێک کە ئەهلی سوننە دەیڵێن و دەیکەن و، فەرمانی پێدەکەن و ڕێگری لێدەکەن لەو شتانەی کە لەم پەیامەدا باسکراوە و ئەوەش کە باس نەکراوە، سوودیان لە کتێبی پەروەردگاریان و سوننەتی پێغەمبەرەکەیان وەرگرتووە، لەلایەن خۆیانەوە دایان نەهێناوە و تەقلید ولاسایی هیچ کەسێکیان تێیدا نەکردووە، خودای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا﴾ [النساء : ٣٦] ، واتە: ئەی خەڵکینە! تەنها خوا بپەرستن و هیچ شتێک مەکەنە هاوبەشی، نە مرۆڤ، نە دار، نە بەرد.. نە بتان، و بەکاروکردەوەی چاک و شیرین لەگەڵ باوک و دایکتاندا ڕەفتار بکەن، با هەمیشە قسەتان خۆش بێت لەتەکیان، کردارتان پاک و پەسەند بێت بەرانبەریان، ڕزق و ڕۆزیی و بژێوییان بدەنێ، وە دەربارەی خزمانی نزیک، و هەتیوان و هەژاران و بێ نەوایان و دراوسێی دیوار بەدیوارو، دراوسێی دوورو بێگانە، و هاوەڵ و هاوڕێی هەمیشەییتان، وەکو خێزان، هاوڕێی خوێندن، ئەوکەسەی بەهەمیشە لەلاتانە، وبەوانەی ڕێبوارو ئاوارەو نەناسراوو لەڕێ جێماون، وئەوانەی بوونەتە ژێردەستەو بەندەو کەنیزەتان، هەروا ئاکار چاک بن، چونکە بەڕاستیی خوا ئەوانەی خۆش ناوێت لووت بەرزو دەعیە بازو خۆ بەزلزانن.

جا لەم بارەیەوە زۆر فەرموودە هەیە، لەوانە ئەوەی شێخ باسی کردووە.

وَطَرِيقَتُهُمْ هِيَ دِينُ الإسْلاَمِ الَّذِي بَعَثَ اللهُ بِهِ مُحَمَّدًا ـ ﷺ ـ .لكِنْ لَمَّا أَخْبَرَ النَّبِيُّ ـ ﷺ ـ أَنَّ أُمَّتُهُ سَتَفْتَرِقُ عَلَى ثَلاث وَسَبْعِينَ فِرْقَةً؛ كُلُّهَا فِي النَّار؛ إلاَّ وَاحِدَةً، وَهِيَ الْجَمَاعَةُ. وَفِي حَدِيث عَنْهُ أَنَّهُ قَالَ: «هُمْ مَنْ كَانَ عَلَى مِثْلِ مَا أَنَا عَلَيْهِ الْيَومَ وَأَصْحَابِي»، صَارَ الْمُتَمَسِّكُونَ بِالإسْلاَمِ الْمَحْضِ الْخَالِصِ عَنِ الشَّوْبِ هُمُ أَهْلُ السُّنَّة وَالْجَمَاعَة.

وَفِيهِمُ الصِّدِّيقُونَ، وَالشُّهَدَاءِ، وَالصَّالِحُونَ، وَمِنْهُمُ أَعْلامُ الْهُدَى، وَمَصَابِيحُ الدُّجَى، أُولو الْمَنَاقِبِ الْمَأْثُورَة، وَالْفَضَائِلِ الْمَذْكُورَة، وَفِيهِمُ الأَبْدَالُ، وَفِيهِمُ أَئِمَّةُ الدِّين، الَّذِينَ أَجْمَعَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى هِدَايَتِهِمْ وَدِرَايَتِهِمْ، وَهُمُ الطَّائِفَةُ الْمَنْصُورَةُ الَّذِينَ قَالَ فِيهِمُ النَّبِيُّ ـ ﷺ ـ: «لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي عَلَى الْحَقِّ مَنْصُورَةً، لاَ يَضُرُّهُم مَّنْ خَالَفَهُمْ، وَلاَ مَنْ خَذَلَهُمْ؛ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ»، نَسْأَلُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنَا مِنْهُمْ وَأَنْ لاَ يُزِيغَ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَانَا، وَأَنْ يَهَبَ لَنَا مِن لَّدُنْهُ رَحْمَةً إِنَّهُ هُوَ الوَهَّابُ. وَاللهُ أَعْلَمُ.

وَصَلَّى اللهُ عَلَى مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ تَسْلِيمًا كَثِيراً.

هەروەها ڕێگای ئەوان ئاینی ئیسلامە، کە خودا موحەممەدی ﷺ پێناردووە. بەڵام کاتێک پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاند ئوممەتەکەی دابەش دەبێت بۆ حەفتا و سێ تاقم و مەزهەب هەموویان لە دۆزەخدا دەبن جگە لە یەک دەستە. لە فەرموودەیەکدا پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەو تەنها یەك تاقمە فەرموویەتی: (ئەوانە ئەوانەن کە لەسەر هەمان ئەو شتەن کە من و هاوەڵەکانم ئەمڕۆ لەسەریین)، ئەوکات ئەوانەی پابەندن بە ئیسلامی ساف و پاکەوە و دوور لەهەر لێڵی و ناتەواویەك ئەوانەش: ئەهلی سوننە و جەماعەن، و لە نێویاندا: ڕاستگۆکان و، شەهیدان و، چاکەکاران و، لە نێوانیاندا زانا ناودارەکانی ئیسلام و، چرای تاریکی و، خاوەن چەندان لە پێگە و پلە و، فەزیلەتەکان کە باسکراون، وە لە نێویاندا بەندە خواپەرستەکان هەیە، هەروەها لە نێویاندا پێشەوایانی دین هەن، ئەوانەی کە موسوڵمانان کۆدەنگن لەسەر پیاوچاکی وزانایەتیان و، ئەوانیش

**ئەو کۆمەڵە ڕزگاربووەو سەرکەوتووەن کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەیان دەفەرموێت: " بەردەوام کۆمەڵێك لە ئوممەتەکەم سەرکەوتوون و ئەوانەی کە سەریان ناخەن زیانیان پێناگەیەنن تاوەکو ڕۆژی قیامەت دێت .**

**داواکارین لە خودای گەورە ئێمە بکاتە بەشێك لەوان و دوای ئەوەی ڕێنمایی کردین دڵمان لا نەدات، و ڕەحمەتمان پێبدات لەلایەن خۆیەوە، چونکە ئەو بەخشەر و میهرەبانە.**

**و سڵاوی خوای گەورە لەسەر موحەممەد و خانەوادە و هاوەڵانی بێت.**

---

## شەرح

شێخ (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بەردەوامە لە ڕوونکردنەوەی تایبەتمەندیەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، جا گەورەترین تایبەتی ئەوانی ڕوون کردەوە، کە بریتییە لە: (طريقتهم هي دين الإسلام) ڕێباز و میتۆدەکەیان ئایینی ئیسلامە، واتە: ئەوە عەقیدەی ئەوانە و ڕێبازەکەیانە کە دەیانەگەیەنێتە خودا، ئەوان لەکاتی ئەو دابڕان و دووبەرەکیەیی کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە لەبارەی ڕوودانی لەم میللەتەدا، جا ئەو تاقمە ڕزگاربووە پابەند بوون بە ئیسلامەوە، و بوونە ئەو گروپە ڕزگارکراوەی کە لە نێوان ئەو تاقم و گروپانەدایە، ئەوان ئەو گرووپەن، کەوا جێگیر ودامەزراو بوون لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی لەسەری بوون، کە ئیسلامی پاکە دوور لە هەر پیسییەك؛ هەر بۆیە نازناوی ئەهلی سوننەت و جەماعەتیان بەدەستهێنا و لە نێویاندا کەسانێك بوون بە(الصديقون) ئەوانەی زیاد لەحەد ڕاستگۆن (والشهداء) شەهیدەکان، کە لە ڕێگای خوادا کوژراون(والصالحون)پیاوچاکان، ئەوانەی چاکەکارن و کردەوەی چاک ئەنجام دەدەن (ومنهم أعلام الهدى ..) هتد ، واتە : لەناو ئەهلی سوننەدا کۆمەڵە زانایەکی ناودار هەن کە هەموو سیفەتێکی چاکیان

تێدایە لەکردار و زانست (وفيهم الأبدال)وە جەماعەتی ئەبدالیان تێدایە، کە بریتیین لە : ئەولیاو خواپەرستان، جا بۆیە ئەو ناوەیان لێنراوە؛ چونکە هەرکاتێک یەکێکیان مرد، یەکێکی تر لەجێگەی دانراوە، وە لە ڕیوایەتێکدا پێشەوا ئەحمەددا هاتووە کە ئەوانە ئەهلی فەرموودەن [١]، (وفيهم أئمة الدين)وە لە نێویاندا ئیمام پێشەواکانی ئیسلام هەن کە خەڵکی چاویان لێدەکەن و شوێنیان دەکەون، وەک چوار ئیمامەکە و ئەوانی تر(وهم الطائفة المنصورة) وە ئەوان تاقمە ڕزگاربووەکەن، واتە: ئەهلی سوننەکان ئەو گروپەن، کە لە فەرموودەدا باسکراون: «لا تزال طائفة من أمتي ... » الحديث . رواه البخاري ومسلم[٢] ، واتە: بەردەوام تاقمێك لەئوممەتەکەم ..

پاشان شێخ کۆتایی کتێبەکەی هێنا بە دوعا و سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ و، ئەو باشترینی کۆتا هێنەرە .

**والحمد لله رب العالمين**

**وصلى الله وسلم على نبينا محمد ، وعلى آله وصحبه وسلم .**

---

(١) قال الإمام أحمد بن حنبل : ( إن لم يكونوا – أي الطائفة المنصورة - أهل الحديث فلا أدري من هم ) ، انظر افتح الباري » (١ / ٢١٦) .

(٢)متفق عليه : أخرجه البخاري (٧١) ، ومسلم ( ١٠٣٧) .

# ناوەڕۆک